# ڕێکەوتننامەی جەزائیر

# و

## ڕەهەندەکانی لە سەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور



کامەران بابان زادە

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرێتی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی



# ڕێککەوتننامەی جەزائیر و
# ڕەهەندەکانی لە سەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور

کامەران جەمال بابان زادە

**سلێمانی**

**٢٠١٣**

# رێکەوتننامەی جەزائیرو.....

❖ نووسەر: کامەران بابان زادە
❖ بابەت: مێژوویی
❖ پیتچنی: نووسەر
❖ نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: نەورۆز جەمال ئەمین
❖ سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
❖ قەبارەی کتێب: ٢٣×٢٣ ½
❖ ژمارەی لاپەڕە: ٤٢٨
❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٨٧)
❖ تیراژ : (٥٠٠) دانە
❖ چاپ: چاپخانەی کەمال
❖ نرخ: (٥٠٠٠) دینار
❖ ژمارەی سپاردنی (١٧٨٢)ی ساڵی ٢٠١٣ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی پێدراوە.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران
ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

**سوپاس و پێزانین**

- سەرپەرشتیاری ئەم نامەیە بەڕێز دکتۆر دلێر ئەحمەد حەمەد
- فەرمانبەرانی کتێبخانەی (کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی، ناوەندی زانکۆی سەلاحەدین، زانکۆی کۆیە، کتێبخانەی گشتی سلێمانی و رانیە، بنکەی ژین).
- هەموو ئەو هاوڕێیانەی بە سەرچاوەو زانیاری بەسوود هاوکارم بوون.
- هاوڕێی خۆشەویستم مامۆستا شێروان حوسێن، کە ئەرکی پێداچوونەوەی خستە سەرشانی خۆی.

## هیما کورتکراوەکان

| | |
|---|---|
| بێ.ش | بێشوێنی چاپ |
| بێ.س | بێ ساڵی چاپ |
| و/ | وەرگێڕان |
| چ | چاپ |
| ب | بەشی |
| ل | لاپەڕە |
| د.ت | دون تأريخ الطبع |
| ب.م | دون مكان الطبع |
| د.مط | دون تحديد المطبعة |
| ت: | ترجمة |
| ج | جزء |
| ط | طبع |
| ص | الصفحة |
| ی.ن.ك | یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان |
| پ.د.ك | پارتی دیموکراتی کوردستان. |
| پاسوك | پارتی سۆشیالستی کورد |
| حشع | حزبی شیوعی عراقی |
| حدکا | حزبی دیموکراتی کردستان - ئێران. |
| (م.س) | مەکتەبی سیاسی |
| (پ.م) | پێشمەرگە |

## ناوەڕۆك

# پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە نامەی ماستەر بووە لە سەرەتاوە بە زمانی عەرەبی لە سەر مێژووی نوێو هاوچەرخی کورد نووسراوە، لە دوای وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردیو پەرەپێدانو پێداچوونەوە، بە کۆمەڵێک سەرچاوەی دیکە دەوڵەمەند کراوەو ئەم کتێبەی لێدەرچووە، ناونیشانو نەخشەی داڕشتنی هاوشێوەی عەرەبیەکەیەتی، بەڵام پشتئەستوورتر بە سەرچاوەو دەوڵەمەندتر بە شرۆڤەو لێکدانەوە.

ساڵانی نێوان (١٩٧٠-١٩٨٠) قۆناغێکی هەستیار بووە لە مێژووی هاوچەرخی کوردستانی باشوور، ئەمەش هەمووی سەرووبەندی ڕێککەوتننامەی جەزائیر دەگرێتەوە، کە چوارچێوەیەک بووە بۆ ڕووداوە سیاسیو کۆمەڵایەتیو سەربازییەکانی مێژووی کاروانی بزاڤی ڕزگاریخوازی هاوچەرخی کورد لە کۆتایی چارەکی سێیەمو سەرەتای چارەکی چوارەمی سەدەمی بیستەم.

ئەوەی هەستی بزواندم لەو بابەتە دیاری بکەم تێگەیشتن بووە لە فاکتەرە ئیقلیمیو نێودەوڵەتیەکان لە سەر جوڵانەوەی کورد.

ناوەڕۆکی ئەم توێژینەوە لە سێ بەش پێک دێت، بەم شێوەیە.

لە بەشی یەکەمدا: باس لەو هۆکارە ناوخۆو دەرەکیانە کراوە، کە ئەو بارودۆخەیان خولقاند بۆ ئەوەی هەردوو حکومەتی عێراقو ئێران بگەنە بەستنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر، لەگەڵ جەختکردنە سەر هۆکاری کوردی لە ڕاکێشانی هەردوولا بۆ سەر

مێژی دانووسان. ئەم بەشە لە سێ باس پێك هـاتووە، کـە لـەم تەوەرانـە دەکۆڵێتـەوە: ڕیشـەی ناکۆکیـەکانی هەردوو وڵات پێش ڕێککەوتنـامـەی جەزائیر، باروودۆخی ناوخۆیی عێراق‌و کوردسـتان پێش ئـەو ڕێککەوتنـامـەیـەو دواتـر کاریگـەری وڵاتـانی زلهێـزو ئیقلیمی لە سـەر پەیوەندییەکانیان هەتا بەستنی ئەو ڕێککەوتننامەیە.

بەشی دووەم لە چوار باس پێـك هـاتووە: باسـی یەکـەم تەرخانـە بـۆ خسـتنەڕوو شـرۆڤەی دەقـەکانی ڕێککەوتننامـەی جـەزائیرو پرۆتۆکـۆڵ‌و پاشـکۆکانی، لەگـەڵ هەڵوێسـتی سـەرکردایەتی کـورد لـە بەرانبـەر ڕێککەوتنامەکـە، دوایـی ئەنـدازەی کاریگەرییەکانی ئەو ڕێککەوتنـامـەیـە لـە سـەر ئورشـستی شۆڕشـی کـورد، پاشـان چارەنووسی توانسـتە مرۆیی‌و لوجستی‌و مادیەکانی شۆڕش.

بەشی سێیەم تەرخان کراوە بۆ باروودۆخی کوردستان‌و بزاڤی سیاسی کورد لـە بـەر ڕۆشنایی ڕێککەوتننامەی جەزائیر، لـەویش لـە سـێ بـاس پێـك هـاتووە: لـە باسـی یەکەمدا لە دامەزراندنەوەی پارت‌و ڕێکخراوە کوردییەکان‌و دەستپێکردنەوەی شۆڕشـی نوێی چەکداری، لەگەڵ ئەو باروودۆخە سەختەی خەبات کە ڕێککەوتننامەی عێراقی – ئێرانی سەپاندبووی بە سەر بزاڤی سیاسـی‌و چـەکداری شۆڕشـی کـورد، لەگـەڵ ئـەو سیاسەتەی حکومەتی عێراقی گرتبوویە بەر بە چۆڵکردنی ناوچە سنوورییەکان‌و ناوچە نەوتیەکان‌و سیاسـەتی بە عەرەبکردن‌و بە بەعسیکردن. دوا باسی ئەم بەشە تایبەتە بە هۆکارەکانی ڕوخانی شاو ئەو باروودۆخە تازەی هاتـە ئـاراوە لـە پەیوەنـدی عێراقـی – ئێرانی‌و لەوێشـەوە بۆ دابینبوونی دەرفەتێك بۆ بزاڤی سیاسی‌و چـەکداری کوردسـتان‌و هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنـامـەی جەزائیر.

لە گرفتەکانی ئامادەکردنی ئەم توێژینـەوەیە، کەمی سەرچاوەی ئەکادیمی‌و بێلایەن بوو، چونکە سـەرچاوە حکومییەکان‌و ئەو نووسـەرانەی لەو ڕۆژگارە بەشـداری شۆڕشـی

کورد بوون بێلایەن نەبوون لە خستنەڕووی زانیاری‌و ئەو جومگە گرنگانەی بۆ ئەم بابەتە پێویست بوون. لەو ڕوانگەیەشەوە سەرچاوەکانی ئەم توێژینەوەیە دابەش کراوە بۆ سەرچاوە بێلایەنەکان‌و مەیلدارەکان:

یەکەم: سەرچاوە بێلایەنەکان، ئەو سەرچاوە کوردی‌و عەرەبی‌و بیانیانەن، کە لە لایەن کەسانی ئەکادیمی یان ڕۆژنامەوان یان سیاسی‌و کوردناسەکانەوە نووسراون، کە مەیلدار نەبوون بەلای حکومەتی عێراقی‌و ئێرانی‌و ڕەوتە جیاوازەکانی ناو بزافی ڕزگاریخوازی کورد، گەرچی ئەو جۆرە سەرچاوانە بە بەراورد لەگەڵ سەرچاوە مەیلدارەکان کەمن، بەڵام زیاتر جێگای بڕوان، لەوانە: (کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا)ی ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی (کریس کۆچێرا)و (کوردستان یان کلۆڵی نەتەوەیەک)ی (جۆناتان س.ڕاندال)و (صفحات من تأريخ العراق الحديث)ی (تشالز تريب)، کە هەتا ئێستا سەرچاوەیەکی دانسقەیە لە سەر مێژووی عێراقی هاوچەرخ کە بە بێلایەنی نووسرابێ، (العراق الحديث من الثورة الى الدكتاتورية)ی (ماريون وبتر سلوجت)و (التيارات السياسية في كردستان العراق)ی (صلاح الخرصان)و (مەسەلەی کوردو یاسای نێودەوڵەتان)ی (جاسم خۆشناو)و (قضايا القوميات وأثرها على العلاقات الدولية)، لەگەڵ کۆمەڵێک سەرچاوەو وتارو لیکۆڵینەوەی دیکە.

دووەم: سەرچاوە مەیلدارەکان: هەموو ئەو نەوشتەدەبیاتی حیزبی‌و حکومیانەن، کە بوونەتە مەیلدار لە کێشەو ڕووداوەکان، لەگەڵ ئەو وتارە سیاسیانەی لە لایەن سیاسیەکانەوە نووسراون، هەتا هەندێ کتێب، کە وەکو سەرچاوەی سەرەکی بەکارمان هێناون، لە سەرچاوە مەیلدارەکانن، لەگەڵ بیرەوەری ژمارەیەک لە سیاسیەکان وەکو: (مذكرات)ی (بەهائەدین نووری)و (تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني –العراقي "في محطات رئيسية")ی (حبيب محمد كريم)و (الحركة التحررية الكردية) و(القضية

الكردية وحزب البعث...)ی (علی سنجاري)و(أحداث عاصرتها)ی (محسن دزەیی) و (البارزاني والحركة التحررية الكردية)ی (مسعود البارزاني)و (الحركة التحررية الكردية)ی (أيوب بارزاني)و (ثورة أيلول المجيدة)ی (نجم الدين اليوسفي)و (خوارووی کوردستان‌و شۆڕشی ئەیلول..)ی (ئیبراهیم جەلال)و (یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان (١٩٧٥-١٩٧٦)ی (سەرەوەر عەبدوڕەحمان)و (لە ناو کاروانێکی دوورو درێژدا)ی (فاتیح رەسوڵ)و (لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ)و (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن)ی (نەوشیروان مستەفا ئەمین)و (بحران الحريني بر قدرتها در كردستان العراق)ی (صالح ملا عسى)و کۆمەڵێك وتاری دیکە کە دەچنە ئەو پۆلێنەوە، ئەوەی ناکرێ لێرەدا ئاماژەی پێنەدەین هەریەك لەو سەرچاوانەی بە مەیلدارەکان ناوبران، مەرج نییە مەیلدارێن بەلای سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول، بەڵکو هەندێکیان بە دیدی رەخنەگرانەوە نووسیویەتی‌و کاتی خۆی لە بەرەی حیزبی شیوعی عێراق یان باڵی (م‌س) بووە، بەڵام هەر لە ریزی مەیلدارەکان هەژمارکراوە، یان دەکرێ مەیلداریش لەم لیستەدا رێژەیی بێ.

ئەوەی شایانی وتنە هەتا ئێستا ژمارەیەکی کەم نامەی ماستەرو تێزی دکتۆرا لە سەر شۆڕشی ئەیلول‌و قۆناغی دوای نوشستی ئەو شۆڕشە نووسراوە، کە مەیدانێکی فراوان‌و هەستیاری مێژووی هاوچەرخی کوردستانە، هەتا ئامادەکردنی ئەم نامەیە ژمارەیەك توێژینەوە نووسراون، هەندێکیان بۆ ئێمە بە کەڵك بوون وەکو:(مەسەلەی کوردو یاسای نێودەوڵەتان)و (قضايا القوميات وأثرها على العلاقات الدولية)و (کاریگەری شۆڕشی ئەیلول لە سەر رۆژنامەوانیی کوردی)و (بارودۆخی سیاسی کوردستان –عێراق، ١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)و (ناکامە کۆمەڵایەتیەکانی سیاسەتی راگواستنی کورد).

ئەمە سەرەڕای هەموو ئەو بەڵگەنامەو نووسراوانەی لەلایەن حکومەتی عێراقو حیزبی بەعسو نووسەرەکانیانەوە لە سەر ئەو بابەتە نووسراون دەچنە ناو پۆلێنی تێڕوانینی دەمارگیرانە بۆ کێشەی کورد، وەکو کێشەو خواستی نەتەوەیەك سەیریان نەکردووە، بەڵکو بە چاوی دەستکردی ئیستیعمارو پیلان بۆ سەر نەتەوەی عەرەب وێنایان کردووە. لەوانە: (موسوعة السياسية) و(مشكلة شط العرب في ظل المعاهدات و القانون)و (تأريخ الاطماع الفارسية في شط العرب) و(أضواء على الحرب العراقية الايرانية)و (مصطفى البارزاني بين الاسطورة والحقيقة) ..هتد.

ئەوەی ئاماژەی پێدرا بەشێك بوون لەو سەرچاوانەی بەکارهاتوون، ئەوانی دیکە لە لیستی سەرچاوەکاندا ریزکراوە، لە پاڵ ئەوەدا ژمارەیەك لە گۆڤارو رۆژنامەو سایتی ئەلیکترۆنی بەکارهاتووە، لەگەڵ دیداری مەیدانی بۆ ژمارەیەك لە بەشدارانی ئەو سەردەمە. هەوڵدراوە بە بێلایەنی سوود لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی لایەنە جیاجیاکانی کاریگەر لە سەر رووداوەکان وەربگیرێت.

زۆربەی سەرچاوەکان بە هەردوو زمانی عەرەبیو کوردین یان سەرچاوەی بیانیو وەرگێردراونەتە سەر زمانی کورد یان عەرەبی، لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی فارسی کە جێی بایەخ بووە بۆ ئەم توێژینەوەیە.

سەبارەت بەو بەڵگەنامانەی وەکو سەرچاوەیەکی بنەڕەتی مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، زۆربەیان بڵاوکراونەتەوە، بەڵام وەکو بەڵگەنامەی زیندوو بنەڕەتی پشتی پێبەستراوە، کە زۆربەیان بەو ئاسانیە بەردەستی خوێنەران ناکەون..

سەرەڕای پاشکۆی تایبەت بە بەڵگەنامە، دوو پاشکۆی دیکە بە پێویست زانرا، ئەوانیش وتارێکی مێژوویی بوو وەکو وتارێکی سیاسی – مێژوویی کاتی خۆی بڵاوم

کردبووە، لەگەڵ پاشکۆیەکی تایبەت بە ڕێنەی ژمارەیەك لەو سەرکردەو سیاسیانەی لە توێژینەوەکەدا ناویان هاتووە.

ئەمڕۆ لە کاتی پێداچوونەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ (سەرەتای ٢٠١٢) نزیکەی پێنج ساڵ تێدەپەڕێ بە سەر نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا، لەو ماوەیەدا ژمارەیەك توێژینەوەو سەرچاوەی دیکە چاپکراون، هەوڵماندا لە کاتی پێداچوونەوە سوود لە بۆچوونی هەندێکیان وەربگرین، بەڵام بەزۆریەیان رانەگەیشتین، لە بەر هەستیاری بابەتەکە، بە بەردەوامی زانیاری تازە لە سەر ئەو بابەتانە ئاشکرا دەبێ‌و دیدوبۆچوونی نوێ بەرجەستە دەبێ، بەڵام هەتا ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە بۆ چاپ بەو ئەندازەیە زانیاری‌و دیکۆمێنتی تازە پەیدانەبوون ئەو گۆڕانە لە دیدی خوێنەری کورد دروست بکات لە بایەخی ئەم توێژینەوەیە کەم بکاتەوە.

لە بەر ئەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر، کە ڕەنگدانەوەی پێشینەیەکی مێژوویەو لە دوای خۆی لە رووی ماوەی کاریگەری‌و قەوارەی کاریگەریەکانی باڵی بە سەر زۆر لە رووداوەکانی بزاڤی سیاسی ناوچەکەدا گرتووە. لە رووی میتۆدی توێژینەوە هەوڵدراوە بەدوداچوون لە سەر سێ لایەنی ڕێککەوتنامەی جەزائیر بکرێ، ئەوانیش هۆکارو خودی ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەو شوێنەوارەکانیەتی. لێرەدا بۆ زیاتر تێگەیشتن لەو ڕێککەوتننامەیە جەخت کراوەتە سەر رووداوە سیاسییەکانی نێوان ساڵانی (١٩٧٠ - ١٩٨٠)، گەرچی پێشینەی هۆکارەکان‌و بەرئەنجامەکانی لەو ماوەیە فراوانترە.

لە دوماهیدا هەوڵی توانامان تەرخان کردووە بۆ ئەوەی بێلایەنانە بگەینە ئەنجامێکی ئەکادیمی‌و بابەتی، خوێندنەوە بۆ ئەو جومگانە کراوە، کە بە پێویست زانراوە. بە دواداچوونێکی زانستەو مەبەست بەرزکردنەوە یان نازڕاندنی هیچ کەس‌و

گرفتێك نییە، هەروەها بە دروست نەزانراوە هەندێك وشەو گوزارشت، کە بە مەبەستی ڕێزگرتن دەخرێتە پاڵ ناوی هەموو ئەوانەی شایستەی ڕێزن بخەینە پێش ناوەکانیانەوە، بە تایبەت سیاسەتوانو سەرکردەکانی بزاڤی سیاسی کوردستان، ئەوە بێ مەبەست بووە.

توێژینەوەیەکە لە ڕەخنە بەدەر نییە، ئەگەر لە شوێنێك کەوتبینە هەڵەوە، لە کەم توانایی خۆمانەوە بووە، داوای بەخشین دەکەین. "ربنا اتینا من لدنك رحمة و هيء لنا من أمرنا رشداً" آمین.

# بەشی یەکەم

## ڕەهەندە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکان‌و شوێنی کورد لە پەیوەندییەکانی عێراق‌و ئێران.

**باسی یەکەم:**

**کورتەی پێشینەیەکی مێژوویی لە پەیوەندییەکانی عێراق‌و ئێران.**

**باسی دووەم:**

**بارودۆخی ناوخۆییعێراق‌وکوردستان پێش ڕێککەوتننامەی جەزائیر**

**باسی سێیەم:**

**کاریگەری وڵاتانی زلهێزو دەوروبەر لـە سـەر پەیوەندیـیەکانی عێـراق‌و ئێران بۆ بەستنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر**

## باسی یەکەم:

## کورتەی پێشینەیەکی مێژوویی بۆ پەیوەندییەکانی عێراق و ئێران.

ئەرکی ئەم توێژینەوەیە نییە، لە ڕیشەی مێژوویی ناکۆکیەکانی عێراقی – ئێرانی بکۆڵێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی یان سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق[1]، کە ڕیشەی ئەو ناکۆکیانە بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە، (العزی) لەو بارەیەوە دەڵێ: (ڕیشەی ئەو ناکۆکیانە دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکیەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی پێش چوارسەد ساڵ)[2]، کە لە سەرەتای سەدەی شازدەهەم هەتا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی درێژەی هەبووە، ئەو ماوەیە دەیان ڕێککەوتننامەی دووقۆڵی لە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەدا مۆرکراوەو چەند جار هەڵگیرسانەوەی شەڕی بەدوادا هاتووە، لە ڕێککەوتننامەی

---

١- دەسەڵاتی تورکان لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم لە یەک دەوڵەت بەرجەستە ببوو، ئەویش دەوڵەتی عوسمانی بووە، بەڵام لە ئێران دەوڵەتی سەفەوی و ئەفشاری و زەندی و قاجاری هەبووە، بەڵام ئەمە گۆڕانی بە سەر سروشتی پەیوەندییەکانی ئێرانی و عوسمانی و شوێنی کورد لەو ململانێیەدا نەهێناوە.

٢- مشكلة شط العرب في ظل معاهدات و القانون، بغداد ١٩٨١، ص١٧.

(ئەماسیەی سالّی ١٥٥٥)ەوە دەستی پێکردووەو لە دوا ڕێککەوتننامەی پڕۆتۆکۆڵی ئوستەنتینیەی سالّی ١٩١٣و کۆنووسەکانی دیاریکردنی سنووری سالّی ١٩١٤ کۆتایی هاتووە[٣]

وەکو بەدەردەکەوێ ئەم دوو ڕێککەوتننامەی دوایی لە گرفتە سنوورییەکانی نێوان هەردوو وڵات پشتی پێبەستراوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەدا هەموو کێشەو ناکۆکییەکانی نێوانیان لە سەر سنوور نەبووە.

میرنشین و هۆزە کوردییەکان فاکتەری ناکۆکی نێوان هەردوو وڵات بوون، بۆیە ناوەڕۆکی زۆربەی مادەکانی ڕێککەوتننامەکانی نێوان دەوڵەتی ئێرانیو عوسمانی پێکهێناوە، بەلاّم کورتکردنەوەی فاکتەری ناکۆکۆکییەکان لە سەر کورد لەگەڵ واقیعی مێژوویی پەیوەندییەکانی ئەو دوو وڵاتە تێك ناکاتەوە، توێژەرێك لەوبارەیەوە دەنووسێت: (... لە هەموو ئەو ڕێککەوتنامانە دۆزی کورد بابەتێکی بنەڕەتیو سەرەکی بووە، چونکە زۆربەی ئاژاوەکان پەیوەندیان بە دەڤەرە سنوورییەکانی ئەم دوو دەوڵەتەوە

---

٣- بۆ زانیاری زیاتر لە سەر سروشتی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵاتو شوێنی کورد لەو ململانێیەدا بڕوانە: (شاكر صابر الضباط: العلاقات الدولية و معاهدات الحدود بين العراق و ايران، د.م، بغداد، ص٧٦-٨٧، ٨٨-٩٣" نەجاتی عەبدوڵلا: کوردستانو کێشەی سنووری عوسمانی فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧، هەولێر ٢٠٠١" جابر ابراهيم الراوي: مشكلات الحدود العراقية الايرانية والنزاع للسلح، بغداد، ١٩٨٩، ص٧٦-٩٥" حسن مجيد الدجيلي: ايران و العراق خلال خمسة قرون، بيروت، ١٩٩٩، ص٦٣-٨٨" العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٠-٤٥" خەلیل ئیسماعیل موحەمەد: دیاریکردنی سنووری نێوان عێراقو ئێران لە نێوان خواستەکانی گەلی کوردو ململانێی دەوڵ دا، گۆڤاری، سەنتەری برایەتی، ژ(٧)، ئاب ١٩٩٨ ل٣٥-٣٨)

هەبووە)[٤]، تیۆرێکی دیکەیش هەیە، کە پێی وایە هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی کوردستان فاکتەری ناکۆکییەکانو بەستنی پەیماننامەو ناشتبوونەوەی هەردوولاش بووە[٥]، دەگونجێت وای دابنێین هەندێك لە فاکتەرەکانی ناکۆکی لە سەر خاکی کوردستان بووبێتو هۆزو میرنشینە کوردییەکانیش لەو ناکۆکییە بەشداربووبن، ئەوانیش بۆ بەرژەوەندی خۆیان هۆزو میرنشینە کوردییەکانیان لە دژی یەکتری هاندابێت، بەڵام ئەوە وەکو هۆکاری سەرەکی نەبووەو شوێنی کورد لە پەیوەندییەکانی هەردوو ئیمپراتۆریەت زیاتر لە بەرئەنجامەوە نزیك بووە نەك هۆکار، ڕەهەندی ناکۆکییەکانیان لەوە قوڵتر بووە، کورد زیاتر باجی ناکۆکییەکانی داوە، نەك هۆکاری سەرەکی دروستکردنی ناکۆکییەکان بووبێت.

بەچاوخشانێك بە خاڵە ناکۆکەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە سەرەڕای کێشەی کورد، مەسەلەی دیکەش هەبوون، وەکو ناکۆکی لە سەر سنوورو ناکۆکی مەزهەبیو پێشبڕکێ لە سەر فراوانخوازی لە ناوچە سنوورییەکاندا، کە مەزهەبی ڕەسمی دەسەڵات لە ئێران شیعە بووەو دەوڵەتی عوسمانیش سونی مەزهەب بووە، بەڵام زۆربەی شوێنە پیرۆزەکانی شیعە دەکەوتنە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش بەشێکی گرنگی ناکۆکی نێوان ئەو دوو دەوڵەتەی پێکهێنابوو، سەرەڕای ئەوەی دەشێت کێشەی کورد لەو نێوەندەدا بەشێکی فاکتەری ناکۆکییەکان بووبێت، بەڵام پشکی شێری لە زیانەکان بەرکەوتووە.

---

٤- کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین: کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتیو ناوچەییدا، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٧٢

٥- نەجاتی عەبدوڵڵا: کوردستانو کێشەی سنووری، ل٧

لە دوای هەڵوەشانەوەی دەوڵـەتی عوسمـانی‌و لـە ژێـر ئینتیـدابی بـەریتانی‌و لـە چوارچێوەی سنووری هەرسێ ویلایەتی عوسمـانی (بەسـرا، بەغـدا، موسـڵ) دەوڵـەتی تازەی عێراقی بووە میراتگری ناکۆکیەکانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانـی، هـەر لەو پێوەدانگەوە بووە نۆ ساڵ بە سەر دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێراقـدا تێپـەڕی بـوو، لەلایەن حکومـەتی ئێرانەوە دانی پێدا نەدەنرا[6]، بەو بیانووەی بـە ڕەچـەڵەک ئێـرانین، حکومەتی تازەی عێراق لە ساڵی ١٩٢٤ بە نـاوی دژایـەتی ئێـران یەکـەم زەبـری لـە (کوردە فەیلی)[7]یەکاندا، لە مافی ڕەگەزنامەی کردن، لە دوایـی بـۆ مەبەسـتی ڕازیکردنی ئێران بە مامەڵەی دراوسێیەتی‌و دانـان بـە دەوڵـەتی تـازە بڕیارەکـەی بـە قـازانجی کـوردە فەیلییـەکان هـەموارکرد[8]، پێدەچـێ بـەریتانیاش لـەو نێوەنـدەدا ویستبێتی هـەردوو وڵاتـی پاشـکۆی بەرژەوەندییـە سیاسـی‌و ئابوورییـەکانی خـۆی، پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا باش بێت، چونکە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە ئێـران پێگەیەکی گرنگ‌و قەڵغانێکی بەکەڵکی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئینگلیز بووە لـە

---

٦- العزي: مشكلة شط العرب، ص٣٧" مازن السامرائي: وثائق عن الصراع العراقي الفارسي، بغداد ١٩٨٧، ص٥١

٧- کوردە فەیلیەکان: لە شارەکانی خانەقین، مەندلی، بەدرە، بەغدا نیشتەجێن، کوردن‌و لە ڕووی مەزهەبیەوە شیعەن، لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە بەردەوام ڕووی ڕاگواستن‌و تەعریب بوونەتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عەباس سلێمان سمایل: مێژووی کوردی فەیلی عێراق، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی‌و جوگرافیە لە سەر کوردی فەیلی لە عێراق، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ڕۆشنبیری فەیلی، ١٩٩٩" کازم حەبیب: مەینەتی کوردە فەیلیەکانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٢٥، پاییزی ٢٠٠٢، ل١٠٤-١١٤)

٨-العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٧-٢٨

بەرانبەر خزینی رووسیای قەیسەری، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بایەخدان بە ئێران جێگەی بەریتانیای گرتەوە.

وا بەدەردەکەوێ دەوڵەتی عێراق بە هۆی جیاوازی کەلتووری سیاسی و ئاینی و کۆمەڵایەتی دوای هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی کەلتوورێکی پێکەوەژیانی نەبووە، تەنیا پێگەیەکی پارێزەری بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بووە، سەرخستنی پرۆسەی دەوڵەتی تازەش زیاتر خزمەت بووە بە تورێژێکی دیاریکراو. ئەوکات بەریتانیا ناچاربووە بۆ بەرژەوەندیەکانی رێگە لە تەشەنەکردنی ناکۆکیەکانی هەردوو وڵات بگرێ.

ئیسماعیل خانی سمکۆ[9] لە دوای هەرەسی شۆڕشەکەی پەنای بردە بەر تورکیا دوایی هاتە کوردستانی باشووری ژێردەسەڵاتی بەریتانیەکان، حکومەتی عێراق نەیتوانی سمکۆ رادەستی ئەو حکومەتە بکاتەوە، بەڵام بەریتانیا لە پێناو لێکنزیکخستنەوەی هەردوو وڵات هەوڵەکانی خستەگەڕ[10]، ئەمەش رەنگدانەوەی ئەو سیاسەتەبووە، کە لەو نێوەندەدا گرتبوویەبەر.

وەفدێکی حکومەتی عێراقی لە ١٩٢٩/٤/٢٥ سەردانی ئێرانی کرد، لەوێدا سەرۆك وەزیرانی ئێران دانینا بە دەوڵەتی عێراق، ئەمە رێگەی خۆشکرد لە ئیسانی

---

٩- سمایل ئاغای شکاك (سمکۆ): یەکێك بووە لە سەرکردەکانی جوڵانەوەی کورد لە کوردستانی ئێران، لە ساڵی ١٩٢٢ تێك شکاوەو پەنای بردۆتە بەر تورکیای کەمالی، لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ لە سلێمانی سەردانی شێخ مەحمودی کردووە، ماوەیەك لە کوردستانی عێراق ماوەتەوە، حکومەتی ئێرانی بە ناوی گفتوگۆوە پیلانی بۆ دارشتەو لە ساڵی ١٩٣٠ بە نهێنی کوشتیان. بڕوانە: (عثمان علی: اسماعیل اغا سمکو ، ثعلب السياسة الكردية و رائدها في الباغماتية، مجلة (ئاڵای ئیسلام)، العدد الاول، السنة السابعة، كانون الثاني /شباط-١٩٩٢، ص٣٢-٣٧)

١٠- کامەران ئەحمەد محمدئەمین: کوردستان لە نێوان ململانێی، ل٢٢٦٣

سالی ١٩٣٢ مەلیك فەیسەڵی یەكەم[١١] سەردانی ئێران بكات[١٢]، لەوێدا چوونە ژێرباری رێككەوتن لە سەر كێشەكان، بەڵام (العزی) ئاماژەی بە بێئاكامی سەردانەكەی فەیسەڵ كردووە، پێی وایە لەو سەردانەدا نەگەیشتوونەتە هیچ ئاكامێك[١٣]، بەڵام چاودێرێكی دیكە لە سەر ئەو سەردانە باسی لە رێككەوتنی كاتیو ئاڵوگۆری دیبلۆماسی كردووە[١٤]، لە دیدی نووسەرێكی دیكەوە لە سالی ١٩٢٩ لە ژێر فشاری بەریتانیادا حكومەتی ئێرانی دانی ناوە بە دەوڵەتی عێراقدا[١٥]، كەواتە دەبێ ناوەڕكی رێككەوتنی هەر كۆبوونەوەیەكی دواتر لە چوارچێوەی پەیوەندیو بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا دەرنەچێ، لە سەردانی مەلیك فەیسەڵ بۆ ئێران ناوەڕۆكی هیچ رێككەوتننامەی دوولقۆڵی دیار نییە، بەڵام رووداوەكانی دوای سەردانەكەی فەیسەڵ ئەوە دەردەخەن، كە هاریكاری مەیدانی بەكردەوە لە نێوان هەردولا دەستی پێكردووە. بۆ نموونە لە بابەت كێشەی كورد هاوهەڵوێستو هاوكاری یەكتربوون، شێخ مەحمود دوای سێیەم شكستی شۆڕشەكەی لە مایسی ١٩٣١ لە ناوچەی پێنجوێن، بە ناچاری سنووری ئێرانی بەزاندبوو، ئێران بە ناوبژیوانی چاودێری گشتی سەربازی

---

١١- مەلیك فەیسەڵ: لە ماوەی (١٩٢١-١٩٣٣) مەلیكی عێراق بووە، كوڕی شەریف كوڕی عەلی سەركردەی شۆڕشی عەرەبی سالی ١٩١٦ی حیجاز بووە دژی عوسمانیەكان، بەریتانیەكان دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق كردیانە یەكەم پاشای عێراق. بڕوانە: (تشارلز تريب: صفحات من تأريخ العراق الحديث، ت/ زينة جابر ادريس، بيروت ٢٠٠٦، ص٨٥-١٠٠)

١٢- العزي: مشكلة شط العرب، ص٤٠-٤١* السامرائي: وثائق عن الصراع العراقي الفارسي، ص٥٢

١٣- العزي: مشكلة شط العرب، ص٤٣

١٤-بدر غيلان: تأريخ الاطماع الفارسية في شط العرب، بغداد ١٩٨٠. ص٣٠٦

١٥- فاضل رسول: العراق- ايران اسباب و ابعاد النزاع، معهد النمساوي للسياسات الدولية، د.م، ١٩٩١، ص٢٠

بەریتانی لە ناوچەکە هاوکاری حکومەتی عێراقی کردووە بۆ رادەستکردنەوەی شێخ مەحموود، بە هاوکاری دەسەڵاتدارانی ئێرانی شێخ ناچارکرا خۆی بداتە دەست "کابتن هۆلت"ی سکرتێری کۆمیساری باڵای بەریتانی لە عێراق[16]، لەو روانگەیەوە پێدەچێت لە نیوەی یەکەمی سییەکانی سەدەی رابردوو پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو وڵات لە رووی سیاسی و ئاسایشەوە بەرەو ئاساییبوونەوە چووبێت.

ئەوەی لەو نێوەدا مابۆوە گرفتی سنوور بووە، کە نەگەیشتوونەتە ئاکام، لە ساڵی ١٩٣٤ هەردوولا لە سەر کێشەی تەنگەبەری ئاوی شەتولعەرەب یاداشتنامەی خۆیان داوەتە کۆمەڵەی گەلان[17]، گوایە لە ساڵی ١٩٣٥ بۆ ئەو مەبەستە (نوری سەعید)[18] ویستویەتی هەندێ سازش بۆ ئێران بکات، بەڵام لەلایەن حکومەتی عێراقەوە قبوڵ نەکرابێ، لە دوای پێکهێنانی حکومەتی (حیکمەت سلێمان)[19] لە ساڵی ١٩٣٦ لە

---

١٦- عیهمان علی: دراسه فی حرکه کردیه للعاصره، اربیل ٢٠٠٢، ص٥٧٠-٥٧١

١٧- فاچل رسول: العراق – ایران، ص٢١

١٨- نوری سەعید: لە کۆتایی سەدەی (١٩) لە دایك بووە، لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیەوە تێکەڵاوی کاری سیاسی بووە، لە پیاوە بەهێزەکانی سەردەمی پاشایەتی مێژووی عێراقی هاوچەرخ بووە، پەیوەندی پتەوی لەگەڵ بەریتانیادا هەبووە، سەرەڕای چەند پۆستێکی وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی پیاوماقوڵان و وەزیری دەرەوە، هەشت جار بۆتە سەرۆکی وەزیرانی عێراق، لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز کوشتیان. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عبدالوهاب الکیالی والاخرون: موسوعه السیاسیه، بیروت، ١٩٩٥، ج٦، ص٦٣٢-٦٣٣" تریب: صفحات من تأریخ، ص٢٠١-٢٠٢)

١٩- حیکمەت سلیمان: لە دوای روخانی حکومەتی (یاسین هاشمی) بە رێزامەندی مەلیك غازی و بە پشتگیری بەکر سدقی حکومەتێکی تازەی پێك هێنا، لە سەردەمی ئەودا گۆڕانی تازە بە سەر پەیوەندییە دەرەکییەکانی عێراقدا داهات، بە تیرۆرکردنی بەکر سدقی لە موسڵ لە ئابی ١٩٣٧ حکومەتەکەی ئەویش رووخا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (تریب: صفحات من تأریخ ، ص١٣٧-١٤٢)

بەرئەنجامی کۆدەتایەکەی (بەکر صدقی)[20] هەردوو وڵات لە تەموزی ساڵی ١٩٣٧ پەیمانی (سەعد ئاباد)[21] یان واژۆکرد[22]، لەوێوە پەیوەندییەکانیان ئاسایی بۆوە[23]

لەگەڵ ئەوەدا حکومەتی حیکمەت سلێمان کەوت، بەڵام پەیوەندییەکانی هەردوو وڵات پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینی، هەتا هەردوولا لە ساڵی ١٩٥٥ بوونە

---

٢٠- بەکر سدقی: بە نەتەوە کورد بووە، جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراقی بووە، دوایی هەیمەنەی لە رێگەی کۆدەتایەکی سەربازییەوە هەیمەنەی کردە سەر حکومەت، دەیویست پەیوەندی لەگەڵ ئێران باش بکات، لە کاتی سەردانی بۆ تورکیا لە فڕۆکەخانەی موسڵ تیرۆر کرا. بڕوانە: (ترب: صفحات من تأریخ، ص١٣٨، ١٤٢" کورتە باسێك دەربارەی جولانەوەکەی بەکر سدقی، رۆژنامەی (رزگاری)، ژ(١٨و ١٩)ی ئازاری ١٩٨٧، نیسانی ١٩٨٧

٢١- پەیمانی سەعد ئاباد لە نێوان عێراق‌و ئێران‌و تورکیا لە ساڵی ١٩٣٧ لە کۆشکی سەعد ئاباد لە تاران واژۆکرا، بە پێی ئەو پەیمانە ئێران مافی هەبووە بە دروستکردنی بەندەری عەبادان لەگەڵ مافی هاتوچۆ بۆ کەشتیە ئێرانیەکان لە شەتولعەرەب ەمو ەمرجەی ئاڵای ئێران بەرزبکەنەوە، هەروەها لە پەیمانامەیە چەند بابەتێکی پەیوەست بە کۆنترۆڵکردنی سنووری هەرسێ وڵات هاتووە لە بەرانبەر بزانیەر بزاڤی چەکداری کورد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: العزي: مشکلة شط العرب، ص٦٦-٦٨" کامەران بابان زادە: پەیمانی سەعد ئابادی ساڵی ١٩٣٧، گۆڤاری پەرلەمانتار، ژ(١١) ئابی، ٢٠١١، ل٨١-٩٢

٢٢- العزي: مشکلة شط العرب، ص١١١-١١٢" خلیل ابراهیم احمد و جعفر عباس حمیدي: تأریخ العراق المعاصر، موصل، ١٩٨٩، ص٢٦١

٢٣- بەعس ئەو رێککەوتننامەیەی بە سازش زانیو‌و ئاوانەکەی خستۆتە پاڵ کورد، چونکە بەکر سدقی ئەوکات کاریگەری لە سەر ئەو رێککەوتننامەیە هەبووە. بڕوانە: (وزارة العمل و الشئون الاجتماعیة، لجنة في مؤسسة الثقافة العمالیة، المسألة الکردیة و الحکم الذاتي، بغداد ١٩٧٥، ص١٦)

ئەندامی (پەیمانی بەغدا)[24] و بە رەسمی چوونە یەک بەرەی هاوپەیمانی سەربازییەوە، بابەتی ناکۆکی عێراقی – ئێرانی بووە بابەتی پێشنیازکراوی پەیمانی بەغدا، کە لەو بارەیەوە بڕیارا ئاڵوگۆڕ کرا، هەتا گەیشتنە ئەو ناکامەی دەبێت پەرە بە گیانی لە یەکتر تێگەیشتن بدەن و رابردوو لە بیر بکەن و لە پێشوازی هاریکاری و ئارامی و پێشڤەچووندا بن، هەر لەو ماوەیەدا بە سەردانی مەلیک فەیسەڵی دووەم بۆ ئێران لاپەڕەی تازە لە مێژووی پەیوەندییەکانی عێراق و ئێراندا کرایەوە، بە جۆرێ هەتا روخانی رژێمی پاشایەتی لە تەمووزی ١٩٥٨ ئەو پەیوەندییە بەردەوام گەرم و گوڕ بووە[25]

ئەگەر بە یەکگەیشتنی عێراق و ئێران لە رێککەوتننامەی ساڵی ١٩٣٧ بە تاوانی نەبوونی هەستی نیشتیمانی بەکر سدقی کورد لێك بدرێتەوە[26]، بەڵام ئەو هاریکارییە لە دوای تیرۆکردنی صدقی و روخانی حکومەتەکەی (حیکمەت سلێمان) زیاتر بووە، لە هەندێك وێستگەدا بە زیان بۆ سەر بزاڤی رزگاریخوازی کورد شکاوەتەوە، هەر بۆ نموونە ئەو هاریکارییە لە ساڵی١٩٤٧ بە یەکێك لە هۆکارەکانی روخانی کۆماری کوردستان

---

٢٤- پەیمانی بەغدا: لە ناو هاوپەیمانییە لاوەکییەکانی ناتۆ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیمانێکی سیاسی و سەربازی بووە، پێك هاتبوو لە: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا، عێراق، ئێران، پاکستان، لە دوای ئەو هاوپەیمانییە حکومەتی عێراق بە داردەستی رۆژئاوا هەژمار دەکرا. بڕوانە: (جاسم توفیق خۆشناو: مەسەلەی کورد و یاسای نێودەوڵەتان،، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠١، ل٢٩٨-٢٩٩)

٢٥- الدجيلي: ايران و العراق خلال، ص٢٩٠

٢٦- بڕوانە: (وزارة العمل و الشئون الاجتماعية، لجنة في مؤسسة الثقافة العمالية، للمسألة الكردية، ص٧٥)

دادەنرێت[27]، لەو ساڵەدا هاریکاری مەیدانی یەکتریان کردووە بۆ دەستبەسەراگرتنی ئەو بارزانیانەی لە دوای ڕوخانی کۆماری کوردستان بە سەرۆکایەتی (شێخ ئەحمەد)[28]ی بارزانی دەگەڕانەوە بۆ عێراق، لە ٢٩کانونی ١٩٤٧ فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی لە حاجی ئۆمەران لەگەڵ فەرماندەی پۆلیسی عێراقی (عەلی حیجازی) کۆبوونەوە هەتا ڕێوشوێنی پێویست بۆ دەستبەسەرکردنی جولانەوەی کورد بگرنەبەر[29]، هەروەها بۆ مەبەستی لاوازکردنی کۆماری کوردستان لەبەرانبەر هێزی نیزامی ئێرانی، حکومەتی عێراقی کەوتە هەڵخەڵەتاندنی یەکێك لە سەرۆك هۆزو ژەنەراڵە بە تواناکانی بەشدار لە کوماری کوردستان بە ناوی (حەمە ڕەشید خان)[30]، دوای ئەوەی

---

٢٧- عثمان علي: دراسة في الحركة الكردية، ص٧٣٠-٧٣١.

٢٨- شێخ ئەحمەدی بارزان: لە دایکبوونی بارزانی کۆتایی سەدەی ١٩ بووە، بەرانبەر ڕژێمی پادشایەتی سەرۆکی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٣٢ی ناوچەی بارزان بووە، هەروەها سەرکردایەتی بارزانیەکانی کردووە بۆ بەرگری لە کۆماری کوردستان لە مهاباد، سەرۆکی ڕوحی بارزانیەکانو برا گەورەی مستەفا بارزانی بووە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٩ مردووە. بڕوانە: (أيوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية وصراع القوى، ص٢٤٩-٢٥١" عثمان علي: دراسة في حركة كردية، ص٥٧٥-٥٩٤" محسن دزةيي: أحداث عاصرتها، (١٩٦١-١٩٧٥)،، اربيل ٢٠٠٢، ج٢/ص١٧٢)

٢٩- میرزا محمدامین مەنگوری: بەسەرهاتی سیاسی کورد ١٩١٤ هەتا ١٩٥٨، سلێمانی ٢٠٠١، ب٢، ل٧٢

٣٠- حەمە ڕەشیدخان: یەکێك بووە لە فەرماندە سەربازیە عەشایەریە بە ناوبانگەکانی کۆماری کوردستان لە مهاباد، لە کوردستانی عێراقەوە وەکو سەرۆك هۆزێکی بە توانا چووبوو بۆ بەرگری لە کۆمارو دوایی بە هاندانی دەسەلاتدارانی عێراقی کۆماری بە جێهێشتو گەڕایەوە، دواتر دوورخراوەتەوە بۆ خوارووی عێراق. بڕوانە: (عثمان علي: دراسة في حركة الكردية، ص٧٣٨-٧٤٨)

حکومەت ڕەزامەندی نیشاندا بێتە ناو خاکی عێراق و کۆمەڵێك بەڵێنی پێدا، دوایی بە دەستبەسەری دووری خستەوە بۆ خوارووی عێراق[٣١].

وەکو بەدەردەکەوێ سالانی (١٩٣٧-١٩٥٨) بە سەردەمی زێرینی پەیوەندییەکانی هەردوو وڵات دەژمێردرێت، بەڵام لەگەڵ شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ پەیوەندییەکانیان تێکچوو، چونکە هەریەك کەوتنە دوای ئاراستەی دوو جەمسەری جیاوازەوە، ئێران بە دەوڵەتێکی پاشایەتی و ئەندامی پەیمانی ناتۆ مایەوە، بەڵام عێراق ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاندو لە پەیمانی بەغدا کشایەوە، دۆستایەتی دەوڵەتانی بەرەی شۆسیالیستی ڕاگەیاندو دروشمی دژ بە ئیستیعماری ڕۆژئاوای بەرزکردەوە[٣٢]

پێگەی چەپ لە دوای دەرچوونی لە پەیمانی بەغدا لە عێراق زیاد بوو، ئێران هەروەکو ئەمریکاو بەریتانیاو تورکیا پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق تێکدا[٣٣]، لە ساڵی ١٩٥٩ هەردوو وڵات کەوتنە سکالاکردن لە یەکتری[٣٤]، بە تایبەتیش کەوتبوونە

---

٣١- المصدر نفسة، ص٧٣٨-٧٤٢

٣٢-جليلي جليل و الاخرون: الحركة الكردية في العصر الحديث. ت/عبدي حاجي، بيروت ١٩٩٢، ص٢٢٢" العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٠١

٣٣- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (حامد محمود عيسى: القضية الكردية في العراق من الاحتلال البريطاني الى الغزو الامريكي ١٩١٤-٢٠٠٤، ص٣٦١" عەبدولقادر سالح: شۆڕشی ١٤ ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عێراق، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٢٧-١٣٠" مسعود البارزاني: البارزاني و الحركة التحررية الكردية، كردستان ١٩٩١، ج٢/ص٣٠، ٣٧)

٣٤-مصطفى عبدالقادر النجار و الاخرون: الحدود الشرقية للوطن العربي، بغداد ١٩٨١، ص٢٦٨-٢٧٠، ٢٧٣

ناو دوو بەرەی ناکۆکی سەردەمی شەڕی سارد[٣٥]، پاشان ڕاگەیاندنی دەستووری تازەی عێراقیش هۆکارێکی دیکە بووە بۆ نیگەرانبوونی تورکیاو ئێران[٣٦]. دەستووری کاتی کە لە ٢٧ی تەموزی ١٩٥٨ ڕاگەیەنرا، لە مادەی سێیەمیدا هاتبوو، کە عەرەب و کورد لەو نیشتیمانەدا هاوبەشن[٣٧]، هۆکاری نیگەرانی تورکیاو ئێرانیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە دەترسان میللەتی کورد لەو وڵاتانەش داوای هەمان ماف بکەن، سەرەڕای ئەمە لە ناوبردنی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق ترس بوو بۆ ڕژێمی پادشایەتی لە ئێران، بۆیە لە سەرەتاوە دەزگای هەواڵگری (ساواک)[٣٨] کەوتەخۆ بۆ پیلاندانان دژی ئەزموونی ڕژێمی

---

٣٥- شەڕی سارد: جۆرێك بووە لە ناكۆكی نێوان وڵاتان، بەگرژیو ناثارامیو پێشبڕكێی خۆپڕچەككردنی دوور لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆ. لێرەشدا مەبەست لەو حالەتی گرژیەی نێوان دەوڵەتانی ڕۆژئاوا (ئەمریكاو هاوپەیمانەكانی)و بلۆكبەندی ڕۆژهەڵات (یەكێتی سۆڤیەتو هاوپەیمانەكانی)یەتی، كە لە دوای شەڕی دووەمی جیهانیەوە هەتا ساڵی ١٩٨٩ بەردەوام بووە، زۆربەی حكومەتەكان بە سەر ئەو دوو جەمسەرەدا دابەش ببوبوون. بڕوانە: (جزا توفيق طاليب: المقومات الجيوبولتيكية للأمن القومي في اقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الستراتيجية، سليمانية ٢٠٠٥، ص٤٠٩" الكيالي والاخرون: موسوعة السياسية، ج٢/ص١٨٦)

٣٦- جەبار قادر: چەند بابەتێكی مێژووی كورد، سلێمانی،١٩٩٩، ل٧٤

٣٧- لازاريف: تأريخ كوردستان، دهوك، ٢٠٠٦، ص٢٧٢. لەو مادەیەدا هاتووە: (يقوم الكيان العراق اساس التعاون بين المواطنين باحترام حقوقهم و صيانة حرياتهم، و يعتبر العرب و الاكراد شركا. في هذا الوطن و يقر الدستور حقوقهم القومية ضمن وحدة العراقية) بڕوانە: الوقائع العراقية، العدد (٢)، ٢٨ تموز ١٩٥٨

٣٨- ساواك: دەزگایەكی ئەمنی سەركوتكەرانەی ئێرانی سەردەمی موحەمەد ڕەزا شا بووە، كورتكراوەی (سازمان اطلاعات وامنيت كيشور)ە، لە ساڵی ١٩٥٦ دامەزراوە، پەیوەندیو هاریكاری هەبووە لەگەڵ وەكالەتی هەواڵگری ناوەندی ئەمریكی (C.IA)و دەزگای موسادی ئیسرائیلی. بڕوانە: (الكيالي و الاخرون: موسوعه السياسيه، ج٢/ص٨٣-٨٤)

کۆماری لە عێراق[٣٩]. ئەو نیگەرانەیش لە سەرەتاوە بەدیارکەوت، حکومەتی پاشایەتی پرسەی بۆ مەلیك فەیسەڵ و هاوڕێکانی راگەیاند[٤٠]، لەمەش رەنگدانەوەی ئەو نیگەرانیەی ئێران بووە بەرانبەر رووخانی رژێمی پادشایەتی و راگەیاندنی رژێمی کۆماری لە عێراق، دیارە کە رژێمی پادشایەتی لە ئێران ترساوە شەپۆلی گۆڕانکاری ئێرانیش بگرێتەوە.

تێگەیشتن لە سەرەتای ئەو گۆڕانکاریە بنەڕەتیانەی بەسەر پەیوەندییەکانی عێراق ئێراندا هات لە گۆڕانی رژێمی دەسەلات لە عێراق لە ساڵی ١٩٥٨ یارمەتیدەرە بۆ بەرچاوڕوونی لە ناکۆکیەکانی دواتر، چونکە هۆکاری کوردی وەکو کاریگەر یان وەکو بەرئەنجامێکی ناکۆکیەکانی دیکەی نێوان ئەو دوو وڵاتە بەدیارکەوت.

هەنگاوەکانی (عەبدولکەریم قاسم)[٤١] لە سەر مەسەلەی چاکسازی کشتوکاڵ و دۆستایەتیکردنی کۆمۆنیستەکانی عێراق، لەگەڵ پەشیمانبوونەوەی ئەو بەڵێنانەی لە سەرەتای هاتنە سەر حوکم بە کوردی دابوو، هەروەها ناکۆکی لەگەڵ رەوتی

---

٣٩- عیسی پەژمان: نهێنیەکانی بەستنی رێککەوتننامەی ئەلجەزائر، ١٩٧٥، و/ نادری ئیبراهیمی، سوید ١٩٩٧، ل٥٥-٦٨

٤٠- عەبدولقادر سالح: شۆڕشی ١٤ی تەمووزی، ل١٣١

٤١- عەبدولکەریم قاسم: لە ساڵی ١٩١٤ لە بەغدا لە دایك بووە، دوای تەواوکردنی کۆلیژی ئەرکان لە ساڵی ١٩٤١ لە سوپا بۆتە ئەفسەر، لە ساڵی ١٩٥٧ پەیوەندی کردووە بە ئەفسەرانی ئازادیخواز، دوای سەرکەوتن بە سەر رژێمی پاشایەتی بۆتە سەرۆك کۆمارو فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان، بە هۆی زیادبوونەوەی ناکۆکیەکانی لەگەڵ رەوتی بەرهەڵستکار بە سەرۆکایەتی عەبدوسەلامی جێگری لە شوباتی ١٩٦٣ لە ئاکامی کودەتایەك لە سەر کار لابراوەو کوژراوە. بڕوانە: (الکیالی والاخرون: موسوعە السیاسیە، ج٣/ص٨٤٢-٨٤٣)

ناسیونالیستەکانی عەرەب، کە عەبدوسەلام عارف[42] نوێنەرایەتی دەکردن و ئەو دیکتاتۆریەتەی دواتر پەیڕەوی لێکرد، دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسمی بەرەو ناقارێکی خراپ برد، ئێران ئەو بارودۆخەی قۆستەوە بۆ لاوازکردنی حکومەتی عێراقی، بۆ ئەو مەبەستەش کەوتە پشتگیری ئەو سەرۆک هۆزە کوردانەی لە بەر پەرەسەندنی دەسەڵاتی شیوعیەکان و ریفۆرمی کشتوکاڵی[43] نیگەران بوون[44] گەرچی هەیە رۆڵی ئێران لەو سەرهەڵدانە دەرناخات و زیاتر ئێران بە دژی وێنا دەکات[45]، کە دواتر بووە سەرەتایەک بۆ شۆڕشی ئەیلول و بووە ئەڵقەیەکی گرنگ لە بزاڤی رزگاریخوازی میللەتی کورد لە

---

٤٢- عەبدوسەلام عارف: لە ساڵی ١٩٢١ لە بەغدا لە دایك بووە، دەرچووی ئەکادیمیای سەرباز بوو، دوایی پەیوەندی کردووە بە سوپا، لە ساڵی ١٩٥٧ چۆتە ریزی رێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانەوە، لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەموز بۆتە دووەم پیاوی کۆماری عێراق، بەڵام هەر زوو کەوتە ناکۆکی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم، بە هاوکاری بەعسیەکان لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کۆدیتای کردووە، هەتا لە نیسانی ساڵی ١٩٦٦ بە رووداوی کەوتنە خوارەوەی فرۆکە مرد. بڕوانە: (الکیالي و الاخرون: موسوعة السیاسیة، ج٣/ ص ٨٣٤-٨٣٥)

٤٣- یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ: بە ژمارە (٣٠)ی ١٩٥٨/٩/١ دەرچوو، بە هۆی رەچاونەکردنی ناوچەی کوردستان کاردانەوەی لێ پەیدابوو، جێبەجێ نەکرا و گیروگرفتی بۆ دروست بوو. بڕوانە: (واحید عومەر محیدین: دانوسانەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و حکومەتەکانی عێراق (١٩٢١-١٩٦٨)، سلێمانی ٢٠٠٦، ل١٠٩)

٤٤-حامد محمود عیسى: القضیة الکردیة في العراق، ص٩٢-٩٤" سیظان عارف بادي: الحرکة القومیة التحرریة الکردیة في کردستان العراق ١٩٥٨-١٩٦٣، دهوك، ٢٠٠٥، ص٨٣-٩٢

٤٥-عبدالله أحمد رسول البشدري: إندلاع ثورة أیلول المجیدة ١٩٦١، ت/محمد صالح العقراوي، اربیل٢٠٠١، ج١/ص٢٣-٢٥.

کوردستانی عێراق[46]. پێمان وایە لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، کە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول لە سەر شێوازی ڕاپەڕینی سەرۆك هۆزەکان بووەو پشتیوانیکردنی ئێران لە ئەو ڕابوونە ناشاردرێتەوە، لەوەوە بەدەردەکەوێ، کە دەرفەتی دەرەکی لە پاڵ هۆکارە زاتیەکان بوونە هۆکاری هەڵگیرسانی شۆڕش‌و ساڵانی دواتریش ئەو پشتگیرییە بەردەوام بووە.

نیگەرانی ئێران لە حکومەتی عێراق وای لە ئێرانکرد بە ڕابوونی سەرۆك هۆزەکان دڵخۆش بێ، لە بەهاری ساڵی ١٩٦١ەوە هەڵگیرسانی شۆڕش بۆ بەرەنگاری ڕژێمی قاسم پێش بڕیاری سەرکردایەتی (پارتی دیموکراتی کوردستان = پ.د.ك)[47] کەوت ، دواتر سەرکردایەتی شۆڕش کەوتە دەستی (پ.د.ك)و ئێرانیش بە ڕەمکی لە ڕێگەی سەرکردایەتی پارتیەوە یارمەتی شۆڕشی کوردی داوە، بەڵام سەرەتای شۆڕش بە ڕوخسارێکی هەڵگەڕانەوەی سەرۆك هۆزەکان دەستی پێکردووە[48]، لە ڕووی بەروارەوە سەرەتایەکی ڕۆشن نییە[49].

---

٤٦- بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر لە سەر هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بڕوانە: (الازاریف: تأریخ کوردستان، ص٢٧٧-٢٨٤)

٤٧- پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ك): لە سەرەتاوە بە ناوی (پارتی دیموکراتی کورد) لە ٦ ئابی ١٩٤٦ لە ساڵی ١٩٤٦ دامەزراوە، سەرەڕای لێکترازان سەرکردایەتی بزاڤی سیاسی‌و چەکداری کوردستانی بە ئەستۆوە بووە. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر مێژووی (پ.د.ك) بڕوانە: (حبیب محمد کریم: صفحات من نضال الشعب الکردي، تاریخ مؤتمرات الحزب، الحزب الدیمقراطي الکردستاني ـ العراق. د.ت، د.م)

٤٨- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (أیوب بارزاني: الحرکة التحرریة الکردیة و صراع القوی الاقلیمیة و الدولیة، جنیف،٢٠١١، ص١٠٠-" تۆفیقی مەلا صدیق: بیرەوەریەکانی ڕۆژانی حیزبایەتی‌و پێشمەرگایەتی‌و

ئاماژە هەیە بەوەی سەرەتای پەیوەندییە ڕەسمییەکانی کوردو شا بگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵی ١٩٦٣[50]، یان وەفدی سەرکردایەتی (پ‌د‌ك) بۆ یەکەم جار بە ڕەسمی لە کۆتایی مانگی تشرین سەردانی ئێرانی کردووەو هاوکاری لە ئێران وەرگرتووە[51]، دەگونجێ ئەمە زیاتر دروستبوونی پەیوەندی ڕەسمی بێ، نەك سەرەتای دروستی ئەو پەیوەندییە، چونکە بەر لەو مێژووە ڕۆڵی ئێران لە پشتیوانیکردنی سەرۆك هۆزە کوردەکان ناشاردرێتەوە، بەڵام دەبێت بۆ سەرەتای ئەو پەیوەندییە ئاگاداری دوو خاڵ بین:

یەکەم: سەرۆك خێڵەکان بە ناچاری پەنایان بۆ ئێران بردووە، نەك بە پێچەوانەوە ئێران پەیوەندی پێوەکردبن، پەیوەندییەکە لە سەرەتاوە لە نێوان سەرکردایەتی (پ‌د‌ك)و ئێراندا نەبووە

دووەم: پەیوەندی ڕەسمی لەگەڵ (پ‌د‌ك) دەگەڕێتەوە بۆ دوای بێ ئومێدی ئەوان لە بەرانبەر عەبدولکەریم قاسمو دوای پەیوەندی سەرۆك خێڵەکان لەگەڵ ئێران دێ.

بە درێژایی ماوەی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لە ١١ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ بۆ ئازاری ١٩٧٥، کورد ببووە خاڵی کاریگەر لە هاوکێشەی پەیوەندییەکانی ئەو دوو

---

دوورخرانەوەم، ب‌ش، ١٩٩٦، ل٢٩-٣٥* جرجیس فتح الله: زيارة للماضي القريب، ستوکهولم، ١٩٩٨، ص٢٩-٣٣* البشدري: إندلاع ثورة أيلول، ص ٢٠-٣٠)

٤٩- بۆ زیاتر زانیاری لە سەر ئەو بۆچوونە جیاوازانە بۆ سەرەتای شۆڕشی ئەیلول بڕوانە: میظان عارف بادي: الحركة القومية الكردية التحررية، ص٩٣-١٠٦

٥٠- فەرەیدون عەبدوڕەحیم عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠ – ١١ی مارتی ١٩٧٤، تۆژینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە، (نامەی بڵاونەکراوە) بەشی مێژوو، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ل٨٢

٥١- البشدري: إندلاع ثورة أيلول، ص١١٠-١١١.

ولاته، ئێران هەمیشە هاندەری سەرکردایەتی کورد بووە بۆ درێژەدان بە شەڕ بەرانبەر رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق، ئەویش نەك بۆ بەدیهێنانی مافە رەواکانی میللەتی کورد، بەڵکو بۆ دەستەبەرکردنی خواستە ستراتیژیەکانی خۆی[٥٢]، چونکە بە درێژایی دەسەلاتی هەردوو رژێمی قاسم-عەبدوسلام عارف پەیوەندی نێوان هەردوو ولات گرژبووە[٥٣]، بەلام هەموو ریستگەکانی گفتوگۆی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٦٣و ١٩٦٧و ١٩٧٠ ئەوە بە دیاردەخەن، کە سەرەڕای نیگەرانی ئێران سەرکردایەتی کورد گفتوگۆی قبولکردووە، حکومەتی عێراقی بووە سەرکردایەتی کوردی ناچار بە هەلگیرسانەوەی شەڕ کردووە، ئێرانیش ئەو دەرفەتەی قۆستۆتەوەو سەرکردایەتی کوردیش ناکۆکی هەردوو ولاتی لە بەرژەوەندی خۆی بەکارهێناوە.

لە ماوەی شۆڕشی ئەیلول پەیوەندییەکانی هەردوو ولات تەبایی بە خۆیەوە نەدیوە، جەبار قادر دەڵێ: ((لە دوای هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول نوێنەری هەرسێ دەوڵەت تورکیاو ئێران‌و عێراق کۆبوونەوە بۆ راوێژکردن لە سەر لەناوبردنی شۆڕشی ١١ ئەیلولی ١٩٦١)) کۆبوونەوە)[٥٤]، رێڕەوی ناکۆکییە بەردەوامەکانی ئەو ماوەیە کۆبوونەوەی وای لێ چاوەڕێ ناکرێ، لە لایەکی دیکەوە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژەی بە کۆبونەوەی لەو جۆرە نەکردووە، گەرچی لازاریف لە سەر ئاستی ئەفسەرەکانی سوپا لە ساڵی ١٩٦٣ باسی کۆبوونەوەی هەرسێ ولاتی کردووە، گوایە هاوپەیمانیەتی (ناتۆ)ش لە لای خۆیەوە پشتیوانی‌و هاوکاری خۆی دەربڕیوە بۆ ئەو

---

٥٢- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل١٧٠-١٧١

٥٣- غیدان: تأریخ الاطماع الفارسیة، ص٣٢

٥٤- چەند بابەتێکی مێژووی کورد، ل٧٦

ڕێوشوێنانەی دژی جوڵانەوەی کورد گیارنەتەبەر))[55]، ئەو بۆچوونەی نووسەری عێراقی زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە، کە لە پاڵ شیکارە ناسیونالستە عەرەبیەکەی ڕێنەیەکی جوان دەخاتەڕوو لە سەر بارودۆخی شەستەکانی سەدەی رابردوو، دەنووسێ: ((هەرسێ کۆمەڵگای کوردی بە کردەوە پێکەوە دەژین، تەنیا سنوورێکی نیشتیمانی دەستکرد لێکیان جیا دەکاتەوە، پەیوەندی خوێن لە نێوان ئەوانەدا هەیە، ئەمەش جۆرێك لە هاریکاری ناڕەسمی هاوبەشی لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتە دروست کردووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوانی کورد، بەڵام بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانە هەمیشە لە سەر ئەو مەسەلەیە هاوتەریب نەبوو، بۆیە هەندێ جار ناکۆکیە کۆنەکانیان وای کردووە کورد لە دژی یەکتر بەکاربهێنن...))[56]. ئەمە ڕێسایەکی گشتیو دروست بووە لە نێوان هەرسێ دەوڵەت، کە پەیوەندیەکانیان وای کردووە بە هەمیشەیی کۆك نەبن لە سەر گرتنەبەری ڕێوشوێنی هاوبەش لە بەرانبەر کورد.

شا دوای کودەتای شوباتی ١٩٦٣ بڕیاریدا خورتر بە ڕێگەی یارمەتیدانی بزوتنەوەی کوردیەوە دژایەتی عێراق بکات[57]، پێش کودەتای شوبات گفتوگۆیەکی لاوەکی لە نێوان سەرانی کودەتاو سەرکردایەتی کورددا هەبووە، بۆیە لە دوای کودەتا دانوسان دەستی پێکرد، سەرکردایەتی کورد لە سەر ئەو مەسەلەیە بوونە دوو بەشەوە، مستەفا بارزانی پشتەستور بە ژمارەیەك لە ئەندامانی سەرکردایەتیو بەرپرسو لایەنگرانیو زۆربەی هێزی پێشمەرگە گفتوگۆیان دەست پێکرد، لە

---

٥٥- لازاریف: تأریخ کوردستان، ص٢٨٩

٥٦- سعد ناجي جواد: العراق و المسألة الكردية، لندن ١٩٩٠، ص١٧٨

٥٧- فەرەیدون عەبدوڕەحیم عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی عێراق، ل٧٦؛ میڤان عارف بادي: الحركة القومية الكردية التحررية، ص١٢١-١٢٥

بەرانبەردا ئەندامانی (م.س)و زۆرینەی سەرکردایەتی بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم ئەحمەد[٥٨] سکرتێری پارتی، کە دواتر بە باڵی (م.س)[٥٩] ناسرابوون گفتوگۆیان رەتکردەوە، سەرەڕای هۆکارە بابەتیو زاتییەکانی ناو سەرکردایەتی (پ.د.ك)، ئەمە سەرەتایەك بوو لە ناکۆکیو شەڕی ناوخۆی ناو بزاڤی رزگاریخوازی کوردو پەنابردنە بەر ئێرانو رژێمی ئێران لە سەر ریزەکانی سەرکردایەتی کوردستانی عێراق[٦٠]، لە سەرەتاوە سەرکردایەتی (پ.د.ك) بە یەك ستاف چوونە ناو گفتوگۆ، (جەلال تاڵەبانی) سەرۆکی

٥٨-- ئیبراهیم ئەحمەد: لە ساڵی ١٩١٤ لە سلێمانی لە دایك بووە، لە سییەکانی سەدەی رابردووە لە بواری ئەدەبو رۆژنامەنووسیو سیاسی کاری کردووە، لە ساڵی ١٩٤٥ بەرپرسی لقی (ژێکاف) بووە لە سلێمانی، پەیوەندی بە (پ.د. ك)ەوە کردووە، لە ساڵی ١٩٥٩-١٩٦٤ سکرتێری مەکتەبی سیاسی بووە، دوای نووشستی شۆڕشی کوردستان وەکو نووسەرو سیاسییەکی بێلایەن لە لەندەن دانیشتووە، لە ساڵی ٢٠٠٢ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: (جمال بابان: اعلام کرد العراق، سلمانیة،٢٠٠٦، ص٨-١٢" ئەمجەد شاکەلی: خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی چەپی کوردی لە کوردستانی عێراق" لەم ناونیشانە: www.kurdistannet.org)

٥٩- لێرەوە لە شەقامی کوردی بە باڵی جەلالو مەلایی ناسرابوون.

٦٠-وەکو خوێندنەوەی جیاواز بۆ رووداوەکانو بیانووەکانی ئەو ناکۆکییەو رۆڵی ئێران. بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو شۆڕشی ئەیلول. ل١٦٠-١٩٠" أیوب بارزاني: الحرکة التحرریة الکردیة و صراع القوی، ص١٩١-١٩٩"جرجیس فتح الله: زیارة للماضي القریب، ص١٢٤-١٢٧" علي سنجاري: الحرکة التحرریة الکردیة موقف و اراء، دهوك ١٩٩٧، ص٤٦-٥٥ " فاتیح رسول: بنچینەی مێژووی بزاڤی چەپ لە کوردستاندا، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٢٤٧-٢٥٠" مسعود البارزاني: البارزاني و الحرکة التحرریة الکردیة، کوردستان، ١٩٩٠ج٣/ ص١٢٢-١٤٥" واحید عومەر ئەحمەدین: دانووسانەکانی بزووتنەوەی، ل٢١٢-٢٣٦)

وەفدی (پ.د.ك) بووە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عەبدوسەلام عارف[٦١]، وەکو بەدیاردەکەوێ دواتر لە سەر ئاگربەستو وردەکاریەکانی دیکە نێوانیان تێکچووە.

هەتا ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ئێران ویستوویەتی کاریگەری بە سەر هەردوو باڵی (پ.د.ك) رابگرێ، بەرپرسێکی بە رەگەز کوردی بە ناوی (عیسا پەژمان) بۆ هاریکاریو کارئاسانی باڵی (م.س)ی پارتی تەرخان کردبوو[٦٢]، لە بەرانبەردا بەرپرسێکی دیکەی بە ناوی (مەنسور پور) بە رێنومایی (پاکروان) بەرپرسی گشتی ساواکی ئێرانی بۆ دڵراگرتنو پەشیمانکردنەوە لە هامۆشۆی بارزانی دابوو[٦٣]، لە کاتی گەمارۆی ئابووری حکومەت لە سەر کوردستانی عێراق، ئێران دەرگای سنووری کردبۆوە[٦٤]، لە دوای ساڵێكو دوو مانگ لە نیسانی ساڵی ١٩٦٥ گفتوگۆ لە نێوان مستەفا بارزانیو حکومەتی عارف نووشستی هێنا، ئێران ئەو پەیوەندییەی پێشتری وەکو دەروازەیەك هێشتبۆوە هەتا مستەفا بارزانی ناچار بێت هاوکاری لە ئێران وەربگرێت، لێرەوە عەبدوسەلام عارف کەوتە تاوانبارکردنی بارزانی بە بەکرێگیراوی ئێران[٦٥]. هارکێشەی ململانێی هەردوو باڵەکەی پارتی لە پشتبەستن بە ئێران پێچەوانە بۆوە، باڵی (م.س) گەڕانەوە بۆ عێراقو لەگەڵ حکومەتی عارف کەوتنە گفتوگۆ،

---

٦١- عادل تقي عبد محمد البلداوي: نضال الشعب الكردي و موقع البارزاني في الوثائق السرية، بغداد ٢٠٠٣، ص٥١

٦٢- البارزانی: البارزاني والحركة، ج٣/ ص١٣٢

٦٣-ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل١٧٧" البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص١٤٢-١٤٣

٦٤- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل١٧٢

٦٥- نادر ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، و/عەتا قەرەداغی، سلێمانی ٢٠٠٤، ل١٤٩

بارزانی‌و بەشە سەرەکیەکەی پارتی پەیوەندیان لەگەڵ ئێران گەرم‌و گوڕکردەوەو پەیوەندیان لەگەڵ حکومەتی عێراق پچڕاند[٦٦]

بە درێژایی ساڵانی ١٩٦٦ -١٩٦٨ ئێران لە رێگەی مستەفا بارزانیەوە پشتیوانی لە شۆڕش کردووە، بۆیە ئەو ماوەیە بۆ ئێران زۆر گرنگ بووە، بە وردی‌و بەردەوامی شا بۆ چاودێری رووداوەکان لە پەیوەندی دابوو[٦٧]. بە هۆی پشتیوانی مادی‌و مەعنەوی لە کورد،عێراق بە رەسمی ناڕەزایی خۆی لە بەرانبەر دەسەڵاتدارانی ئێران راگەیاندووە، عەدنان پاچەچی وەزیری دەرەوەی عێراق یاداشتنامەی ناڕەزایی داوەتە باڵوێزخانەی ئێرانی‌و بە هاوکاریکردنی یاخیبوان‌و کاری تێکدەرانە تاوانباری کردوون، هەمان رۆژ پاچەچی باڵوێزەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسای بانگکردە بارەگای وەزارەتی دەرەوە هەتا لە مەڕ قەیرانی نێوان عێراق‌و ئێران ئاگاداریان بکاتەوە... دوای چەند رۆژ عەبدورەحمان عارف[٦٨]، ئەمیر عەباس هوەیدای[٦٩] سەرۆك وەزیرانی ئێرانی بە پیلانگێری

---

٦٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل٩٠-٩٧)

٦٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عیسی پژمان: نهێنی یەکانی بەستنی، ل٦٠-٧٥)

٦٨- عەبدولرەحمان عارف: لە بەغدا لە دایك بووە، برای عەبدوسەلام عارف بوو، لە ساڵی ١٩٣٦ چۆتە کۆلێژی سەربازی. لە ساڵی ١٩٥٧ پەیوەندی بە ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە کردووە، دوای مردنی برایەکەی لە نیسانی ١٩٦٦ بۆتە سەرۆك کۆماری عێراق، دەسەڵاتی لاواز بووەو دوای کودەتای بەعسیەکان لە ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨ لە عێراق دوورخرایەوە. بڕوانە: (الکیالي والاخرون: موسوعة سیاسیة، ج٣/ ص٨٢٧)

٦٩- ئەمیر عەباس هوەیدا: چەندین بەرپرسیارێتی لە کاری دیپلۆماسیەتی وەرگرتووە، لە ساڵی (١٩٦٥-١٩٧٨) بووە سەرۆکی وەزیران، کوێرانە لایەنگری سیاسەتی شای کردوە، دوای شۆڕشی گەلانی ئێران دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سێدارەیاندا. بڕوانە: (الکیالي والاخرون: موسوعة السیاسیة، ج٧/ ص٢٠٠" ئیحسان نەزاغی: لە دەرباری شاوە بۆ زیندانەکانی شۆڕش، و/ئەحمەد قادر سەعید: سلێمانی ٢٠٠٥، ل٣٤٢).

دژی عێراق تاوانبار کرد، لەبەر ئەوەی هەوەیدا لە سەرەتای تشرینی دووەمی ئەو ساڵە چاوی بە بارزانی کەوتبوو[70]

عەبدوڕەحمان عارف بەر لە کودەتای ۱۷ تەموزی ۱۹٦۸ بۆ ئاسایکردنەوەی پەیوەندییەکان سەردانی ئێرانی کرد، ئەمەش لە ناکامی فشاری کوردیەوە هاتبوو، عارف دەیویست ئەو هێزە پاڵپشتە لە دەست کورد دەربهێنێت، بەڵام فریا نەکەوت[71]

لە دوای کودەتای دووەم جار بەعسییەکان لە ۱۷ی تەموزی ۱۹٦۸ گەڕانەوە بۆ دەسەڵات، لەگەڵ هەردوو باڵەکەی پارتی کەوتنە نەرمی نواندن، هەتا پارمەتی ئەو باڵەشیاندا، کە لەگەڵ ئێران دۆستایەتی بەهێزی هەبوو، ئەمەش بۆ ئەوەبووە لە مەترسی فشاری ئێران دەربازبن، بەڵام لەمەدا سەرنەکەوتن[72]. شەڕ بە گەرمی لە تشرینی دووەمی ئەو ساڵە لە نێوان باڵی سەرەکی (پ.د.ك)و حکومەتی عێراق دەستی پێکرد، بەڵام باڵی (م.س) هەر لەگەڵ حکومەتدا مانەوە[73]

مەسعود بارزانی باسی نەخشەیەکی سەربازی کردووە، کە بە پێشنیازی ئەفسەرێکی ئێرانیو کەسێکی دیکەی ئیسرائیلی لە ۲۱ ئابی ۱۹٦۸ کراوە، بەڵام مستەفا بارزانی رازی نەبووە، هەمان دوو ئەفسەر لە کۆتایی ئەو ساڵە دووبارە نەخشەی هاریکاری سەربازیان بۆ سەرکردایەتی بارزانی هێناوەتەوە گۆڕێ، دووبارە رازی نەبوون[74]، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت جۆرەکانی دیکەی پشتیوانی قبوڵ نەکرابێت، لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹٦۵ەوە (۳۵) هەزار پارچە چەك بە یەك جار،

---

۷۰- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا و/حەمە کەریم عارف، ج۲، ل۳۲٤-۳۲٥

۷۱- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل۲۳٦

۷۲- هەمان سەرچاوە، ل۲٤٤-۲٤٦

۷۳-البارزانی: البارزانی والحركة، ج۲/ص۲۰٥-۲۰۷

۷٤- المصدر نفسه، ص۲۰۷

مانگانەش چارەکە ملیۆنێك دینار درلوەتە (پ.د.ك)، سەرەڕای ناردنی کەرەستەی پزیشکیو خۆراك بۆ بارەگاکان[٧٥]، لە مانگی کانوونی یەکەمەوە لە سەردەستی تەفسەرانی ئێرانی لە سەر ئەو چەكو کەرەستانەی پێوستن بۆ نەخشەی لێدانی نەوتی کەرکوك دەستکراوە بە مەشق، هەتا لە شەوی ١-٢ ئازاری ١٩٦٩ نەخشەکە جێبەجێ کرا[٧٦]، کە تا ئەوکاتە بە گەورەترین هاریکاری ئێرانی هەژمار دەکرێ بۆ لێدانی ناوەندێکی زیندووی ئابووری لە ناو خاکی کوردستانی عێراق، گەرچی زیانی لە حکومەتی عێراقیدا، بەڵام لە ناو ئەندامانی نەوتکۆ دەنگی نەدایەوە، کە سەرکردایەتی زیاتر ئەوەی مەبەست بوو. ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ هێرشی توندی چەند مانگیو گەمارۆی توند لە لایەن حکومەتەوە بۆ سەر هێزەکانی پێشمەرگە[٧٧]، لێرەوە بە درێژایی ساڵی ١٩٦٩ شەڕو پێکدادانی گەرم لە بەرەکانی شەڕی پێشمەرگەو حکومەت دەستی پێکرد.

حکومەتی ئێران لە دەرەوەی پێگەی کوردستانی عێراق هەنگاوی دیکەی بە ئاراستەی دژایەتی عێراق هاویشت، لە رێگەی (عەبدولغەنی راوی)و (عەبدورەزاق نایف) لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٩ەوە نەخشەی دانا بۆ پشتیوانیکردن لە کودەتای سەربازی بۆ رووخانی حکومەتی بەعس، بۆ ئەو مەبەستە رێوشوێنی گرتەبەرو هیوای زۆری لە سەر هەڵچنی بوو، لە کانوونی دووەمی ١٩٧٠ هەوڵەکان ئاشکرا بوونو کودەتاکە

٧٥- علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٧٨

٧٦- المصدر نفسه، ص٢٠٩-٢١٠

٧٧- کرچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٢٤٥-٢٤٦، ٢٤٨" فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٤٧-٢٤٨

سەرنەکەوت[78]، لە لایەکی دیکەوە، لە گەرمەی لافو گەزافی بەعسییەکان بۆ عروبەو خاوەنداریەتی بە سەر کەنداوی فارس[79] ئێران ڕێککەوتننامەی (سەعد ئاباد)ی ساڵی ١٩٣٧ لە ١٩/٤/١٩٦٩ هەڵوەشاندەوە[80]، بیانووی ئێران لەو هەنگاوە بەرزکردنەوەی ئاڵای عێراق بووە بەسەر کەشتیە ئێرانیەوەکانەوە لە کاتی تێپەڕبوون لە ئاوی شەتولعەرەب، کە لەو پەیمانەدا هاتووە[81]، ئەمەش وەکو بەدەردەکەوێ بیانوو بووە، ئەگینا پارسەنگی هێز بۆ ئێران لە باربووە لەو پەیمانە پەشیمان بێتەوەو خواستی ئیمتیازاتی زیاتری لە ئاوی شەتولعەرەبدا هەبێت. بۆیە حکومەتی عێراق لە ژێر فشاری ئەو هەنگاوانەی ئێرانو سەرکەوتنەکانی پێشمەرگە ناچاربوو بیر لە گفتوگۆ بکاتەوە لەگەڵ سەرکردایەتی کورد.

زەقبوونەوەی ناکۆکیەکانی هەردوو وڵات لە سەردەمی شەڕی سارد، کە سۆڤیەت نەیدەویست ئێران بە هۆی نووشستی عێراقەوە لە کەنداو باڵادەست بێت، کەوتە ناوبژیوانی کوردو ڕژێمی عێراق، ڕۆڵی سۆڤیەت لە فاکتەرە کاریگەرەکانی

٧٨- البارزاني: البارزاني والحركه، ج٣/ ص٢٢٢" وفيق السامرائي: حگام البوابه الشرقيه، كويت،١٩٩٧، ص٤٠

٧٩- زاراوەی کەنداوی عەرەبی زیاتر لە دوای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو پەرەی سەند، پێشتر کەنداوی فارس یان کەنداوی بەسرا یان دەریای هورمزیان پێ وتووە، بەڵام هیچیان هێندەی کەنداوی فارس لە ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتیو سەرچاوە مێژووییەکاندا بە کارنەهاتووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (مەحمود ڕەزا: گۆڤاری (سیاسەتی دەولی) ژمارە (٤) کانوونی دووەمی ١٩٩٣، ل٣١-٥٥)

٨٠- تربب: صفحات من تأريخ العراق، ص٢٧٠" ناچل رسول: العراق- ايران، ص٢١" کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٤٨-٣٤٩

٨١- صالح ملا عيسى: بحران افرينى بر قدرتها در كردستان العراق، ج١، شركت گلبان چاپ، تهران، ١٣٨٠، ص١٧٤

ڕێککەوتنی کوردو ڕژێمی عێراق بووە لە پێناو بەهێزکردنی پێگەی خۆی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمە سەرەڕای هەموو وڵاتانی کامپی ڕۆژهەڵات، کە هاندەر بوون بۆ بە یەکگەیاندنی سەرکردایەتی کوردو حکومەتی عێراقی [82]، لە لایەکی دیکەوە سۆڤیەت دەیویست بەم هەنگاوەی دۆستایەتی کورد بۆ خۆی مسۆگەر بکات.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩ از وتوێژەکان بە ڕەسمی دەستی پێکردو بە واژۆکردنی بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ کۆتایی هات[83]، لە ئاستی ناوخۆش (فوئاد عارف)[84] و (عەزیز شەریف)[85] لەو ناوبژیوانیەدا بەشداربوون[86]، بەڵام ڕۆڵی یەکێتی سۆڤیەت لە هەمووماں زیاتر بووە.

---

٨٢-فەرەیدون عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی عێراق، ل٢٦

٨٣- شاکیر خدر عوی: المسالە الکردیە فی العراق المعاصر، ت/د.عبدی حاجی، دهوك، ٢٠٠٨، ل٣٦٤-٣٦٥* فەرەیدون عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی، ل١٧

٨٤--فوئاد عارف: لە ساڵی ١٩١٣ لە سلێمانی لە دایك بووە، کۆلیژی سەربازی تەواو کردووە، وەکو کەسایەتیەکی بێلایەن لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بەشداری کاری سیاسی کردووە، سەرەڕای پۆستی سەربازی لە عێراق هەتا پلەی وەزیرو جێگری سەرۆك وەزیران سەرکەوتووە، لە بەیاننامەی ١١ی ئادار ناوبژیوانی نێوان بەعسیەکانو شۆڕشی کورد بووە، لە ڕێککەوتننامەی جەزائیرەوە لە کاری سیاسی دابڕاو، هەتا نووسینی ئەم توێژینەوەیە لە ژیاندا ماوە. بڕوانە: (جمال بابان: اعلام کرد العراق، ص٥٩٢* صلاح الخرسان: التیارات السیاسیە فی کردستان العراق (١٩٤٦-٢٠٠١) ، بیروت، ٢٠٠١، ص١١٧* چاوپێکەوتن لەگەڵ ناوبراو، گۆڤاری بابان، ژ(٦) نیسانی ٢٠٠٨، ل١٠-١٢)

٨٥- عزیز شەریف: لە دایکبووی ساڵی ١٩٠٩ شارۆچکەی عانەی سەر بە پارێزگای ئەنبارە، دەرچووی کۆلیژی مافە، لە بواری دادوەری کاری کردووە هەتا بۆتە ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوە، لە سەرەتاوە پەیوەندی بە ڕێکخراوە مارکسیەکانەوە کردووە، لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز کرایە سەرۆکی ئەنجومەنی ئاشتیو هاریکاری عێراقی، لە نزیکەوە هاوڕێی مستەفا بارزانی بووە. بڕوانە: (صلاح الخرسان: التیارات السیاسیة، ص١٩٠)

ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتی و لە ئاستی دەرەوە پشکی گەورەی تێدا هەبووە[87]، لە ئاستی ناوخۆش حیزبی بەعس بە واژۆکردنی ئەو بەیاننامەیە ئومێدی وابووە کارتی کوردی لە ئازادیی خۆی لە دەست شا دەرهێنابێت[88]. ئێرانیش لەلای خۆیەوە بە ڕێککەوتننامەی ١١ئازار زۆر نیگەران بووە[89]، چەندین نامەو وەفدی ناردۆتە لای سەرکردایەتی بارزانی هەتا پەشیمانی بکاتەوە، لەوبارەیەوە مەسعود بارزانی دەڵێ: ((شا لە سەر ئەو داوایە بەردەوام نامەی دەنارد، هەتا دوا نامە جۆرێك لە هەڕەشەی تێدابوو))[90]

لێرەدا شەڕی شۆڕشی کوردستانی باشوورو حیزبی بەعس وەستا، بەڵام ئەگەرەکانی نەگەیشتنە ئاکام مابوون چونکە:

یەکەم: بەشێکی پرۆسەی ئاشتی نێوان شۆڕشی کوردو حکومەتی عێراق بە هۆی نزیکبوونەوەی پەیوەندی یەکیەتی سۆڤیەت و حکومەتی عێراق بووە، ئەمەش هاوکاتی

---

٨٦- حبیب محمد کریم: صفحات من نضال، ص٢٧" ئەرەیدون عەبدوڕەحیم عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی، ل ١٧

٨٧- علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٧٨" عومەر نورەدینی: سیستەمی نوێی جیهانی و دۆزی کورد، کوردستانی عێراق وەك نموونە، هەولێر ٢٠٠٣، ص٩٩" ئەرەیدون عەبدوڕەحیم عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی، ل٤٦

٨٨- ئەوشیروان مستەفا ئەمین: لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٩

٨٩- کوچیرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٢٦٥" ئەرەیدون عەبدوڕەحیم عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی، ل٣٥" ئوتلاد کەریم: لە یادی ٢٤ هەمین ساڵرۆژی پیلانی شومی جەزائیردا، گۆڤاری هەڵەبجە، ژ١، ئازاری ١٩٩٩، ل٢١،

٩٠- البارزاني و الحركة، ج٣/ص٢٣٧

پرۆسەی شەڕی سارد بووە، پەیوەندییەکانی سۆڤیەتی - عێراقی چاوەڕوان کراو بووە بگاتە رادەی هەراسانکردنی بلۆکی رۆژئاوا"[91]

دووەم: ئێران لە یەکەم رۆژی رێککەوتننامەی ١١ ئازار نیگەران بووە، چونکە بەو هەنگاوە رێبەرایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق سەربەخۆیی خۆی سەلماندووە، لە بەرانبەردا هیچ خزمەتی شای تێدا نەبووە، هاندەریش بووە بۆ کوردەکانی ئێران، کە ئومێدی نەتەوەییان ببوژێتەوە[92]، بۆیە شا لە هەوڵی بەردەوام دابووە مستەفا بارزانی پەشیمان بکاتەوە، لە سەر هێڵیش بێنێتەوە بۆ قۆستنەوەی هەر گرژییەکی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی کورد، چونکە بە وەستانی شەڕ خواستەکانی ئێران لە عێراق لە دەست دەچێت، عێراق بە هێز دەبێتەوە و سۆڤیەت لە کەنداو نزیك دەبۆوە، دەبووە مەترسی بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش لە کوردستانی ئێران"[93]

سێیەم: خوێندنەوە بۆ ئەدەبیاتی حیزبی بەعس ئەوە بەدەردەکەوێ، کە هۆکاری بنەڕەتی لە هاتنە پێشی حیزبی بەعس بۆ سەلماندنی مافەکانی گەلی کورد لە دووتوێی ئۆتۆنۆمیدا، بە هۆی ترسی ئێرانەوە بووە، ئەگینا حکومەتی عێراق بێجگە لە ئاڵ دەسەڵاتی بەعس وەکو حیزبی سەرکردە، عەرەب وەکو نەتەوەی سەردەستە کورد لە میوانێکی گوێڕایەڵ زیاتری بۆ نەدەمایەوە.

لە بەرانبەردا راستییەکی دیکەی سەلماند بۆ بزاڤی رزگاریخوازی کورد، ئەویش ئەگەر سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان لە چوارچێوەی رێککەوتننامەیەکدا

---

٩١- نووەوینی: سیستەمی نوێی، ل٩٩

٩٢- یاسین سەردەشتی: کوردستانی ئێران (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جوڵانەوەی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩-١٩٧٩)، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٤٥

٩٣- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٦٥" لازاریف: تاریخ کوردستان، ص٣٢٤

مافەکانی بەمێنرێت دەستبەرداری شەڕ دەبێت[٩٤]، لە بەرانبەردا هەموو پەیوەندییەك لەگەڵ ئێران دەپچڕێنێت، کۆچیرای ڕۆژنامەنووس و نووسەری فەرەنسی ئەوکات لە نزیك ڕووداوەکانی شۆڕشی کوردستانەوە بووە، دەنووسێت: ((ئەگەرچی هەنووکە ناتوانرێ ئەوە دیاری بکرێت، کە جەنەراڵ بارزانی کەی دۆستایەتی لەگەڵ شای ئێران تازە کردەوە، گومان لەوەدا نیە، کە پاش واژۆی ڕێککەوتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ بە تەواوەتی پەیوەندی خۆی لەگەڵ شادا بچڕی))[٩٥]

هیچ بەڵگەنامەیەك دەست توێژەر نەکەوتووە، کە سەرکردایەتی کورد ئێرانی ئاگادار کردبێتەوە لە سەر ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار، بەڵکو ئەوە هەیە، کە ((سەرکردایەتی کورد بە بێ ویستی شا بەیانی ١١ی ئازاری لەگەڵ بەعسدا مۆرکردووە))[٩٦]

---

٩٤- ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار بە ناوی بەیاننامەی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بڵاو کرایەوە، لە پاڵ پێشەکی و پاشەکیەکدا ویستویەتی ئەوە بە نەتەوەی عەرەب و گەلی عێراق بڵێ، کە بۆیە ئەو مافەمان پێداون هەتا ئیمپریالیزم و داروودەستەکەی کورد دژی نەتەوەی عەرەب بەکارنەهێنن. ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار لە ئاکامی ئاربڕیوانی و وتووێژی چوار مانگ هاتە بەرهەم، کەچی بە ناوی بەیاننامەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڵاوی کردەوە، بەڵام نەگەیشتووینەتە ئەو بەڵگەنامانەی کە سەرکردایەتی کورد لە سەر ئەوە هاتبێتە دەنگ و نارەزایی دەربڕیبێ. بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٦٠-٢٧٠" البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص ٦١٤-٦٢٢" نورەدینی: سیستەمی لوپی، ل٩٨" وزارة الاعلام (مديرية الاعلام العامة)، تنفيذ بيان ١١ اذار، بغداد ١٩٧٢" دەقی بەیاننامەی ١١ی ئازار لە بەڵگەنامەی ژمارە (١)" التقرير السياسي الصادر عن المؤتمر القطري الثامن لحزب البعث العرب الاشتراكي. القطر العراقي، كانون الثاني ١٩٧٤، ثورة ١٧ تموز التجربة والافاق، د.ت، د.م، ص٧٠)

٩٥- کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٦٥

٩٦- جەبار قادر: چەند بابەتێکی مێژووی کورد، ل٧٧

ئەگەر بە پەیوەندییە دەرەکییەکانو هەنگاوە ناوخۆییەکانی بچینەوە دەبینین هەتا زیاتر لە ساڵێکیش لە دوای واژۆکردنی ڕێککەوتننامەی ئازار سەرکردایەتی کورد بە ئاراستەی تێکدانی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار هەنگاوی نەهاویشتووە، پەیوەندیشی لەگەڵ ئێران پچڕاندووە، بە پێچەوانەوە بەدیارکەوتنی بێ نیازی بەعسو خۆبەهێزکردنو کارە هەراسانکارەکانی، سەرکردایەتی کوردی ناچار کردووە خۆی ئامادەبکاتەوە بۆ شەڕ، ئێران توانیویەتی لە حاڵەتی پاشگەزبوونەوەی بەعس ناکۆکیەکان لە بەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنیت، حکومەتی ئێرانو سەرکردایەتی کورد پەیوەندییەکانیان دامەزرێننەوە، دوای دروستبوونەوەی گرژی نێوان بەعسو سەرکردایەتی کورد وەکو بیانووی دەهاتە گۆڕێو ڕەخنەی لە سەرکردایەتی کورد گرتووە، کە پەیوەندی لەگەڵ ئێران نەپچڕاندووەو یارمەتی لێوەردەگرێ[97]، وەکو بەدەردەکەوێ دامەزراندنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئێران دەکەوێتە دوای ٩/٤/١٩٧٢، واتە دوای بەستنی پەیمانی (هاریکاریو دۆستایەتی عێراقی - سۆڤیەتی).. ئەو هەموو پێشێلکاریانەی حیزبی بەعس لە دوای ساڵێکو دوو مانگ ئەنجامیدا کاردانەوەی لە سەر سەرکردایەتی کورد دروست کرد، ئەمەش وای کرد، کە پەیوەندی

---

٩٧- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٢٠٧-٢١٠

کوردو ئێران لە مایسی ساڵی ١٩٧٢ەوە، لە دوای سەردانی (نیکسۆن)[98] و (هێنری کیسنجەر)[99] بۆ تاران دەست پێبکاتەوە.

حیزبی بەعس دوای ڕێککەوتنی ئازار لە بوارەکانی سەربازیو ئابووری بەهێزکردەوەو ڕیزەکانی ڕێکخستەوەو ناحەزانی لە ناو سوپا حیزبەو لە ناوبرد، لەگەڵ داپێنکردنی دۆست بۆ حکومەت[100]

ئێران لە دوای بەیاننامەی ١١ی ئازار بە ئاراستەی کەنداو کەوتە فراوانخوازی، لە تەیلولی ساڵی ١٩٧١ لە دوای کشانەوەی ئینگلیز دەستی بە سەر هەر سێ دوورگەی

٩٨- نیکسۆن: ریچارد نیکسۆن سیو حەوتەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمریکا بوو، لە ساڵ ١٩٦٨ بە هۆی نیگەرانی خەڵکی ئەمریکا لە (جۆنسۆن) لە سەر شەڕی ڤێتنام، وەکو پاڵێوراوی پارتی کۆماری سەرکەوت، تا ساڵی ١٩٧٤ لەو دەسەڵاتە مایەوە، ئەمریکا لە سەردەمی نیکسۆن ئەوە سیاسەتی بووە، کە دوورکەوتنەوە لە تێکگیانی ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتو بایەخ بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بدات. بڕوانە: (الكيالي والاخرون: موسوعة السياسية، ج٦/ ص٦٥٦-٦٥٧)

٩٩- هنری کیسنجەر: لە ساڵی ١٩٢٣ لە ئەڵمانیا لە دایک بووە، بە هۆی توندو تیژی نازیەکانەوە خۆیو خانەوادەکەی چوون بۆ نیویۆرك، لەوێ لە زانستە سیاسییەکان خوێندویەتی، هەتا بۆتە مامۆستای زانکۆ، دواتر لە ڕاوێژکار لە وەزارەتی دەرەوە دەستی پێکردووە، هەتا لە سەردەمی نیکسۆن بۆتە ڕاوێژکاری تایبەتی ئاسایشی نەتەوەیی، سەرەڕای ئەو پۆستەی لە ساڵی١٩٦٨ بۆتە وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بڕوانە: (أمين هويدي: كيسنجرو إدارة الصراع الدولي، بيروت ١٩٧٩، ص٧٥-٨٢" الكيالي والاخرون: موسوعة السياسية، ج٥/ص١٢٢-١٢١٠" محمد حسنين هيكل: الحل والحرب، ط١، بيروت ١٩٨٥، ص٧٥-٨٤" مذكرات هنري كيسنجر: علي الانترنيت، www.aljazeera.net)

١٠٠- حوسێن محمد عەزیز: کوردو شۆڕشو هەلی مێژوویی، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٢٠٦" فهیم عبدالله عمر: ڕێکەوتن ١١ی ئادار ١٩٧٠" گۆڤاری (مەتین)، ژ٥٥، تەباخی ١٩٦٦، ل١٤

(تونبی گەورەو تونبی گچکەو ئەبو موسا)[١٠١] دا گرت[١٠٢]، لە بەرانبەردا حکومەتی عێراق پەیوەندی دیبلوماسی لەگەڵ ئێران پچڕاندو نزیکەی (٤٠٠٠٠) خێزانی کوردی شیعەی بە ناوی (تەبەعیەی ئێرانی)[١٠٣] لە عێراق دەرکرد، کە زۆربەیان کوردی فەیلی بوون[١٠٤]، هاوکات هەنگاوەکانی ئێران لە کەندار پەیوەندی نێوان عێراق و ئێرانی گرژتر کرد، لە لایەکی دیکەوە کاردانەوەی حکومەتی عێراق بە دەرکردنی کوردە فەیلیەکان، کە بە بەشێکی گرنگی نەتەوەی کورد و بزاڤی رزگاریخوازی کوردایەتی هەژمار دەکران، درزی گەورەی لەگەڵ سەرکردایەتی کورد دروست کرد.

---

١٠١- دوورگەی ئەبو موسا ٤٥ میل لە کەناری میرنشینی شاریقەوەو ٥٠ میل لە کەناری ئێرانەوە دوورە، دوورگەی تونبی گەورە بە دووری ٥٠کم لە دوورگەی ئەبوو موسا کەوتۆتە گەرووی هورمز، تونبی گچکە دەکەوێتە باشووری تونبی گەورەی، هەرسێ دوورگە دەکەونە سەر سنووری میرنشینەکانی عەرەبی یەکگرتوو. پانی و درێژیان لە نێوان ٧کم بۆ ١٢کم دایە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (جابر ابراهیم الراوي: الجزر العربية الثلاث و موقف القانون الدولي من احتلالها بالقوة، وزارة الثقافة والاعلام، بغداد، ١٩٨١، ص٤-٥)

١٠٢- برزان التكريتي: الصراع الدولي في منطقة الخليج العربي و المحيط الهندي و تأثيره على اقطار الخليج العربي، بغداد ١٩٨٢، ص٣٦٤

١٠٣- لە یەکەم راپرسی سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق ئەوانەی بۆ سەردەمی پێش رووخانی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی ئەگەر دەنگیان دابوبێت بۆ (تبعیە)ی ئێرانی، ئەوە عێراق بە بیانووی هاوڵاتی بوونی ئێرانیەوە رەگەزنامەی نەدانێ، زۆربەی هەرە زۆری کوردی فەیلی شیعە مەزهەب بوون، حکومەتی عێراق بەو کارەی ویستویەتی زیان لە کورد و ئێران بدات. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر چەمکی تەبەعیەی ئێرانی بڕوانە: (محەمەد هەمەوەندی: چەمکی تەبەعیەی ئێرانی لە سیستەمی یاسایی رەگەزنامە لە عێراقدا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٣) ی بەهاری ٢٠٠٢، ل٣٨-٤٨)

١٠٤- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٩١" دربة عوني: الاكراد، ط١، قاهرة ١٩٩٩، ص١٥٩" ماریون وبتر سلوجت: العراق الحديث من الثورة الى الدكتاتورية، قاهرة، ١٩٩٢، ص٢٢٧.

لەو باروودۆخەدا حکومەتی عێراقی پێویستی بە پاڵپشتی دەوڵەتانی عەرەبی هەبووە، بۆیە ویستویەتی داگیرکردنی ئەو سێ دوورگەیە لەلایەن ئێرانەوە بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی سەرنجی عەرەبەکان‌و بە تایبەت عەرەبەکانی کەنداو بەلای خۆیدا رابکێشێت هەتا بەرەیەك لە دژی ئێران دروست بکەن[105]

لە نیسانی ساڵی ١٩٧٢ حکومەتی عێراقی بە بەستنی پەیمانی هاریکاری‌و دۆستایەتی لەگەڵ سۆڤیەت‌و پێشتر خۆماڵی کردنی کۆمپانیاکانی نەوت لە یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١، ئەمریکاو ئێرانی لە خۆی ووروژاند[106]، ئەوانیش هاتنە ناو درزی ئەو ساردیەی، کە بە هۆی پێشێلکاریەکانی بەعسەوە لە نێوان کوردو حکومەت دروست بووبوو، لە بەرانبەر مەترسی خزینی سۆڤیەت بە ئاراستەی کەنداو، دەیانویست ئەمە بقۆزنەوە بۆ فشارخستنە سەر عێراق، مستەفا بارزانیش بێمتمانەیی بە شا بە هاتنی ئەمریکا بۆ ناو هاوکێشەکە سارێژکرد[107]

رووداوەکانی دواتر ئەوە بەدەردەخەن حکومەتی عێراقی لە هەوڵی ئەوەدا بووە هەموو هەنگاوەکانی ئێرانی بە ئاراستەی هەراسانکردنکردنی وڵاتاکەی بکاتە دەروازەیەك بۆ راکێشانی رای گشتی عەرەبی، لە بەرانبەردا ئێران نەیویستووە بە هۆی ناکۆکی لەگەڵ عێراقەوە پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی تێك بچێت، بەڵام وەکو بەدەردەکەوێ ئێران لەو هەنگاوە سەرکەوتوو بووە.

---

١٠٥- الراوي: الجزر العربية الثلاث، ص٥-٨

١٠٦-مەکداواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، و/ ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٥٤٤

١٠٧- تريب: صفحات من تأريخ، ص٢٨٢" فەرەیدون عەبدوڵڵا عەبدورەحیم: باروودۆخی سیاسی کوردستانی، ل٨٦

## باسی دووەم:

## بارودۆخی ناوخۆی عێراق و کوردستان پێش ڕێککەوتننامەی جەزائیر

وا بەدیاردەکەوێ بەیاننامەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ لە ئاکامی هەستی مرۆڤدۆستانەو قەناعەتی سەرکردایەتی بەعس نەبووە بە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی بۆ دەستەبەرکردنی ئازادیو پێکەوە ژیانی ئارەزوومەندانە، بەڵکو بەفشارە ناوخۆییو دەرەکییەکان ناچارکراوە بەو ڕێککەوتننامەیەی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)[١٠٨] وەکو بەیاننامە ڕایگەیاند. هەروەکو لازاریف دەنووسێت: ((هۆکاری سەرەکی لە ڕێککەوتننامەی ١٩٧٠ دوورخستنەوەی سەرکردایەتی کوردی

---

١٠٨- ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش: باڵادەسترین دەسەڵات بوو لە ڕژێمی بەعس لە عێراق، ژمارەی ئەندامەکانی لەو ئەنجومەنەی بە (١٢) ئەندام، بەڵام دروست لەوەیە ژمارەی ئەندامانی جێگیر نەبووە، بەپێی قسەکانی سەدام حوسێن دەستەیەکی شۆڕشگێڕە بۆ سەرکردایەتی بەعس، لە ڕووی دەستوورییەوە دەستەیەکی باڵای دەوڵەتە بۆ بواری ڕاپەڕاندنو یاسادانان) بڕوانە: (گۆڕینتەر دیشنەر: کورد گەلێکی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، ترجمة من الالمانیة الی العربیة/ عبدالسلام برواري، من العربیة الی الکردیة/ حەمە کەریم عارف، ، هەولێر،٢٠٠٤، ل٢٨٥" نص الکامل لوقائع المؤتمر الصحفي للهیب الرفیق صدام حسین الذي عقد بتاریخ ١٨ تموز ١٩٧٨" دیداری بەهائەدین نووری، لە سلێمانی، ڕۆژی ٢٠٠٦/٩/١٨.

بوو لە هەڵوێستی رابردووی، لە پەنابردنە بەر هێزو ناچارکردنی بە گفتوگۆ، هەتا بەعس دەرفەتی گونجاوی دەست بکەوێ جارێکی دیکە لە کورد بداتەوە))[109]

ئەوکات جوڵانەوەی شۆڕشی کوردستانی باشوور لە بەهێزیدا بوو، هەردوو باڵەکەی (پ.د.ك) لە رووی بنکەی جەماوەری بەرەو پێش چووبوون[110]، ئەوەی لەو ناوەدا بێهێز بووە حیزبی بەعس بووە، کە هێشتا دوو ساڵ نەدەبوو هاتبووە سەر حوکم و جێ پێی خۆی نەگرتبوو، بنکەی جەماوەری لاوازبوو، لە ناو بەرپرسە باڵاکانی سوپا ناکۆکی هەبوو، لە رووی ئابووریەوە لاواز بوو، پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ جیهانی دەرەوە کز بوو، پێویستی بە مانۆڕی سیاسی هەبوو، شۆڕشی کوردستانی بە مەترسی گەورە دادەناو لە بەرانبەردا پێویستی بە پشوودان و خۆڕێکخستنەوە هەبووە[111]، ئەمە بە ناتەواوی سەرکردایەتی کورد هەژمارکراوە، لەوکاتەش بەعس لە سەرەتای کودەتای ١٧ی تەموزی ١٩٦٨ دابوو، پێویستی بە شەڕ راگرتن و دانوسان هەبووە، ئەمەش لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە قبوڵ کراوە.

---

١٠٩- تأريخ كوردستان، ص٣١٠)

١١٠- ئەوکات پارتی بە سەر دوو باڵ دابەش ببوو، ئەو دابەش بوونەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٤، باڵی بارزانی خاوەنی هێزو توانی سەربازی باش بوو، هەتا ساڵی ١٩٦٦ ئەو باڵە پەیوەندی لەگەڵ حکومەت خۆش بوو، باڵەکەی دیکە دژی لەو پەیوەندییە بوون، لەو ساڵە بەدواوە باڵی دووەم پەیوەندی لەگەڵ حکومەت باش کردو گەڕایەوە بندەستی حکومەت، باڵی یەکەم کەوتە شەڕ دژی حکومەت، ئەم هاوکێشەیە هەتا بەهاری ساڵی١٩٧٠ مایەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص١٢٢-١٧١،١٤٤-١٧٥" نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٧٢-١٠١)

١١١-بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەیەوە بڕوانە: (حوسێن محمد عەزیز: کوردو هەلی مێژوویی، چ٢ سلێمانی ٢٠٠٠، ل٢٠٦-٢٠٨" شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوک، سیاسەتی تەعریب لە دووتوێی هەشتا بەڵگەنامەدا، سلێمانی ٢٠٠٤، ل٤٤)

وەکو بەدەردەکەوێ ئاگربەست و دەستکردن بە گفتوگۆ بە دەستپێشخەری حیزبی بەعس بووە، ئەویش سوودی لە ماوەی ئەو چوار ساڵەی نە شەڕ نە ئاشتیە بینی، کە بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی بەیاننامەکە، کە تەرخان کرابوو، وەکو سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن، لەو ماوەیەدا ناحەزانی لە ناو سوپا دەرکرد، بە چەکی سۆڤیەتی خۆی نوێکردەوە، بە خۆماڵیکردنی نەوت خۆی لە لاوازی ئابووری دەربازکرد[112]

بەیاننامەی ١١ی ئازار دوای زنجیرەیەك گفتوگۆ هات لە نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی هەتا دواجار لە نێوان مستەفا بارزانی و سەدام حوسێن جێگری سەرۆکی کۆمار وەکو ڕێککەوتننامەیەك واژۆکرا[113]. لەگەڵ ئەوەدا لە بەرانبەر خواستەکانی گەلی کورد و خەباتی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلانی دونیا ناتەواو بوو، بەڵام خاڵی ئەرێنی زۆری تێدابوو بۆ کورد، لە رووی سیاسیەوە لە مێژووی دەوڵەتی عێراق یەکەم دانانی بووە بە مافی کورد لە چوارچێوەی حوکمی زاتی[114]، هەر بۆیەشە لە هەموو شار و شارۆچەی کوردستان بە ئاهەنگ پێشوازی لەو هەنگاوە کرا، لە ئاستی عێراقیش دڵخۆشی هەموو لایەکی گرتەوە[115]

---

١١٢- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (فەرەیدون عەبدولڕەحیم عەبدوڵلا: باروودۆخی سیاسی کوردستانی، ل٢٣-٢٥" کاظم حبیب: لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، اربيل، ٢٠٠٥، ص٥٠٢-٥٠٤" شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوك، ل٢٦" نهیم عبدالله حمو، ریکەفتن ١١ی ئادارا ١٩٧٠، ل٢)

١١٣- کۆچێرا: بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد، و/ ئەکرەمی میهرداد، ب١، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٣٥٤-٣٥٧" وزارة الاعلام، مديرية الاعلام العامة، تنفيذ بيان ١١ اذار، بغداد ١٩٧٢، ص١٥-٢٦

١١٤- الحرصان: التيارات السياسية، ص١٨٢

١١٥- الحزب الديمقراطي الكردستاني: اللجنة التحضيرية، تقيم مسيرة الثورة الكردية و انهيارها والدروس و العبر المستخلصة منها، د. م، ١٩٩٧، ص٤٠

گرفتی رێککەوتننامەی ئازار جێبەجێ نەکردنیەتی. دەکرێ پوختەی پێشبینی لە سەر ئەوەی، کە بەعس لە ماوەی ئەو چوار ساڵە نەیویستووە بە یاننامەی ئازار جێبەجێ بکات لە چەند خاڵ کورت بکرێتەوە:

## یەکەم: ناوەڕۆکی بەیاننامەکەو مامەڵەی بەعس:

گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئەو هەوڵانەی بەعس بۆ زەمینەسازی گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی کوردو ناوبژیوانیو ڕێڕەوی کۆبوونەوەی دوو قۆڵی هەتا گەیشتنە ڕەشنووسی ڕێککەوتن بەدیاردەکەوێ، کە لە بەرئەنجامی گفتوگۆی دوولایەنەی چڕ بەیاننامەی ١١ی ئازار هاتۆتە بەرهەم[116]، کەچی بەعس وەکو دەستکەوتی خۆیو باوەڕی فیکریو مرۆڤدۆستانە بە ناوی (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بڵاوی کردەوە، حکومەت بە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی خۆیەوە بە پێشەکی خۆی بە ناوی (بەیاننامە)وە بڵاوی کردەوە[117]، ئەوانەی سەرنجو ڕەخنەی خۆیان لە سەر بەیاننامەی ١١ی ئازار نووسیوە زۆر کەم بە لای ئەو ڕەخنە بنەڕەتیەدا چوون، ئەم پیلانەش هەروا بە بێ هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد تێپەڕی، هەروەها چوار ساڵ بۆ ماوەی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیە زۆر بوو، سەرەڕای ئەوە حیزبی بەعس لە هەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی خۆیدا لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤، بە روونی ریسوایەتی بە دیاری بخات، کە بەیاننامەکە لە ئاکامی خەباتی چەند ساڵەی گەلی کوردەوە نەبووەو لایەنێك نەبووە بەعسی ناچار کردبێت مافەکانی گەلی کورد بسەلێنێت، بەڵکو بە تێڕوانینی مرۆڤدۆستانەی حیزبی بەعس خۆی بووە،

---

١١٦- شاكر خدو عو: المسألة الكردية في العراق للعاصر، ص٢٧١

١١٧- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (١)

شۆڕشی چەند ساڵەی کوردیشی بە پیلانی ئیمپریالیزمو زایونیزم ناساندووە، کە گەلی کوردیان بەکارهێناوە بۆ زیان گەیاندن بە ئوممەتی عەرەبی، سەرەڕای ئەوە لە زۆر شوێنی دیکەی ئەدەبیاتی بەعس ئەوە بەرچاو دەکەوێ، تەنانەت لە دەقی پێشەکی بەیاننامەی ئازاریشدا ئەمەی بە روونی دەرخستووە[118]، لە هەموو پێشەکی خاڵو بەندەکانی بەیاننامەکە بۆ ئەوەی نیشانی بدات لە سەر خاکی عەرەب مافی گەلی کوردیداوە وشەی (کوردستان) نەهاتووە، هەروەها هەر سێ مەسەلەی گرنگی سنووری ناوچەی ئۆتونۆمو دەسەڵاتی هەردوو ئەنجومەنی یاساداناو جێبەجێکردنو مەسەلەی بەشداری کورد لە دەسەڵاتی ناوەندی زۆر بە کورتیو بە دەقی نارۆشن هاتووە، کە شرۆڤەی جیا جیا هەڵدەگرێت[119]، سەرەڕای ئەوانە لە فیکری بەعس، پارتی پێشڕەوو سازش نەکردن لە رۆڵی میحوەریانە لە ئەدەبیاتیدا هەبووە، بۆیە هەرگیز نەیویستووە هێزی دیکە لە گەڵیدا هاوبەش بێت[120]

---

١١٨- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (التقرير السياسي الصادر عن المؤتمر القطري الثامن للحزب البعث العرب الاشتراكي. القطر العراقي. كانون الثاني ١٩٧٤، ثورة ١٧ تموز التجربة والافاق، ص٧٥" فاضل البراك: مصطفى البارزاني بين الاسطورة و الحقيقة، بغداد ١٩٨٩، ص١٩٢" وزارة العمل و الشئون الاجتماعية، لجنة في مؤسسة الثقافة العمالية، المسألة الكردية و الحكم الذاتي، بغداد ١٩٧٥، ص٧٥-٧٨، ١٢٣" بەلگەنامەی ژمارە (١))

١١٩- بۆ هەندێ لە کەموکورتیەکانی پێشەکیو دەقی بەیاننامەی ١١ی ئازار. بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خولەوەی کوردستانو، ل٢٦٨-٢٧٠" كندال: عصمت شريف وانلي، مصطفى نازدلر: كردها. ت/ابراهيم يونسي،، تهران، ١٣٧٢، ص١٩٢" مەلا بەختیار: کۆیەندی چەند بابەتێك، ١٩٨٣-١٩٩٣، ب ش، ١٩٩٩، ل٢١١" بەلگەنامەی (١))

١٢٠-بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (التقرير السياسي الصادر عن المؤتمر القطري الثامن لحزب البعث العرب الاشتراكي- القطر العراقي، كانون الثاني ١٩٧٤، ثورة ١٧ تموز التجربة والافاق، ص٧٥-٢١٥)

## دووەم: هەڵوێستی بەعس دوای مۆرکردنی بەیاننامەی ئازار:

هەڵوێستی حیزبی بەعس لە دوای واژۆکردنی بەیاننامەکە هەر زوو کوردی بەرەو بێتمانەیی برد چونکە:

- لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١و سەرەتای ساڵی ١٩٧٢ نزیکەی ٤٠ تا ٥٠ هەزار خێزانی کوردی فەیلی لە عێراق دەرکرد[١٢١]، سەرەڕای تاوانبارکردنیان بە دانیشتوانی ئێرانیو تابووری پێنجەمو دەستی تێکدەرو سیخوڕی بۆ ئێرانو ئەمریکا..هتد[١٢٢] حەردان تکریتی[١٢٣] ئاماژەی بەوە کردووە، کە بەعس بەو هەنگاوەی دوای بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ساڵی ١٩٣٧ نا، گوایە فشار لە سەر ئێران دروست بکات، لە لایەکی دیکەوە دەستی بە سەر ماڵو سامانیاندا گرت[١٢٤]. ئەو هەنگاوە بێباکی بووە لە بەرانبەر هەستی سەرکردایەتی کورد، پێی وابووە لە سەر هەردوو ئاستی ئێرانو ئاستی ناوخۆ لەو هەنگاوە سوودمەند دەبێت، بە تەنیا مەبەست دەرکردنی کوردە فەیلیەکان نەبووە، بەڵکو دانەنان بووە بە عێراقیبوونی ئەوان.

---

١٢١- سەرژمێری ورد لە بەر دەست دانیە لە بابەت ژمارەی کوردە فەیلیە دەرکراوەکانی ئەو ساڵە، بەڵام لە سەرچاوەی دیکە لەو ژمارە کەمتر نەهاتووە. بڕوانە: (جرجيس فتح الله: زيارة للماضي القريب، ص٥٢)

١٢٢- راپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، حوزەیرانی ١٩٨٢، سلسلة الكتب السياسية المترجمة (٧٢)، ص٥٥-٦٩

١٢٣- حەردان تکریتی: ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشو وەزیری بەرگری بووە، لە ساڵی ١٩٧٣ دوورخرایەوەو دواتر بەعسیەکان کوشتیان، پێش کوشتنی نامیلکەیەکی نووسیوە بە ناوی (باندێك دزو پیاوکوژ بووین لە پشت میلیشیا تیرۆریستەکانی سەدامەوە). لەوێدا هەندێ نهێنی کۆدەتای ١٧ی تەمووزو بەیاننامەی ١١ی ئازارو چەند بابەتێکی دیکەی ئاشکرا کردووە. بۆ زانیاری بڕوانە: (کتێبی ناوبراو، و/ ئاسۆ، بێ.ش، بێ.س، ل٣٢-٣٥، ٨٧-٨٨)

١٢٤-بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٥٣-٦٠.

دوای چوار مانگ (پ.د.ك) له كۆنگرەی هەشتەمینی خۆیدا لە تەموزی ۱۹۷۰ بە پێی ڕێككەوتن لەگەڵ بەعس دەبوایە جێگری سەرۆك كۆمار كورد بێت، سەركردایەتی كورد (حبیب محمد كريم)[۱۲۵] یان بۆ ئەو پۆستە دیاریكرد، بەڵام بە بیانوی ئەوەی كە كوردی فەیلیی و بە ڕەچەڵەك ئێرانی بووە، كە حكومەت پێی رازی نەبوو[۱۲۶]

- لە هەوڵی تیرۆركردنی مستەفا بارزانی لە هەردوو جاری یەكەم لە ۱۵ تەمووزو جاری دووەم لە ۲۹ ئەیلولو هەوڵدان بۆ تیرۆركردنی ئیدریس بارزانی كوڕی مستەفا بارزانی، دەركەوت حكومەتی عێراقی لە پشت ئەو كارانەوە بووە[۱۲۷]، لە كاتێكدا ڕۆژنامەی (برایەتی) زمانحاڵی (پ.د.ك) لە دوای دەربڕینی ناڕەزایی لە سەر ڕووداوی هەوڵی تیرۆركردنی بارزانی لە ۲۹/ئەیلول ۱۹۷۲ بۆ پاراستنی پرۆسەی ئاشتی كەسی تاوانبار نەكردووە، تاوانەكەی خستۆتە ئەستۆی ئیمپریالزمو دوژمنانی برایەتی كوردو عەرەب..[۱۲۸]، كەچی ئێردوە بێ متمانەیی و ناكۆكی لە نێوان بەعسو سەركردایەتی كورد دەستی پێكردووە.

---

۱۲۵- حەبیب موحەمەد كەریم: لە دایكبووی ۱۹۳۱ی پارێزگای واسە، كوردی فەیلیە، لە كۆنگرەی چواری (پ.د.ك)ەوە لە ئاستی بەرپرسیارێتی كاری كردووە، لە دوای جیابوونەوەی هەردوو باڵی ناكۆكی ناو (پ.د.ك) لە ساڵی ۱۹٦٤ كرایە سكرتێری مەكتەبی سیاسی. هەتا ڕێككەوتننامەی جەزائیری ساڵی ۱۹۷۵ لەو پۆستەدا مایەوە، دوای ئەوە وازی لە كاری سیاسی هێنار گەڕایەوە عێراق. بڕوانە: (حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني -العراقي (في المحطات رئيسية)، ۱۹٤٦-۱۹۹۳، دهوك، ۱۹۹۸)

۱۲٦-ئیبراهیم جەلال: خوارووی كوردستانو، ل۲۸۳-۲۸۷" مەكدواڵ: مێژووی هاوچەرخی كورد، ل٥٤١

۱۲۷-بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج۳/ ص۲٥۷-۲۷۳"ئازاد عوبێد ساڵح: كاریگەری شۆڕشی ئەیلول لە سەر ڕۆژنامەوانی كوردی ۱۹٦۱-۱۹۷٥، هەولێر، ۲۰۰۷، ل۱٥۹)

۱۲۸- بڕوانە: ڕۆژنامەی (برایەتی) زمانحاڵی، (پ.د.ك)، ژمارەكانی (۳، ٤) لە ۱/۱۰، ۱٤/۱۰ ۱۹۷۰

• دوای چوار هەفتە لە واژۆکردنی ڕێککەوتننامەکە هێرش کرایە سەر بارەگای (پ.د.ك) لە موسڵ[129]. لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٧١ حکومەت هێزێکی زۆری سوپای لە ناوچەی بارزان خڕکردەوە[130]، ئەمەش وەکو بەدەردەکەوێ بەشێك بووە لە پڕۆسەیەکی خۆئامادەکردنی سەربازی بۆ بنیاتنانەوەی دەسەڵاتێکی مەرکەزی لە سەر بنەڕەتی هێزو خۆسەپاندن بە سەر کوردستاندا.

• ڕووداوەکان ئەوە بەدەردەخەن، کە بەردەوام بوونی بەعس لە شاڵاوی بە زۆر کۆچ پێکردنی کوردانو بە عەرەبکردنی ناوچە هاوسنوورییەکانی کوردستان، مەترسییەکی دیکە بووە لە سەر پرۆسەی ئاشتەواییو کاڵکردنەوەی ناوەڕۆکی بەیاننامەی ١١ی ئازار.

لە ساڵی ١٩٧٢ حکومەت ژمارەیەك گەڕەکی شاری کەرکوکی بە عەرەبکرد، هانی دەربەگە عەرەبەکانیدا لە دەوروبەری کەرکوك زەوی بکڕن، لەو ساڵە سەدان خێزانی لە هۆزی "داودە" لە گوندەکانی دەوروبەری کەرکوك دەرکرد، (١١٨) کرێکاری کوردی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك دەرکردو لە جێی ئەوان کرێکاری عەرەبی دامەزراند، هەر لەو ساڵە بەعەرەبکردنی شەنگار دەستی پێکرد[131]. لە رووی یاساییەوە بەو هەنگاوە حکومەت ویستویەتی کۆنترۆڵی ئەو ناوچانە بکاتو لە کاتی راپرسی لە ئازادانەی خۆی بەکاری بهێنێ[132]

---

١٢٩- نورد فالستروم: ليس لنا من الاصدقاء غير الجبال، ت/عبدالاسلام نعمان، دهوك، ١٩٩٨، ص١٢٦

١٣٠- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٢٦٣

١٣١- خلیل ئیسماعیل محمد: سنووری عێراقو ئێران لە نێوان لە نێوان خواستەکانی گەلی کوردو ململانێ دەولی دا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژ(٤٥)، ساڵی ١٣، شوباتی ٢٠٠٥، ل٢٥

١٣٢- بۆ مەبەستی حکومەت لە تەعریب کردن لە پاڵ ئاشتەوایی. بڕوانە: (حەمەردان تکریتی: باندێك دزو پیاوکوژ بووین، ل٨٩)

## سێیەم: هەنگاونان بۆ خۆبەهێزکردنو خۆگرانکردن لە بەرانبەر سەرکردایەتی کورد:

لە ناتەواویەکانی دانوسانی نێوان سەرکردایەتی بزاڤی سیاسی کوردستانو سەرانی بەعس نەبوونی لێکۆڵینەوەی وردو هەمەلایەنە بووە لە سەر مەبەستو پیلانی بەعس. رۆژنامەوانی سویدی (فالستروم) ئاگادار بە رووداوەکانی ئەو کاتەی کوردستانی باشوور دەنووسێت: ((پێناسەی حیزبی بەعس لە بەرانبەر کورد روونە، هەروەها هەڵوێستی لە بابەت دیموکراتیەتو دابەشکردنی دەسەڵاتەکانو دەستێوەردان لە کاروباری حکومەت دیارە. بەعس لەو حیزبەیە لە زووەو ئێستاش سەرسەختترین دوژمنی کوردە، زۆر لە پسپۆرانی سیاسەتی دەرەوە لەو بروایەدان، بە راستی بەعس حیزبێکی ناسیونالیستی دەمارگیرە، بە شوێن دەمارگیری ناسیونالستی عەرەبیەوەیە، ئەو حیزبە بە رێگەی پیلانگێریەوە هاتووەو حیزبێکی دژە دیموکراتیە.. هەموو رێگەیەك دەگرێتەبەر بۆ مانەوەی لە دەسەلات...))[١٣٣]، هەروەها حەردان تکریتی دەنووسێت: ((..قوربانیانی سوپای عێراقی تا پێش چەند مانگی بەیاننامەی ئازار گەیشتە (٣٢٥) کوژراوو بریندار لە هەفتەیەکدا، هەروەها تەقەلاکانمان پێش دوو مانگ بۆ لە ناوبردنی بەرگری شکستی هێنا، بۆیە بریارماندا بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ و لەگەڵ مەلا وتووێژ بکەین، چونکە هەر بەوە دەمانتوانی دەرفەتێکی زیاتر بڕەخسێنین بۆ مانەوەمان لە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی، مەبەستمان لەم وتووێژە

١٣٣- لیس لنا الاصدقا.، ص١٢٦

لەگەڵ مەلادا ئەوە بووە، هەرچی بیەوێ بیدەینێ، بەو نیازەی لە ئەنجامدا بە سەریدا زاڵ بین...))[134]

ماوەی چوار ساڵ بۆ جێبەجێکردنی ناوەرۆکی بەیاننامەی ١١ی ئادار دەرفەت بووە بۆ خۆ بەهێزکردنەوەی دەسەڵاتی بەعس بە سەر هەموو داموو دەزگاکانی حکومەتدا[135] لە ماوەی ئەو چوار ساڵە دیاریکردنی سنووری هەرێمی ئۆتۆنۆمو دەسەڵاتی دامەزراوەکانی یاساداناںو راپەڕاندن لە کوردستانو بەشداری کورد لە دەسەڵاتی ناوەند لە بەغدا لە گرفتە سەرەکیەکانی نێوان هەردولا بووە[136]، بۆیە وەکو بەدەردەکەوێ لەو ماوەیەدا بەعس توانیویەتی شوێنی خۆی قایم بکاتو پەشیمان بێتەوە.

هەر لە سەرەتاوە بەیانی ١١ی ئازار چارەسەری کێشەی سنووری نەکرد بوو، ئەمەش خاڵێکی دیکەی ناتەواویەکانی ئەو رێککەوتنە بووە، کە بە زۆری بەو هۆیەوە نووشستی هێنا[137]، هەروەها چارەنووسی کەرکوکو ژمارەیەك شارو شارۆچکەی دیکەی بە هەڵپەسێردراوی هێشتبۆوە[138]، لە ناو مەسەلەی دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆم یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی شاری کەرکوك لە مەسەلە بنەڕەتیەکان بوو، سەرکردایەتی کورد وای دانابوو هەموو ئەو ناوچانەی لە رووی مێژووییەوە هی

---

١٣٤-احمد سەلام: نووشستیەکەی شۆڕشی ئەیلول لە کتێبی: مومتاز حەیدەری، ئەژاد عەزیز سورمێ، کونگرەی ٩٠ ساڵەی بارزانی نەمر، کوردستان، ١٩٩٧، ل١٧٢" حردان تکریتی: باندێك دزو پیاوکوژ بووین، ل٨٦

١٣٥-کۆچێرا: بزوتنەوەی سەربەخۆیی کورد، ل٣٥" مەلا بەختیار: کۆبەندی چەند بابەتێك، ل٢١٤

١٣٦- مصطفی طیبة: الجبهة الوطنیة في العراق، مجلة، کاتب، ع١٤٣، السنة الثالثة، فرایر ١٩٧٣، ص٢١

١٣٧- ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل١٥٩

١٣٨- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٢٩٠

کوردستانی بخرێتەوە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆم، لە ناویشیاندا کەرکوك، بەڵام حکومەت ئەمەی بە توندی رەتکردەوە[139]، لە بەیانی ١١ی ئادار بڕیار درابوو دوای ساڵێك لە بەیاننامەی ئۆتۆنۆمی سەرژمێری وردی دانیشتوان بۆ ناوچە جێناکۆکەکان بکرێت[140]، بەڵام دراکەوت و ئەنجام نەدرا، بەپێچەوانەوە حکومەت کەوتە سیاسەتی بەعەرەبکردن.

دووەم گرفتی گەورەی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی مەسەلەی هاوبەشی کورد بوو لە دەسەڵاتی ناوەند لە بەغدا، ئەگەر چارەسەری یاسایی بۆ بەشداری کورد لە دەسەڵاتی ناوەند لە سەرەتاوە یەکلایی نەکرابێتەوە، ئەوە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ناتەواوی ئەو رێککەوتننامەیەو لەوەی سەرکردایەتی کورد بانگەشەی بۆ دەکرد لە پاڵ مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دیموکراتیەت بۆ عێراق[141]. ئەگەر دەسەڵات لە بەغدا دیموکراتی نەبێت ئەوە گرەنتی نابێ بۆ پەشیمان بوونەوەی ئەو بەڵێنانەی کە بە سەرکردایەتی کورد دەدرێت.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە سەرووی هەموو دەسەڵاتەکانەوە بوو، نووسەری ئەڵمانی دەنووسێت: ((لە کۆی ١٢ ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕش، کە سەرچاوەی یاسادانان بوون تەنیا کوردێکی تێدا نییە))[142]، کەچی لە خاڵی دووی

---

١٣٩- زیرارە چالیارەو ئەوانی تر: گەلێکی بەژمۆدەم نیشتیمانی پەرت، و/کۆمەیی و ا. حەوزی، سوید، ١٩٨٨ ل٢٩٧-٢٩٨.

١٤٠- ئازاد عوبێد ساڵح: کاریگەری شۆڕشی ئەیلول، ل١٦٩-١٧١" دزەیی: أحداث عاصرتها، ل١٩٩

١٤١- مەلا بەختیار: کۆبەندی چەند بابەتێك، ل٢١٢" دەربارەی چۆنیەتی سازشی سەرکردایەتی لە ١١ی ئازار لە سەر دیموکراتیەت بۆ عێراق بڕوانە: (جرجیس فتح الله: زيارة للماضي القريب، ص٥٠-٥١)

١٤٢- گۆیتەر: کورد گەلێکی، ل٢٨٥" نص الكامل لوقائع للؤتمر الصحفي المهيب الرفيق صدام حسين، الذي عقد بتأريخ ١٨ تموز ١٩٧٨، ص١٦

ناوەڕۆکی بەیاننامەی ئاداردا نووسراوە: ((جیاوازی ناکرێت لە نێوان کوردو غەیری کورد لە پایە گرنگو هەستیارەکانی دەوڵەت، وەکو وەزارەتەکانو سوپا.هتد))[143]، ئەوە بەرچاو ناکەوێ، کە سەرکردایەتی کورد لە سەرەتاوە ئەو پرسی پێگەی کوردی لە ئەنجومەنە یەکلاییکردبێتەوە.

دواتر وەکو بەدەرکەوت دەسەڵاتە گرنگو هەستیارەکان نەدران بە کورد. لەوبارەیەوە گۆزینتەر دەنووسێ: ((...لە هەموو فەوجەکانی سوپا تەنها دوو کورد هەیە، لە کۆی ٥٠٠ دیبلوماسیو ٨٠ باڵوێزی عێراقی تەنیا یەك باڵوێزی کورد هەیە. لە کۆی ٢٣ وەزیری ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی تەنها (٥) وەزیر بۆ کوردن، ئەویش دوانیان وەزیری بێ وەزارەتن، کورد هیچ وەزارەتی سەرەکیان بە دەستەوە نییە...))[144]، هەروەها مەحمود عوسمان لەگەڵ رادیۆی بەریتانیدا دەڵێ: ((لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی کەسمان نییە، لە سوپا کەسمان نییە، لە ناوەندە گرنگەکانو هەروەها لە دەزگای ئاسایشو هەواڵگری نیمانە، لە وەزارەتی نەوتو وەزارەتی ناوخۆو دەرەوە کەسمان نییە. لە راستیدا لە پایە گرنگەکاندا کورد هیچ رۆڵی نییە، لە پایە گرنگەکانی دەرەوەو ناوەوە هەموو شتێك لە رێگەی حیزبی بەعسەوە دەبێت، تەنها لە سەر ئاستی کارگێری هاوبەشین.))[145]، لە راستیدا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ رێککەوتنی ١١ی ئازار، ئەمە لە کاتێکدا رەخنەگر لە دانوسانەکان هاوبەش بووە، ئەمە جێی پرسیارە، دەبێتە خاڵێك لە جومگە لاوازەکان لەبەرانبەر ئەو بەرپرسیاریەتیە، وەکو بەدەردەکەوێ لەگەڵ

---

١٤٣- بەڵگەنامەی ژمارە (١)

١٤٤- کورد گەلێکی، ل٢٨٥

١٤٥- ماریون وبتر سلوجت: العراق الحدیث من الثورة الی الدکتاتوریة، القاهرة، ١٩٩٢، ص٢٣٦

سەرەتای واژۆکردنی ڕێککەوتننامەکە ئەو نیگەرانییە ئابینریو ساڵانی دواتر بە دەرنگەوە سەرکردەکانی شۆڕش ئەو خاڵە لاوازانەیان باس کردووە.

بە درێژایی ماوەی چوار ساڵ لە سەر هەردوو ئەنجومەنی یاساداناو راپەڕاندن لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی نەگەیشتنە ئاکام، هەتا لە دوا کۆبوونەوەی نێوان وەفدی سەرکردایەتی کوردو سەرکردایەتی بەعس بە راشکاوی بەعس پرۆژەی خۆیان لە بابەت ئەو مەسەلەیەوە خستە بەردەم سەرکردایەتی کورد، لەوێدا سەرەرای دابڕینی کەرکوک و ناوچەکانی ژەنگارو خانەقین و مەندەلی لە ناوچەی ئۆتۆنۆم، لەجیاتی کەرکوک هەولێریان کردبوو بە پایتەختی هەرێمی ئۆتۆنۆمی و کوردیش کرابووە لە پارێزگای هەولێرو سلێمانیو دهۆک.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ۱۱ ئاداری ۱۹۷٤ یاسای ئۆتۆنۆمی پەسندکرد، لەوێدا دەسەڵاتێك نەمابووە بۆ کورد لە چوارچێوەی ئەو دوو دامەزراوەدا موماریەسەی دەسەڵاتی خۆی تێدا بکات. هەموو بەڕێوەبەرایەتیە گرنگەکانی پۆلیس و ئاسایش و رەگەزنامەو .. هتد راستەوخۆ خرابوونە سەر وەزارەتە پەیوەندیدارەکان لە بەغدا، دەسەڵاتی پێویست نەدرابوو بە ئەنجومەنی یاساداناو جێبەجێکردن، سەرەرای ئەوانە لە خاڵی (أ) ی مادەی (۲۰) یاسای ئۆتۆنۆمیدا هاتووە، کە سەرۆك کۆمار لە حاڵەتی وازهێنانی نیوەی ئەندامان یان دواکەوتنیان زیاتر لە مانگێك دوای داواکردنیان بۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنی یاسادانان دەتوانێ هەڵیبوەشێنێتەوە، یان لە خاڵی (د) لە مادەی ۱۳ کە ئەو خاڵەش چەند مەرجێکی کراوەی داوەتە دەست سەرۆك کۆمار بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئەنجومەنە. لەو بارەیەوە (تریب) دەنووسێ: ((سەرۆك کۆماری عێراق هەموو دەسەڵاتێکی هەبووە، سەرۆکی ئەو دەستەیە "مەبەست لە ئەنجومەنی یاسادانانە" دیاری دەکات، ئەگەر ویستی دەتوانێت لای ببات، حکومەتی

بەغدا دەسەڵاتی کاروباری دەرەوەو بەرگری‌و ئاسایش‌و هەروەها نەوت‌و ئاوخۆی لە ژێر دەستی خۆیدا بووە، بێجگە لەوەش نزیکەی سێیەکی ناوچە کوردیە گرنگەکانی عێراق بە کانە نەوتیەکانی کەرکوکیشەوە لە سنووری دەسەڵاتی ناوەند دا بووە))[146]

لە بەرانبەر ئەو پرۆژەیە (م.س)ی (پ.د.ك) پرۆژەیەکی دیکەی بۆ هەمان مەبەست لە ١٧ی ئازاری ١٩٧٤ خستە بەردەم سەرکردایەتی بەعس، بەڵام ئەوان بە نامەیەکی دوورو درێژی سەرۆك کۆمار رەفزیان کرد[147]، ئاکام هەردوولا لە سەر شێوەی دامەزراوە کارگێریەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆم نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك.

بە پێی ئاماژەی سەرچاوەیەك دەکرێ کۆی ئەو کێشە بنەڕەتیانەی کۆسپ بوون لەبەردەم حکومەتی عێراقی‌و سەرکردایەتی کورد کورت بکەینەوە لە دیاریکردنی سنووری ئۆتۆنۆمی بە کێشەی کەرکوکیشەوە، لەگەڵ چارەنووسی (پ.م)و نهێنی پەیوەندی شۆڕشی کورد لەگەڵ ئێران‌و نەچوونی (پ.د.ك) بۆ ناو بەرە لەگەڵ (حشع)و حیزبی بەعس[148]، بەڵام وەکو بەدەردەکەوێ دەسەڵاتی دامەزراوەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌و بەشداری کورد لە پێگە باڵاکانی دەسەڵات لە بەغداش لە گیروگرفتە گەورەکان بووە.

لە سەر ئاستی ناوخۆش ناتەواویەکان کەم نەبوون، کە نابێت خۆ لە هەڵسەنگاندنێکی گشتی ببوێرین لەبەرانبەر سەرکردایەتی کورد لە هەمبەری ئەو قۆناغە، کە هەتا نەتوانراوە خاڵە لاوازەکانی بشاردرێتەوە[149]، لە دوای ڕاگەیاندنی

---

١٤٦- صفحات من تأريخ، ص٢٨٢

١٤٧- بۆ دەقی هەردوو پرۆژەکە بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٦٤٠-٦٧٩)

١٤٨- د. فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، ل٣٥٦

١٤٩- خەمساردی سەرکردایەتی لە بابەت یەکلایی نەکردنەوەی هەندێ کێشەی گرنگ لە میانی گفتۆگان، لە سەر چەند پۆستێکی حکومی ناکۆکی‌و ناڕێکی سەرکردایەتی. بڕوانە: (جرجيس فتح الله:

بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ڕێزەکانی سەرکردایەتی کوردو بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان لە ساڵانی پێش خۆی پتەوتر بوو، لەگەڵ ئەو ناکۆکیە ئایدۆلۆژیەی پێشتر هەبوو، بەلام بۆ مەیدانی بەرەنگاری و خەباتی چەکداری مستەفا بارزانی بێ رکەبەر بووە، تەنانەت پشتگیری ئەوانەشی لەگەڵ بووە، کە گومانیان لە سەرکردایەتیەکەی هەبووە[١٥٠]

ساڵانی ١٩٧٠- ١٩٧٥ هەموو لایەنەکانی بەشدار لەو ململانێیە لە (حکومەتی عێراق و یلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سۆڤیەت، ئێران) لە بەخۆداچوونەوەی وردو گەرمو گوڕدا بوون، هەتا خۆساز بدەنەوە لە جەولەی ئاییندە بە باشترین دەستکەوت کۆتایی بەو سیناریۆیە بێ، کە لە گەرموگوڕکردنەوەی ناوکۆکیەکانی حکومەتی عێراق و شۆڕشی کوردستاندا خۆی دەدیتەوە، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە حکومەت لەو ماوەیەدا ئەفسەرو پلەدارانەی بە بیانووی ئەوەی دەستەکەی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسێن لێ یان بەگومانن لە سێدارەدا[١٥١]، ئەوەی دەمێنێتەوە سەرکردایەتی کورد بووە، کە لە سەرچاوەکان بە کەمتەرخەم باسی دەکرێ.

---

زیارة للماضي القريب، ص٥٦-٥٧" راپۆرتی سیاسی و عەسکەری و تەنزیمی سەرۆکی پارتی (بارزانی) بۆ کۆنگرەی نۆیەمی (پ.د.ك) لە سەرەتای تشرینی دووەم ١٩٧٩. لە کتێبی حبیب محمد کریم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص٣٧٢)

١٥٠- ماریون ویتر سلوجت: العراق الحديث من الثورة، ص٢٢٨

١٥١- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٢٨٥-٢٨٦" تريب: صفحات من تأريخ، ص٢٧٩" توره فاکستوم: ليس لنا من الاصدقاء غير الجبال، ص١٢٨-١٢٩

لە دوای خۆماڵیکردنی نەوت، نرخی فرۆشتنی نەوت بۆ عێراق زیادی کرد، بەهای دیناری عێراقی بەرزبۆوە، بەمەش عێراق لە قەیرانی ئابووری رزگاری بوو[152]، دیارە ئەو هەنگاوەش کاریگەری هەبووە بە سەر بایەخی ناوچە نەوتیەکان، بۆیە پەیوەندیەکانی نێوان کوردو عێراق ئاڵۆزبوو، هەر لەو ماوەیەدا بە هۆی هاوپەیمانیەتی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتو بلۆکی رۆژهەلات گرێبەستی کڕین و هێنانی چەکی واژۆکرد، عێراقی بەعس بە تەواوی لە رووی سەربازیەو بەرگریەوە خۆی بەهێز کرد.

بەعس بە هۆی هاوپەیمانیەتی سۆڤیەتو بەهێزکردنی پێگەی خۆی، لە ١٥ی ئاياری ١٩٧٢ دوو وەزیری دایە (حیزبی شیوعی عێراق- حشع)، بەمەش هەڵوێستی ئەو حیزبە گۆڕا[153]. دوایی (حشع) راکێشایە ناو بەرەیەکی ناهاوسەنگ، یەکیەتی سۆڤیەتیش هانی (حشع)داوە بەرە لەگەڵ بەعس دروست بکەن[154] بە ناوی: (بەرەی نیشتیمانیو نەتەوەیی پێشکەوتووخواز) کە لە١٧/ ٧/ ١٩٧٣ راگەیەنرا، داوا لە (پ.د.ك) کرا بێتە ناو ئەو بەرەیەوە، بەلام بەهۆی کەمتەرخەمی حیزبی بەعس لە

---

١٥٢گرفتی کوردو حکومەتی عێراق لە سەر کەرکوك دوای خۆماڵیکردنی نەوت زەقتر بووەوە، لەمەش بە هۆی چڕبوونەوەی پرۆسەی بە عەرەبکردن، لە لایەکی دیکەوە رۆژنامەی برایەتی بە زنجیرە وتاریك بە ناوی (سەرکەوتنی گەلی عێراق دژی کۆمپانیانی نەوت بەری رەنجی یەکیەتی ریزەکانی گەلە) لەگەڵ کۆمەڵێك بروسکەی پیرۆزبایی، ئەحمەد حەسەن بەکری بە ئەندازیاری خۆماڵکردنی نەوتو ئەو هەنگاوەی بە شەڕی دژی ئیمپریالزم ناساندووە. بڕوانە: (رۆژنامەی برایەتی، ژ ٦/٢/١٩٧٢، ژ٣ی ٩/٦/١٩٧٢ خولی چوارەم)

١٥٣- فەرەیدوون عەبدوڵلا: باروودۆخی سیاسی کوردستان، ل٧٥

١٥٤- لازاریف: تأریخ کوردستان، ص-٣١٠" دیداری بەرێز بەهائەدین نوری. رۆژی ١٨/٩/٢٠٠٦، سلێمانی.

جیبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار قبوڵی نەکرد بچێتە ناو ئەو بەرەوەیە[١٥٥]، بەعس لەوەدا مەبەستی بوو خۆی وەکو حیزبێکی پێشکەوتووخوازو گونجاو لەگەڵ ڕووداوەکان بخاتەڕوو[١٥٦]، لەلایەکی دیکەوە بەعس هەموو قورسایی باڵادەستی خۆی لە ناو بەرە بەرجەستە کردبوو، بەڵام (حشع) ئەمەی قبوڵ بوو[١٥٧]

لەبەرانبەردا لە ساڵانی ١٩٧٠- ١٩٧٤ دەرفەت بۆ سەرکردایەتی (پ، د.ك) ڕەخسابوو. باڵی (م.س) لەگەڵ ڕاگەیاندنی بەیاننامەکە پەیوەندیان لە سەرکردایەتی بارزانی‌و سەرۆك کۆماری عێراق کرد، لە کۆنگرەیەکی تایبەتدا ناوی خۆیان لە (پ د.ك) باڵی مەکتەبی سیاسیەوە گۆڕی بۆ (پارتی شۆڕشگێری کوردستان)و دوایی بەو ناوەوە خۆیان هەڵوەشاندەوەو زۆربەی ئەندامانی (م.س)و سەرکردایەتی‌و کادیرو پێشمەرگەکانیان گەڕانەوە ناو (پ.د.ك)، بەڵام وەکو سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن (پ.د.ك) سوودی لە توانای زۆربەی ئەوانە وەرنەگرت[١٥٨]، ئەمە دەرفەتێکی زێڕین بوو، بۆ (پ.د.ك) سوود لە وزەی توانای ئەوانەو ئەو دەرفەتە سیاسیە وەربگری.

هەر لە میانەی ئەو چوار ساڵەی ئەشەڕو نە ئاشتی دەرفەتێکی لەبار ڕەخسابوو بۆ چاکسازی ژیانی جوتیاران‌و بە تەنگەوەچوونی کێشەو گیروگرفتەکانی خەڵکی لادێ،

١٥٤-شاكر خصو بحوي: المسألة الكردية في العراق المعاصر، ص٢٧٧

١٥٦- مصطفى طيبة: الجبهة الوطنية في العراق.

١٥٧- بۆ زانیاری زیاتربڕوانە: (جرجيس فتح الله: زيارة للماضي القريب، ص٧٢-٧٣)

١٥٨- گێڕانەوەی جیا هەیە بۆ ئەو بابەتە، لای باڵی مەکتەبی سیاسی پێش هەڵوەشانەوە لەگەڵ باڵەکەی دیکە ڕێککەوتنیان هەبووە لە کۆنگرەی داهاتوو ڕێژەیەك بۆ ئەوان بێت، لایەنەکەی دیکە بە پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەی بێمەرجی داناوە. بۆ زانیاری زیاتر. بڕوانە: (البارزاني: البارزاني والحركة، ج٣/ص٢٣٧-٢٣٨، نەوشیروان: پەنجەکان، ل١٠٠-١٠١" دیداری قادر عەزیز، ا ٧/٩/٢٠٠٦، لە سلێمانی)

لەگەڵ هەڵبژاردنی دیموکراتیانەی ئەنجومەنی لادێیەکانو زۆر شتی دیکەش، بەڵام کاروباری لادێیەکان هەر بە دەستی کوێخاو پیاوە کۆنەکان مابۆوە، تەنانەت بۆ پاراستنی بەرژەوەندی دەرەبەگو خاوەن زەوییەکان سەرکردایەتی شۆڕش لە سەر حیسابی جوتیاران کەوتە دژایەتی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ"[159]

حکومەتی عێراقی هەندێ لە خاڵەکانی جێبەجێ کرد، وەکو: لێبوردنی گشتی بۆ زیندانە سیاسییەکان، گەڕانەوەی کارمەندانی کورد بۆ فەرمانگەکانی خۆیان، هەندێ لە پۆستە کارگێڕیەکانی دا بە کورد"[160]، ئازادی کاروچاکی بۆ (پ د ك)و دووبارە رۆژنامەی (التآخي) لە بەغدا دەرچۆوە"[161]، ئەندازەی ۲۰ ملیۆن دیناری تەرخانکرا بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، بەڵام خاڵە بنەڕەتییەکان وەکو سەرژمێری دانیشتوانو چارەنووسی ناوچە نەوتیەکان وەکو خۆی مایەوە"[162]

---

۱۵۹-پارتی دیموکراتی کوردستان رێبازی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد، راپۆرتی سیاسی سەرکردایەتی کانی پارتی دیموکراتی کوردستان، پەسندکراوی کۆنفراسی (۱۱- ۱۵) ئابی ۱۹۷٦" الحزب الديمقراطي الكردستاني- اللجنة التحضيرية، تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص۲۸-۳۹

۱٦۰- هەریەك لە عەلی عەبدوڵلاو عەبدولوەهاب ئەترۆشیو هاشم ئاکرەیی کرابوونە پارێزگاری سلێمانیو هەولێرو دهۆك بڕوانە: (وزارة الاعلام، مديرية الاعلام العامة، تنفيذ- بيان ۱۱ آذار، بغداد ۱۹۷۲، ص٦۰)

۱٦۱- ئازاد عوبێد سالح: کاریگەری شۆڕشی ئەیلول، ل۱۷۹-۱۸۰ بۆ زیاتر زانیاری لە سەر دەستکەوتە رۆشنبیریەکانی رێککەوتننامەی ۱۱ی ئازار بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل۱۷۹-۲۱٦

۱٦۲-کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل۳٤

لە ١٩٧٢/٩/٢٣ حكومەت بە ناوی سەرکردایەتی هەرێمایەتی بەعس[١٦٣]، یاداشتێکی دوورو درێژی ئاراستەی کۆمیتەی ناوەندی (پ.د.ك) کرد، لەوێدا بە درێژی باس لە هەندێ دەستکەوتی فەرهەنگیو خزمەتگوزاریو سیاسی کراوە بۆ کوردستان، لەگەڵ ئەو کارانەی، کە پێویستە ئەنجام بدرێ، لە وەڵامی یاداشتەکەی بەعس مەکتەبی سیاسی (پ.د.ك)یش لە نامەیەکی دوورو درێژیدا وەڵامی یاداشتەکەی سەرکردایەتی هەرێمایەتی بەعسی داوەتەوە. لەوێدا سەرەڕای ئەو دەستکەوتانەی بەدیهاتوون لەگەڵ خاڵە جەوهەریەکانی لە سەری ناکۆکن یان بەعس ئامادە نییە جێبەجێیان بکات، لە سەر ناکۆکی نێوان سەرکردایەتی کوردو بەعس، لەو سەرنجانەی سەرەوەو زۆر سەرنجو تێبینی دیکە لەو یاداشتانەدا وەردەگیرێ، بەعس لە دوای خۆماڵیکردنی نەوتو هاریکاری بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی سۆشیالیستی سەرکردایەتی پارتی بە دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ ئێرانو سوریا تاوانبار دەکات[١٦٤]، بە شێوەیەك هەتا ئەرکاتەش لە پاڵ پێشێلکاریەکان بەعس ڕستویەتی ئەوە بەدیارخات، کە بە ئاراستەی جێبەجێکردنی بەیاننامەی ئازار هەنگاوی ناوە، هەر لە کۆتایی ئەو مانگە هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی درا[١٦٥]، بەڵام ڕووداوەکانی لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٢ هەتا دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ئازاری ١٩٧٤ ئەوە ئاشکرا دەکەن، کە ئومێدێك لە هەنگاوەکانی بەعس نابینرێت، لەبەرانبەریشدا سەرکردایەتی کورد هیچ

---

١٦٣- حیزبی بەعس ڕستوریەتی هەموو عەرەب لە بەعسیبووندا کۆیکاتەوە، لە هەموو وڵاتێکی عەرەبی سەرکردایەتی هەرێمایەتی هەبووە "سەرکردایەتی نەتەوەیی" پێکیان دەبەستەوە، بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: (ئەلیوت عیسا: خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لە سەر بەعسی عێراقی، سلێمانی ٢٠٠٤، ل٩١-٩٥)

١٦٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خواروری کوردستانو، ل٢٩٤-٣٤٩)

١٦٥- د. فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، ل٣٥٨

رێوشوێنێکی کردەیی نەگرتبووەبەر، هیچ هەڵوێستێك لە ئارادا نەبووە بەرانبەر کۆتایی هێنان بە ئاگربەست، چاوەڕوانی کردووە وەکو چۆن بەعس لە کاتی پێویست شەڕی راگرت هەر ئەویش لە کاتی پێویست شەڕ دەست پێ بکاتەوە.

لە سەرەتای ئاداری ساڵی ۱۹۷٤ بەعس سەرکردایەتی (پ.د.ك)ی بانگهێشت کردە بەغدا بۆ گفتوگۆ، وەفدی کوردی لەگەڵ صدام حوسێن بە سەرۆکایەتی ئیدریس بارزانی لە۸/۳/ ۱۹۷٤ کۆبوونەوە، لەوێدا کێشەی سنووری کەرکوك لە خاڵە هەرە ناکۆکەکانی کۆبوونەوەکە بوون[166]، لەو کۆبوونەوەیەدا بەعس پرۆژەی بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئامادەکردبوو، لەوێدا کەرکوك لە سنووری دەسەڵاتی ناوەندا دەبێت[167]، ئامادەش نەبووە سازش لە سەر ئەو پرۆژەیە بکات، وەفدی کوردی گەڕایەوە کوردستان هەتا راوێژ لە سەر دوا هەڵوێستی بەعس بکەن، ئاکام سەرکردایەتی (پ.د.ك) بەو پرۆژەیە رازی نابێت و پرۆژەیەکی جێگرەوە ئامادەکرد، کە بەعس پێی رازی نەبوو، بەڵام حکومەت بە پەسندکراوی (ئەنجومەنی سەرکرایەتی شۆڕش) لە ۱۱/۳/ ۱۹۷٤ پرۆژەکەی خۆی بڵاوکردەوە[168]، حکومەت بۆ شەرعیەتپێدان دەیخاتە بەردەم بەرەی نیشتیمانی و نەتەوەیی پێشکەوتووخواز، کە بەهانەدین نوری لە بیرەوەریەکانیدا دەنووسێت: ((سەرەڕای پڕۆپاگەندەی سەرکردایەتی حشع، کە لە داڕشتنی ئەو یاسایە[169] بەشداربووبن، بەڵام کاریگەری ئێمە لە سەر ئەو مەسەلەیە زۆر کەم بوو))[170]

---

۱٦٦- دانشنجوان پیرو امام: اسناد لانە جاسوسی – کوردستان (۲)، شمارە (۳۲)، ل٥٧.

۱٦٧-- بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەوە بڕوانە: (جرجیس فتح الله: زیارة للماضي القریب، ص٥٧)

۱٦٨- البارزاني: البارزاني و الحرکة، ج۳/ ص۲۹٤- ۲۹۷

۱٦۹- مەبەست لە (پرۆژەی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان)ە

۱۷۰- مذکرات، اربیل ۱۹۹٥، ص۳۲۱

له سەرەتای نیسانی ساڵی ١٩٧٤ بە رەسمی شەڕ لە کوردستان لە ئاکامی هێرشی سوپای بەعس دەستی پێکردەوە. لە شەش مانگی یەکەمی هەڵگیرسانەوەی شەڕ هەڵوێستی ئارخۆی بەعس و شۆڕش بەم شێوە بووە:

یەکەم: بەعس شاڵاوێکی گەورەی سەربازی لە ناوچەکانی بادینانەوە دژی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەست پێکرد، لە سەرەتاوە بەرگری کرا، بەڵام دوایی هێزەکانی حکومەت توانیان ناوچەکانی شێخان و دهۆک و زاخۆ دەستبەسەردابگرن، لە ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی شەڕ دەستی پێکرد، حکومەت لە٢٤/٤/١٩٧٤، شاری قەڵادزی بۆردومان کرد، لە ٢٨/٤/١٩٧٤ شاری هەڵەبجەی بۆردومان کرد[١٧١]. هەر لە شەش مانگی یەکەم بەشێکی زۆری ناوچەکانی پارێزگای هەولێر و سلێمانی و دهۆک کەوتنە ژێردەسەڵاتی سوپای عێراق، هێزی پێشمەرگە پاڵیاندا بە ناوچە شاخاوییەکان، وای لێهات بە درێژایی سنووری شاخاوی هاوبەش لەگەڵ ئێران و تورکیا لە ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەدا مابوونەوە، بە شێوەیەک کۆنترۆڵکردنی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە ئەستەم بووە.

دووەم: حکومەت لەو شەڕانەدا پشتی بە فڕۆکەی سۆڤیەتی دەبەست، لە بەرانبەردا ئێران پشتگیری شۆڕشی کوردستان بووە[١٧٢]، شەڕی بەرەیی بەرفراوان سنوورەکەی لە بادینانەوە هەتا دەگاتە شارەزوور بووە، سوپای عێراق لەو قۆناغە تەنیا توانی دەست بە سەر دەشتەکان و شارە سەرەکییەکاندا بگرێت و نەیتوانی دەستبگرێ بە سەر ناوچە شاخاوییەکان، بەمە سوپای عێراقی ماندوو بوو، ناچاربوو حکومەت داوای موالیدی

---

١٧١- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا، ل٢٩٢-٢٩٣

١٧٢-فاضل رسول: العراق – ایران، ص٢٨" کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا، ل ٢٩٤

تازە بکات[١٧٣] ، کە پێدەچێ لەو ماوەیەدا هاوکێشەی هێز لە بەرژەوەندی حکومەتی ناوەندا نەبێ.

سێیەم: لەو ماوەیەدا شۆڕشی کوردستان خاوەنی (٥٠٠٠٠) پێشمەرگە بووە، سەرەڕای خۆبەخشکارانی میللی[١٧٤] ، هیچ شۆڕشێکی کورد لە هەردوو سەدەی نۆزدەو بیست هێندەی شەڕی یەك ساڵە واتە لە بەهاری ١٩٧٤ بۆ بەهاری ١٩٧٥ پشتگیری جەماوەری کوردستانی لەگەڵ نەبووە، زانکۆی سلێمانیو هەردوو پەیمانگای هەولێرو دهۆك بە زۆرینەی زۆری بە مامۆستاو خوێندکارو کارمەندەوە روویان لە ناوچە ئازادکراوەکان کرد. زانکۆی سلێمانیان گواستەوە قەڵادزە، ئەمە سەرەڕای گواستنەوەی زۆربەی هەرەزۆری مامۆستاو پۆلیسو ئەندازیارو پزیشكو پارێزەرە کوردەکان[١٧٥] . هەتا کەمایەتیەکانی دیکەی کوردستانیش لە تورکمانو ئاشوریو هەندێ لە عەرەبەکانیش پشتگیری شۆڕش بوون[١٧٦] . لە مانگی نیسانەوە کارگێڕیەك بە ناوی کوردستانەوە پێك هاتو بودجەی بۆ دیاریکرا[١٧٧]

---

١٧٣- تریب: صفحات من تأریخ، ص ٢٨٣.

١٧٤- خۆشناو: مەسەلەی کوردو، ل١٥١" مەکدراڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٥٣.

١٧٥- کرێستەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٢٩٩

١٧٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (البارزاني: البارزاني والحركة، ج٣، ص٣٨٩)

١٧٧- کابینەی حکومەتی کوردستان لە ناوچە رزگارکراوەکان بەو شێوە بووە: سامی عەبدولڕەحمان سەرۆکو وەزیری دەرەوە بووە، مەحمود عوسمان وەزیری تەندروستی، عەلی عەبدوڵلا وەزیری دارایی، دارا تۆفیق، وەزیری راگەیاندنو پەروەردە، ساڵح یوسفی، وەزیری داد، نوری شاویس وەزیری کاروباری گشتی، موحسین دزەیی، وەزیری ناوخۆو سدیق ئەمین وەزیری کاروباری پەنابەران. وەزارەتی بەرگری (مەکتەبی عەسکەری) بە سەرپەرشتی ئیدریس بارزانیو هاشم عەقراوی بووە. بڕوانە: (کرچیرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٩٩-٤٠٠)

(حشع) لە ساڵی ١٩٦٩ بەشێکی بچوکی لێ جیابۆوە بە ناوی (قیادەی مەرکەزی)، ئەوانە نەچوونەی ناو بەرە لەگەڵ بەعس‌و لە ژێردەسەڵاتی شۆڕش‌و بە دۆستی پارتی مانەوە، دواتر لە ناوخۆیاندا ناکۆکیان تێکەوت‌و بچوکتر بوونەوە، لە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بارەگایان هەبوو[178]

لە ماوەی شەش مانگی یەکەم هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەو رادەیە خاوەنی چەکی قورس نەبوو بەرانبەر فڕۆکەی (مێك)ی سۆڤیەت‌و تۆپ‌و چەکی دوور هاوێژ بەرگری لە خۆی بکات، بۆیە شەڕەکان سەخت‌و هێزی پێشمەرگە نەیاندەتوانی لە پێدەشتەکان بەرگری بکەن، سەرچاوەیەك ئاماژەی کردووە، کە لە سەرەتای هەڵگیرسانی شەڕ هەتا ٢٣/٨/ ١٩٧٤ (٣٦) فڕۆکە بەردرانەوە خوارەوە[179]، دەکرێ ئەم ژمارەیە لە راستییەوە نزیك بێ.

لەو ماوەیەدا مەرجەعیەکانی شیعە پەیوەندیان لەگەڵ بەعس خۆش نەبوو، لە وتاری عاشورای ١٩٧٤ - ١٩٧٥ هەندێك لە زانایانی شیعە نارەزاییان لە شەڕی کوردستان دەربڕی، بەڵام حکومەت بە توندی بەرەنگاریان بۆوە[180]

چوارەم: جەماوەری کوردستان پشتگیری بەرەی بەعس‌و شیوعیەکان‌و پارتەکانی سەر بە حکومەتی نەدەکرد، ئەدەبیاتی (حشع) سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی بە دەستی ئێران‌و ئیمپریالزم تاوانبار دەکرد، لە رووی چینایەتیشەوە بە بۆرژوار دەرەبەگی

---

١٧٨- دیداری بەرێز بەهانەدین نوری، رۆژی ١٨/ ٩/ ٢٠٠٦ سلێمانی، بەڵام نەوشیروان مستەفا لە بابەت ئەو هێزەوە پێچەوانەی ئەوە پەیوەندیان لەگەڵ پارتی نایینێ‌و دەنووسێت: بە لێدانی چەند جاری بەعس‌و گوشاری پارتی لاواز بوون، هەندی بنکەو پێشمەرگەیان لە ناوچەی شۆڕش هەبوو. بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣١)

١٧٩- گۆیتەر: کورد گەلێکی، ل٢٩٩

١٨٠- ترىب: صفحات من تأريخ ، ص٢٨٣

کوردی ناو دەبرد[181]، لە رووی بەشداری (حشع)ی لە شەڕی پێشمەرگەی کوردستان لە ناوچەکانی بادینان‌و باڵەکو سلێمانی‌و کەرکوك، بەهائەدین نوری قەناعەتی وا بووە: ((کە ئەوکات مەبدەئی هێزی چەك زاڵ بووە، پێویست بوو (حشع) هێزی هەبێ هەتا حیسابی بۆ بکەن‌و رێستویەتی تەنیا چەك لە حکومەت وەربگرێ، بەلام سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ))[182]. گەر تێبینی بکەین زیانەکانی (حشع) لە دوای دروستکردنی بەرە لەگەڵ بەعس، شەڕی راگەیاندن‌و مەعنەوی بووە زیاتر لەوەی شەڕی دەستەویەخە بێت، (پ.د.ك) ترسی هەبووە، هێرشی راگەیاندنی (حشع) کەسایەتی شۆڕش لە وڵاتانی بەرەی سوشیالیزم بشێوێنی، ئەگینا لە دوای چوونە بەرەی بەعس (حشع) سەنگی جارانی لە ناو جەماوەری کوردستان لە دەستدا[183]

ئەو بەرپرسانەی (پ.د.ك) کە هەندێکیان دوای دروستبوونەوەی راستەوخۆی شەڕ دایانە پاڵ حکومەت‌و هەندێکیان پێشتر پەیوەندیان بە حکومەتەوە کرد بوو، وەکو:

---

١٨١- بۆ زیاتر زانیاری لە سەر پێشوازی حیزبی شیوعی عێراق لە خۆماڵیکردنی نەوت‌و خوێندنەوەی حیزبی شیوعی بۆ ئایندەی حیزبی بەعس‌و پەیوەندی کورد بەعس‌و حوکمی زاتی ناوچەی کوردستان. بڕوانە: (وثائق المؤتمر الوطني الثالث للحزب الشيوعي العراقي، بغداد، ١٩٧٦، من اجل توطيد و تعميق المسيرة الثورة و توجه نحو الاشتراكية، منشورات طريق الشعب ٨/مطبعة الرواد، بغداد، ١٩٧٦-١٩٧٩) لەوێدا کۆی بڕیارو راسپاردەو راپۆرتی سیاسی کۆنگرە تۆمار کراوە.

١٨٢- دیداری بەهائەدین نوری، رۆژی ١٨/٩/٢٠٠٦، سلێمانی.

١٨٣-- پارتی دیموکراتی کوردستان ١٠/١/١٩٧٤ یادداشتنامەی ئاراستەی حیزبەو رێکخراوو دەستەو نوێنەرانی رای گشتی ناوخۆو دەرەوە کردووە لە سەر وەلامی رۆژنامەی "طريق الشعب". سەبارەت بە هەڵوێستی "حشع" لە سەر شۆڕشی کوردستان. بڕوانە: دەقی یادداشتنامەکە لە رۆژنامەی "التآخي" ژ (١٥٣٦)ی ١٤ای کانونی دووەمی ١٩٧٤.

عەزیز عەقراوی ئەندامی (م.س)[١٨٤] و هاشم عەقراوی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیو پارێزگاری دهۆکو فاخیر مێرگەسووری ئەندامی کومیتەی ناوەندی، عوبێدوڵڵای بارزانی[١٨٥]، حکومەت بە هەمان ناوی (پ.د.ك) پارتێکی بۆ عەزیز عەقراوی دروست کردو وەکو بەشێك لە بەرەی نیشتیمانی هەژماری کردنو لە سەر هەمان زنجیرە بەردوام رۆژنامەی (التآخی)یان دەرکرد[١٨٦]، بەڵام لە کوردستان جەماوەریان نەبوو، دوای نوشستی شۆڕشی کوردیش بەو ئەندازەیە جەماوەری کوردستان بەلایاندا نەچوو.

١٨٤- لە رۆژنامەی (التآخی)دا عەزیز عەقراوی بە ناوی ئەندامی (م.س) رایگەیاندووە کە کار بۆ کۆنگرەی یاسایی (پ.د.ك) دەکات. لەوێدا باسی کردنەوەی بارەگای تازە دەکات بۆ لقەکانی پارتی لەو شارانەی کەوتۆتە بندەستی سوپای عێراق. بڕوانە: رۆژنامەی "التآخی"، ژمارە (١٦٠٣) نیسانی ١٩٧٤.

١٨٥- البارزاني: البارزاني والحركة، ج٣/ص٢٩١-٢٩٢، رۆژنامە نووسی سویدی تورد فاکستۆم: باس لە سەردانی وەفدی بەرەی نیشتیمانی کردووە بۆ سوید لەوێدا شێخ عوبێدوڵڵا لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا وتویەتی: (باوکم خیانەتی لە گەلەکەی خۆی کردووەو ئەو کارەی ئێستای خزمەت بە هێزی ئیمپریالیستو زایۆنی دەکات...). بڕوانە: لیس لنا من الاصدقا، غیر الجبال، ص٧. لە ژ(١٦١٠)ی ٢٨ نیسان ١٩٧٤، هەر لە رۆژنامەی (التآخی) گروپەکەی عەقراوی بانگەوازێکی بۆ گەلی کورد بڵاوکردۆتەوە هەتا کورد بەشداری شۆڕش نەکەن، هەروەها لە ژ(١٦٠٣)ی ٢٠ی نیسانی ١٩٧٤ عەزیز عەقراوی نووسیویەتی: (ئێمە بڕوامان بە شەڕ نیەو بەردەوام دەبین لە کاری سیاسیو ئامادەکاری بۆ کۆنگرەیەکی شەرعی... ئێمە کاردەکەین بۆ رزگارکردنی حیزب لە دەسەڵاتی خێڵەکی تاکڕەوانەی بارزانی پەیوەست بە لایەنی دوژمنی گەلەکەمان).

١٨٦- التآخی: پێش هەڵگیرسانەوەی شەڕ حەبیب موحەممەد کەریم خاوەن ئیمتیازو دارا تۆفیق سەرنووسەری بووە، لە ژمارە (١٥٨٣) ١٢ی ئاداری ١٩٧٤ نووسراوە بە هۆی باروودۆخی سیاسی ئەم دواییە (م.س.)ی بڕیاریدا رۆژنامەی (التآخی) بوەستێنێت. بە ماوەیەکی کەم دوای ئەو بڕیارە حکومەت یارمەتی گروپەکەی عەزیز عەقراویدا بە ناوی ئەو پارتەی خۆی سەرۆکایەتی دەکرد درێژەی بە دەرکردنی رۆژنامەی

عەبدوستار تاهیر شریف[187] یەکێکی دیکە بووە لە کادیرە کۆنەکانی باڵی (م.س) بەیاننامەی دەرکرد بۆ درێژەدان بە (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)، لەوێدا هەندێك بیانووی هێناوەتەوە بۆ ڕاگەیاندنەوەی ئەو پارتەو چوونە ناو بەرەی بەعس‌و شیوعیەکان، ئەمەیان پشتگیری جەماوەری زۆر کەمتر بوو لە پارتەکەی عەزیز عەقراوی، سەرەڕای پێکهێنانی پارتێکی دیکە بۆ عەبدوڵلا ئیسماعیل (مەلا ماتۆر)[188] بە ناوی (بزوتنەوەی پێشکەوتوخوازانی کوردستان)[189]، کە لە پارتەکانی دیکەی لایەنگری حکومەت لاوازتربووە.

لە شەش مانگی یەکەمی هەڵگیرسانەوەی شەڕ گۆڕانکاری زۆر هاتەدی لەوانە وەرگرتنی چەکی قورسی ئێرانی‌و بەشداری کردنی ڕاستەوخۆی پسپۆڕە ئێرانیەکان لە

---

(التآخی)دا، بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح: کاریگەری شۆڕشی ئەیلول، ل٢٢٨" التآخی ژمارە (١٥٨٣)ی ١٢ی ئازاری ١٩٧٤ و ژمارەکانی دواتر.

١٨٧- عەبدوستار تاهیر شەریف: لە دایکبوی کەرکوکە، لە سەرەتای شەستەکانەوە پەیوەندی بە (پ.د.ك) کردووە، لە دوو لەتبوونی پارتی، سەر بە باڵی (م.س) بووە، لە دوای ڕێککەوتننامەی ئازاری ١٩٧٠ بۆ لایەنگری حکومەت پارتێکی بە ناوی (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان) ڕاگەیاند، کراوەتە وەزیر لە حکومەتی عێراقیدا، پێش ڕووخانی حکومەتی بەعس لە ٢٠٠٣ وازی لە کاری سیاسی هێنا، لە ڕۆژی ٢٠٠٨/٢/٥ لە کەرکوك تیرۆر کرا. بڕوانە: عبدالستار طاهر شریف: تأریخ الحزب الثوري الكوردستاني، ص٢٥٢-٢٢٨" شاکەلی: خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی" گۆڤاری ستاندەر، چاوپێکەوتن لەگەڵ عەبدوستار تاهیر شەریف: ژمارە (٨)و (٩)ی لەیلولو تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٦، ل١٤-١٩

١٨٨- عەبدوڵلا ئیسماعیل: لە دایکبووی دەشتی هەولێرە، لە بەرپرسانی باڵی (م.س) پارتی بووە، لە سەرەتاوە ئەندامی (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان) بووە، دواتر حیزبێکی بچوکی دروست کرد، بەلام زوو پوکایەوە، لە دوای ڕاپەرینی ساڵی ١٩٩١ وەکو کەسایەتیەکی بێلایەن لە هەولێر دەژیا. بڕوانە: (شاکەلی: خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی).

١٨٩- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٣٦٦

بەرەکانی شەڕ لە پاڵ فەرماندەکانی پێشمەرگە دژی حکومەتی عێراقی، بە ڕادەیەك هاوکاری ئێرانیەکان زیادی کرد، هەندێ دەڵێن سەرکردایەتی شەڕی کوردستان ناڕاستەوخۆ کەوتە دەستی ئێران[190]، لەولاشەوە حکومەتی عێراق بە هاریکاری چەك و فرۆکەی سۆڤیەتی شەڕی دەکرد، سوپای عێراقی لە هێرشبردنەوە چووە حاڵەتی بەرگری، شارەکانی کوردستان هەمووی تا رادەیەك چۆڵ بوو، پەناهەندەی کورد لە نزیک و گاو شارەکانی ئێران زۆر زیادی کرد، هەتا ژمارەیان گەیشتە نزیکەی نیو ملیۆن کەس[191]، ئەوەش باری سەرشانی شۆڕش و سەرکردایەتی قورس کرد، سەرکردایەتی پێی وابوو بەمە زیان لە حکومەت دەدا، بەلام زیانی زیاتر لە شۆڕشدا. خەرجیەکانی شۆڕشی زۆر زیادی کرد و زۆربەی جوتیارانی لە داچاندنی زەویەکانیان دابڕی، سەرکردایەتی زیاتر ناچارکرد زیاتر لە ئێران نزیك بێتەوە.

ئێرانیش لە لای خۆیەوە بەشێکی قورسایی شەڕی کوردستانی بە ئەستۆ گرتبوو، لە بەرانبەردا پەشێوی لە ناو پێشمەرگە بلاوبوەوە و زیاتر شەڕ بووە بەکارهێنانی چەکی قورسی نێوان دوو حکومەت[192]، سەرەڕای ئەوە وەکو بەدەردەکەوێ هەتا دەهات شیرازەی حیزبایەتی لە ناو حیزب و پێشمەرگەدا زۆر لاواز ببوو.

لەگەڵ هەموو ناتەواویەکانی سەرکردایەتیکردن و کێشەی پەناهەندە و تێکچوونی شیرازەی ئیداری، بەلام خەلکی کوردستان لە ئومێدی سەرکەوتن، لە ئازاری ١٩٧٤ بۆ ئازاری ١٩٧٥ کوژراو و بریندارى سوپای عێراقی لەو شەڕە گەیشتە شەست هەزار

---

١٩٠-هەمان سەرچاوە، ل٢٨٤-٢٨٦

١٩١ - ئیبراهیم جەلال: خواروی کوردستان و، ل٣٧٩" خۆشناو: مەسەلەی کورد و، ل٢٧٩

١٩٢- بە تایبەت لە مانگی ئابی ١٩٧٤وە پسپۆری روسی و تەنانەت ئەڵمانی و چیکۆسلۆڤاکیش هاوکاری سوپای عێراقیان کردووە. سەرەڕای ئەمە بە فڕۆکەو فرۆکەوانیش یارمەتی سوپایان عێراقیان داوە، بۆ زانیاری زیاتر. بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٣٤١)

کوژراوو پێکراو[193]، لەوانە ٦٦ ئەفسەر کوژراوو لەوە زیاتر بریندار هەبوون[194]، خەرجی رۆژانەی شەڕ بە نیو ملیۆن دیناری عێراقی خەملێنراوە[195]، بە پێی سەرچاوەیەك چەکو تەقەمەنی زۆر کەم بێووە[196]

ستراتیژیەتی بەعس لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە ئازاری ساڵی ۱۹۷٤ زۆر روون بووە، وەکو سەدام حوسێن لە سەرەتای ئازاری ۱۹۷٤ وتبووی: ئەگەر دوای یەك ساڵ بە سەر شۆڕشی کورد سەرنەکەوتین ئەوە سازش دەکەین لە سەر شەتولعەرەب، بەو سازشە لە مەترسی شۆڕشی کورد رزگاردەبین[197]، بۆیە دوای ساڵێك لە شەڕ حکومەت بێ ئومێد بوو، کە بە سەر شۆڕشی کورددا زاڵ بێ پەنای بۆ رێککەوتن برد لەگەڵ شای ئێران.

---

۱۹۳- غیلان: تأريخ الاطماع الفارسية، ص۳۷، صدام حوسێن لە وتاری بەردەم ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیر لە ۱۷/ ۹/ ۱۹۸۰ دان بەو هەموو ئەو زیانانە دادەنێت، کە لە ماوەی ئەو ساڵە لە سوپای عێراق کەوتبوو، هەر ئەوە دەکاتە پاساوی سازش بۆ ئێران. بڕوانە: دەقی وتەکەی سەدام حوسێن لە بەڵگەنامەی ژمارە(۱٤).

۱۹٤- ژێرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلێکی بەژمزدەو، ۱۹۹۸، ل۲۰۹

۱۹٥ئەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل۲۰

۱۹٦- خليل ابراهيم احمد و جعفر عباس حميدي: تأريخ العراق المعاصر، ص۲٦٤" بەڵگەنامەی ژمارە(۱۳).

۱۹۷- ئەمە پوختەی دوا گفتوگۆی نێوان وەفدی سەرکردایەتی کوردیو سەدام حوسێن بووە لە بەغدا لە ۱۹۷٤/۳/۸. بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج۳/ ص ۲۹٦-۲۹۷" ئەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل۱۹-۲۰

## باسی سێیەم

## کاریگەری وڵاتانی زلهێزو دەوروبەر لە سەر پەیوەندییەکانی عێراقو ئێران بۆ بەستنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر

زۆربەی کاریگەریە دەرەکییەکان لە ڕێککەوتننامەی ١١ ئازارەوە هەتا نیسانی ساڵی ١٩٧٢ دەکرێ ناوبنرێ بە قۆناغی وردبوونەوە لە بەرنامەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە، بەڵام قوناغەکانی دواتر لەوە بەدەردەخەن پێشبینی بکرێ، کە هەردوو وڵاتی ناکۆك لە کۆتاییدا لە سەر حیسابی شۆڕشی کوردستان بگەنە ڕێککەوتن.

لە دوای ڕاگەیاندنی بەیانی ١١ی ئازار حکومەتی ئێران لە پاڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ ڕووداوەکانی عێراق زیاتر لە سەر خەت بووە، سۆڤیەتیش پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق چڕکردەوە، وای لێهات ئەمریکاو سۆڤیەت لە بەرانبەر هەردوو وڵاتی دراوسێی بە یەك ناکۆك ناڕاستەوخۆ بێنە مەیدانی نزیك بە ڕووداوەکانی ناوچەکە، هەتا کارگەیشتە ڕەنگدانەوەی ناکۆکی دەولی لە سەر ناکۆکییەکانی عێراقو ئێران. ئەم دابەش بوونەش دەگەڕێتەوە بۆ دوای شۆڕشی ١٤ی

ئەمەوزی سالی ١٩٥٨، کە لە هەندێ قۆناغ هەردوو وڵات لاریان نەبووە بۆ یەکلاییکردنەوەی ناکۆکیەکانیان پەنا بەرنە بەر توندوتیژی، بەڵام شەڕی سارد لە سەرەتای هەفتاکان ئەو ئەگەرەی لێ چاوەڕوان نەدەکرا لەوە زیاتر ناکۆکیەکانیان لە سەر ئێران و عێراق زەق بکەنەوە، هەروەها عێراق و ئێرانیش بەو جدیەتە بەشێك نەبوون لە پاشخانی ئایدۆلۆژی و هاوپەیمانی خاوەن بڕیار لە ناو ئەو دوو بلۆکبەندیەی شەڕی سارد.

هەوڵە بەردەوامەکانی سۆڤیەت بۆ ناوبژیوانی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی بووە هۆی زیادبوونی پێگەی سۆڤیەت لە عێراق، ئەوەش مەترسی لە لای ئەمریکا دروست کرد[198]. ڕۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لە سەقامگیری ئاشتی و ڕاگرتنی هاوسەنگی لە عێراق بەدیارکەوت[199]. لە دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئازار پەیوەندیەکانی عێراق و سۆڤیەت گەشەی سەند. لە ٩ی نیسانی سالی ١٩٧٢ پەیمانی (هاریکاری و دۆستایەتی) لە نێوان هەردوو وڵات واژۆکرا، بەمەش دەروازەیەك بۆ عێراق کرایەوە چەك و تەقەمەنی لە سۆڤیەت بکڕێت و پەیوەندی بازرگانی و ئابووری لەگەڵ پەرەپێبدات[200]، ئەمەش بۆ عێراق دەروازەیەکی گرنگ بوو بۆ خۆبەهێزکردن، بە تایبەت دوای خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق لە یەکی حوزەیرانی ١٩٧٢.

پەیوەندیەکانی عێراق بێجگە لە یەکیەتی سۆڤیەت لەگەڵ ژمارەیەکی دیکەی وڵاتانی بەرەی سۆشیالیزمی بەرەو پێش چوو. ڕێککەوتننامەی هاریکاری و دۆستایەتی

١٩٨- نوورەدینی: سیستەمی نوێی، ل٩٩-١٠٠

١٩٩- مەحمود عوسمان، لە بەرنامەیەکی تایبەت بە بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، لە کەناڵی ئاسمانی زاگرۆس لە ئێوارەی ڕۆژی لە ٢٠٠٧/٣/١٤.

٢٠٠- لە دوای ئەو هاوپەیمانیەتیە چەندان ڕێککەوتنی دیکەی بە دواداهات لە بوارەکانی سەربازی و چەك و گەشت و گوزار و تەکنەلۆژی و... هتد. بڕوانە: دوا بەشی ئەم توێژینەوەیە

بـووه مایـەی تەگـەره لــە بــەردەم پەیوەندیــەکانی عێــراق‌و ڕۆژئــاوا بــە گشــتی‌و پەیوەندییەکانی عێراق‌و ئەمریکا بە تایبەتی، گرنگترین خاڵی هۆکاری ئەو گرژییــەش بە هۆی خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق بووە[201]، بەو هۆیەوە یەکیەتی سۆڤیەت پابەندبوو بە کۆمەکی تەکنیکی بۆ عێراق بۆ گـەڕان‌و دۆزینــەوەو دەرهێنــانی نــەوت، بــۆ ئــەو مەبەستەش هاوکاری دارایی پێشکەشی عێراق کرد[202]

لە پێش هاوپەیمانیەتی نێوان عێــراق‌و ســۆڤیەت، ئێــران تــەنیا لــە بــەهۆی کــارتی ناکۆکی نێوان شۆڕشی کوردو بەعس دابووە تا بە قازانجی خۆی ســوودی لێوەربگرێــت، بەڵام ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ شای نیگەرانکرد، چـونکە دەبـووە دەرفــەت بــۆ بەهێزبوونەوەی عێراق، هەتا دەگاتە باڵادەستی کەنداو، هەروەها لەوانەبووە شۆڕش لــە کوردســـتانی ئێـــران ســـەرهەڵبداو مـــستەفا بـــارزانیش ناچـــارنەدەبووە لـــە بەرانبـــەر دۆستایەتی ئێران بەرهەڵستی بکات[203]، هاوپەیمانیەتی عێراق‌و سۆڤیەتیش مەترسی لە سەر ئێران گەورەتر کرد بۆ ئاستی نیگەرانی ئەمریکا، ئەمەش دەرفەتێك بوو ئێران سوود لە نیگەرانی ئــەمریکا وەربگرێــت، بۆیــە وەکــو نووســەرێك ئامــاژەی داوە، کــە ڕێککەوتنی عێراق‌و سۆڤیەت ناکۆکیەکانی عێراق‌و ئێرانی قوڵترکردەوە[204]

مــانگێك بە سەر هاوپەیمانیەتیەکــە تێنەپــەڕی، (نیکســۆن) ســەرۆکی ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو (کیسنجەر)ی ڕاوێژکاری بۆ ئاسایشی نەتــەوەیی ســەردانی ئێرانیان کردو لەگەڵ شا کەوتنە وتووێژ بۆ دانانی ڕێگە چارەیەك بــۆ دوورخســتنەوەی

---

٢٠١- ڕێبوار محمد کەریم: پەیوەندییەکانی عێراق‌و ئەمریکا "١٩٢١-١٩٨٩"، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ٥٢، تشرینی دووەمی ٢٠٠٧، ل١٣٦-١٣٧

٢٠٢- هەمان سەرچاوە، ل١٣٦

٢٠٣- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٢٦٥" علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٥٦

٢٠٤- فاضل رسول: العراق- ايران، ص٢٧

یەکیەتی سۆڤیەت لە عێراق. لە مانگی نایاری ١٩٧٢ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاریدا لە بەرانبەر پێگەی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا پشتگیری ئێران بکات[٢٠٥]، بە تایبەت نیکسۆن و کیسنجەر تازە لە سەردانی سۆڤیەت گەڕابوونەوە، لە گفتوگۆی سەخت دابوون لەگەڵ بەرپرسانی ئەوێ بۆ گفتوگۆ دەربارەی چەکی کۆمەلکوژ، سیاسەتی کیسنجەریش لەوبارەیەوە روون بووە، بەوەی هەر ولاتێك پەیوەندی لەگەڵ سۆڤیەتدا هەبێت دەبێت هەوڵی لاوازکردنی بدرێت[٢٠٦]

راستە ناکۆکی عێراق و ئێران، سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان کێشکردە ناو ناکۆکیەکە، بەلام ئەوانیش بێ ئامانج نەبوون. گوایە زیادبوونی پشتیوانی ئێرانی مستەفای بارزانی پەشیمان کردۆتەوە[٢٠٧]، دەکرێ پەیوەندی بارزانی لەگەڵ ئێران لە رێککەوتننامەی ئازارەوە پچڕابێت، بەلام ئەمجارەیان لە رێگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دوای زیاتر لە سالێك نوێ کرایەتەوە، ئەویش لە دوای هاوپەیمانیەتی عێراق و یەکیەتی سۆڤیەت. بارزانی ئەو هاوپەیمانیەتیەی بە زیان بۆ سەر شۆڕشی کورد ناسیوەو وەکو فاکتەری بەهێزبوونەوەی عێراقی داناوە، بە رادەیەك کاریکاتە سەر پەشیمان بوونەوەی رێککەوتنی ١١ی ئازار[٢٠٨]، لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی (الفیغارو الفرنسیە)دا مستەفا بارزانی بە راشکاوی دەلێ: ((لێکنزیکبوونەوەی سۆڤیەت لە سەر حیسابی ئێمەیە، ئەو چەکانەی

---

٢٠٥- مەکدوال: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٤٣* سرهنگ غلامر چاغانی: تأریخ بیست، پنج سالة ایران، از کودتا تا انقلاب، طهران ١٣٧١، ج١/ص٣٥٦* صالح ملا عیسی: ایران افریقي، ص١٦٩-١٧٠

٢٠٦- بڕوانە: جەلال جەرمەگا: جریدە الاتحاد عدد (٤٦٣) في ٢٠٠٢/٣/٨

٢٠٧- سعد ناجي جواد: العراق و المسألة الكردية، ١٩٥٨-١٩٧٠، لندن، ل١٩٩.

٢٠٨- بۆ ترسی بارزانی لە هاوپەیمانیەتی ١٩٧٢/٤/٩ ی عێراق و سۆڤیەت بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٠٨-١٠٩* بەلگەنامەی ژمارە (١١))

سۆڤیەت دەیداتە عێراق لە دژی ئێران بەکاری ناهێنێ، کە سۆڤیەت پەیوەندی زۆر باشی لەگەڵ ئێراندا هەیە، دژی ئیسرائیلیشی بەکارناهێنێت، چونکە بەغدا سەرەڕای ئەو لێدوانانەی لەو بارەیەوە دەدرێ هێرش ناکاتە سەر ئیسرائیل، بەڵکو عێراق ئەو چەکانە دژی ئێمە بەکاردەهێنێت..))[209]. لەو نامەیەشدا، کە لە شوباتی ١٩٧٧ بۆ (جیمی کارتەر)[210]ی ناردووە، مستەفا بارزانی هۆکاری بنەڕەتی تێکچوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراق و هەڵگیرسانەوەی شەڕ دەخاتە ئەستۆی هاوپەیمانیەتی (سۆڤیەت و عێراق و حشع)، کە بە بەرەی چەپ ناوی بردوون بۆ دژایەتی شۆڕشی کوردستان[211]، گوایە نهێنی گەرمبوونەوەی پەیوەندی بارزانی لەگەڵ شا لەو خاڵەوە دەستی پێکرد، کە عێراق بە هۆی هاوپەیمانیەتی سۆڤیەتی بەهێز دەبێ بۆ سەر گیانی کورد ئەمەش لە راستییەوە نزیکە، کە لەراستیدا وەکو ترێتۆر ئاماژەی پێداوە، هاوپەیمانیەتی سۆڤیەت لەگەڵ حکومەتی عێراق بێجگە لە هاوپەیمانیەتی

٢٠٩- الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٢٠٧" سلومو تكدین: للوساد في العراق و دول الجوار، ت/ بدر العقیلي، عمان١٩٩٨، ص٢٦٤

٢١٠- جیمی کارتەر: پاڵێوراوی حیزبی دیموکراتەکان بووە، لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ بۆتە سەرۆکی ئەمریکا. لە پڕوپاگەندە بۆ هەڵبژاردنی جەختی دەکردە سەر "ئەخلاقیەتی دیموکراتی"و "رێزگرتن لە مافی مرۆڤ". بە تایبەت لە وڵاتانی ئەمریکای لاتینیو ئێران، سەرکەوتو بووە سێ و نۆیەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە سەردەمی ئەو موحەممەد رەزا شای ئێران دەستی ئەمریکا رووخاو کارتەر بە فریایەوە نەچوو. بڕوانە: (الكیالي والاخرون: موسوعة السیاسیة، ج٥/ ص٢٢-٢٣)

٢١١- بڕوانە: نامەی ناوبراو لە بەڵگەنامەی ژمارە (١١).

ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرفەتی دیکەی بۆ سەرکردایەتی کورد نەهێشتبۆوە[212]

لە سەرچاوەکاندا هاتووە، کە مستەفا بارزانی باوەڕی بە شا نەبووە، بەڵام چاودێری ئەمریکییەکان ئەو ترس و گومانەی ڕەواندۆتەوە[213]. دەگونجێت ئەمە ڕاست بێت، بەڵام خۆ تاکە جاریش نەبووە بارزانی لەگەڵ ئێران پەیوەندی هەبووبێت، چونکە هۆکاری سەرەکی کەوتنی شۆڕشی ئەیلول بە ئەو ڕێککەوتنەوە بەستراوەتەوە[214]. ئەو مەسەلەیە ئەوها لێك نادرێتەوە، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٢ چۆن کورد کەوتە نێوان بەرداشی دوو جەمسەری ناکۆك، لە کوێوە شۆڕش چووە سەر ڕێگایەك کۆتایی داخراو بوو، بۆ ئەو هەنگاوەش ئاماژە هەیە، کە (م.س)ی و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لێی بێئاگابوون[215]. ئەوکات ئەو بۆچوونەی (جۆناتان) بە ڕاست دەردەچێ، کە دەنووسێ: ((بارزانی نە لە پێش و نە یەکسەر لە کاتی هەرەسی ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٧٥داو نە دوای ئەویش نەیدەویست هیچ کام لە یاریدەدەرەکانی خۆی لە بڕیاردان بەشداری بکەن))[216]، ئەمە لە پشت نهێنی کەوتنی شۆڕشی ئەیلولەوە بووە[217]

---

٢١٢-ژیرار شالیان: تراژیدیای کورد (ڕاپۆرتێك بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان)، و/کوریا ڕەحمانی، دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٠، ل١١٣

٢١٣- بارزانی: البارزاني و الحركه، ص٢٧١-٢٧٢" کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٦٨" گزینتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٣٤٢" بەڵگەنامەی ژمارە(٦).

٢١٤- پارتی دیموکراتی کوردستان، شەڕی ناوخۆ چۆن دەستی پێکرد و کێ لێی بەرپرسیارە؟ لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە، هەولێر١٩٩٧، ب١، ل١٢

٢١٥-کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٦٨

٢١٦- کوردستان یان کلۆنی نەتەوەیەك، و/خەسرەو شالی، سلێمانی ٢٠٠٢، ل٢٢٦

٢١٧- بڕوانە: بەشی دووەم

ڕووداوەکانی ناو ئەو ململانێیە ئەوە دەسەلمێنن، کە هەریەك لە (عێراق، ئێران، سۆڤیەت، ئەمریکا، ئیسرائیل) حیسابیان بۆ ئەگەرەکان کردووە، بەلام هەموو حیکمەتی هاوپەیمانیەتی‌و پشتیوانی بێ شوماری ئێران لە شۆڕشی کورد ئەوە بووە، باوەڕ بە ئێران نەکراوە، ئەمریکا ترسی ئەو بێمتمانەتیەی ڕەواندۆتەوەو زەمانەت بووە. لە کاتێکدا بە پەیوەندییەکانی نێوان بارزانی‌و کیسنجەردا زەمانەتێك بۆ ئەو مەسەلەیە دیارنییە، هەروەها بارزانی لەوەدا هەڵەچوو بووە، کە پێی وابووە ئەمریکا ئێرانی هێناوەتە ناو شەڕ دژی عێراق، جۆناتان دەنووسێت: ((شای ئێران سەبارەت بەیارمەتیدانی شۆڕشگێڕە کوردە بارزانیەکان بۆ دژایەتی حکومەتی عێراقی ڕای واشنتۆنی گۆڕی))[218]، نەك بەپێچەوانەوە، لەلایەکی دیکەوە باری قورسی شۆڕشی کورد زیاتر لە سەر شانی ئێران بوو[219]، سەرکردایەتی شۆڕش ئاگادار بووە، کە ئەو بایەخەی ئەمریکا لە سەر داوای شا بووە[220].

عێراق لەو ماوەیەدا ڕێگەی بە یەکیەتی سۆڤیەت داوە ڕێگە ئاوییەکانی عێراق لە کەنداو بەکاربهێنێ، مافی کارکردنیان لە کێلگەی نەوتی ڕمێیە (ڕمیشة)ی گەورە پێدرا، لە بەرانبەردا عێراق گرێبەستی کڕینی چەك‌و هاریکاری جەنگی واژۆکرد[221] ڕێککەوتننامەی عێراق‌و سۆڤیەت بۆ پەرەپێدانی کانە نەوتی باکوری ڕمێیە هۆکاری گرنگ بوو بۆ دابڕانی سیاسەتی عێراق لە ڕۆژئاوا[222].

---

٢١٨- کوردستان یان، ل٣٧٧

٢١٩- چاوپێکەوتنی کوردستانی نوێ لەگەڵ دکتۆر مەحمود عوسمان، ژمارە (١٥٢٤)ی ٢٣ کانوونی یەکەمی ١٩٩٧

٢٢٠- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢١٠

٢٢١- نورەدینی: سیستەمی نوێی، ل١٠٠

٢٢٢- ماریون وپتر سلوجت: العراق الحديث من الثورة الى الدكتاتورية، ص٢٠٩

توندترین لایەنی ناکۆك لە ناو ئەو دوو بەرەیە عێراقو ئێران بوون، بە تایبەت دوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ساڵی ۱۹۳۷ لەلایەن ئێرانەوە، ئێران لە دوای دەستبەسەراگرتنی هەر سێ دوورگەی هاوسنووری ئیمارات لە کەنداو، چاوی بڕیبووە دووبارە دارشتنەوەی ڕێککەوتنێکی تازە لەگەڵ عێراق، کە خواستەکانی لە کەنداوو شەتولعەرەب پەرەپێبدات، چاوی لە نیوەی شەتولعەرەب بووە، بەو بەشە رازی نەبووە، کە لە پەیمانی ۱۹۳۷ لە سەری ڕێککەوتوون[۲۲۳]، حیزبی بەعسیش هەر لە سەرەتای هاتنە سەرحوکم ویستوویەتی بەرەنگاری ستراتیژیەتی ئێرانی ببێتەوە، خۆی بە پارێزەری دەروازەی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی داناوە لە بەرانبەر ئێران، هەر لەو بارەیەوە کەوتە وروژاندنی رای عەرەبی لە عێراقو وڵاتانی کەنداو، دارشتنی زاراوەی تایبەت بەو مەسەلەیە، وەکو (چاوتێبڕینی فارسی لە خاکی عەرەب)و مەترسی (شعوبیەت)[۲۲٤]،

---

۲۲۳- بە پێی ڕێککەوتنی ساڵی ۱۹۳۷ شەتولعەرەب لە رووی دەریارانییەوە بۆ عێراق دەبێت، ئەمەش بە پشتبەستن بە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ۱۹۱۳و کۆنووسی دیاریکردنی سنووری ساڵی ۱۹۱٤، تەنها لە ئاستی (ئابادان) کەشتیەکانی ئێرانی دەتوانن سوود لە ئاوی شەتولعەرەب وەربگرن، ئەویش بە هەڵکردنی ئاڵای عێراقی، ئێرانیش ئەمەی بە ئیهانە زانیوە. بڕوانە: العزي: مشكلة شط العرب، ص٦٩-٧٠" راندال: کوردستان یان، ل٢٣٠" صالح ملا عیسی: جران افرینی، ص١٧٤

۲۲٤- شعوبیەت: یەکێکە لە بنەما سەرەکیەکانی ناسیونالستی عەرەبیو بە تایبەت حیزبی بەعس. زیاتر لە خەیاڵ دەچێت وەکو واقیع. پێی وایە عەرەب پەیامێکی یەکگرتوویان هەیە، دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلافەتی راشیدیو ئومەویو عەباسی بە ئیرشادەیی عەرەبان راوەستاوە، هۆکاری کەوتنی قەوارەی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ پیلانی غەیری عەرەب (عەجەم) بە تایبەت فارسەکان. کە بە شعوبیەت ناویان دەباتو مەترسیەکەیان لە سەر عێراقو عەرەبان وەکو پێشینەیەکی مێژوویی درێژدەکاتەوە بۆ پێش ئیسلام، بڕوانە: (ئەلیبەت عیسا: خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، ل١٩٠)

زیندووکردنەوەی خاوەنداریەتی عەرەبی لە ئەهوازو دەوروبەری)[٢٢٥] بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەمانەش کەوتە داڕشتنی پاشخانی مێژووی[٢٢٦]

لە دوای پاشەکشەی هێزەکانی بەریتانی، ئەمریکا نەیویست یەکێتی سۆڤیەت پەل بهاوێت بەرەو عێراق و کەنداو، تونیژەرێك لەو بارەیەوە دەنووسێ: ((ئەم ئامادەبوونەوەی جەمسەری سۆشیالیستی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەم پێشڤەچوونەی سیاسەتی دەرەکی یەکێتی سۆڤیەت لە عێراق و ناوچەکە، جەمسەری ڕۆژئاوای لیبراڵ و سەرمایەداری هەراسان کرد، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەم بۆ خۆی و هەم لە ڕێگەی هاوپەیمانەکانی لە ناوچەکە کەوتە جوجوڵ بۆ دەستپێکردنی سەرەتایەکی نوێ لە بزاڤی دیپلۆماسی..))[٢٢٧]، پێشتر سۆڤیەت دۆستایەتی گەرمی لەگەڵ ژمارەیەك وڵاتی عەرەبی دامەزراندبوو، وەکو سووریا و میسر و یەمەن، لەوە دەچوو ئەمە لە پاڵ ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ عێراق دروستی دەکات فراوان بێت بۆ وڵاتانی کەنداو. ئێستاش بێجگە لە ئیسرائیل ئێران تاکە دەوڵەتی ناوچەکەیە پەیوەندی دۆستانەی

---

٢٢٥- هەرێمی خوزستان: پارێزگایەکی ئێرانە، ناوەندەکەی شاری ئەهوازە، هاوسنوور لەگەڵ بەشی ڕۆژهەڵاتی شەتولعەرەب، گەورەترین شارەکانی ئەو هەرێمە ئابادان و خورەمشەهرە. محافظة خوزستان.wikipedia.org

٢٢٦ - حیزبی بەعس و ئەدەبیاتی ناسیونالیستی عەرەبی هەموو ناوەندەکانی ڕاگەیاندن و خوێندن و زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمیە مرۆییەکانی بەو ئاراستە دەوروژاند، کە هەرێمی خوزستان "عەرەبستان" هەرێمێکی دابڕاوە لە نیشتیمانی عەرەبی و لە عێراق. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جابر ابراهیم الراوي: الجزر العربية الثلاث، مهدي حسين البصري، للموقف القومي التأريخي ازاء التحدي الفارسي، السلسلة الرقم ١٣٤ العراق- وزارة الثقافة و الاعلام، دائرة الأعلام الداخلي العامة،١٩٨٠" محافظة خوزستان، wikipedia.org

٢٢٧- نوورەدینی: سیستەمی نوێی، ل٩٩

لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی هەبێت، کە ئێران کۆڵەکەی خاڵی دەستپێکردنی سیاسەتی دەرەوەی بووە لە ناوچەکە، تێڕوانینی شا بۆ کێشە سیاسییەکانی جیهان لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکی تێکی دەکردەوە. لە سەر ئەو بنەمایە بووە، کە وەزارەتی بەرگری فەرمانیدا ئێران هەر چەکێکی دەیخوازێ بێجگە لە چەکی ئەتۆمی بیداتێ[228]

هویدا لە کتێبەکەیدا لە سەر کیسنجەر ئاماژە بە ڕاپۆرتی (پایک)[229] دەنووسێ: ((نامەیەك لە تەموزی ١٩٧١ لە سەرۆکی نووسینگەی هەواڵگری ناوەندی لە تاران هاتووە بۆ بەڕێوەبەرایەتی وەکالەتی هەواڵگری ناوەندی لە واشنتون، بەوەی مستەفا بارزانی پەیوەندی بەو نووسینگەوە کردووەو داوای هاوکاری ئەمریکی کردووە لە شەڕی دژی عێراق، دواتر سەرۆکی نووسینگە هاوڕایی داواکاری بارزانی بەدیاردەخا، چونکە عێراق لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت هاریکاری دەکات. دواتر سەرۆکی نووسینگە لە سەر داکۆکیکردنی بارزانی لە ئاداری ١٩٧٢ نامەیەکی دیکە دەنێرێ، هەردوو نامە درانە لیژنەی چل کەسی (یەکێك بوو لە لیژنەکانی ئەنجومەنی نەتەوەیی، کە سەرپەرشتی چالاکیە ئیجابیەکانی هەواڵگری دەکات بە سەرۆکایەتی کیسنجەر، بەڵام لەو بارەیەوە بریاری نەدا)))[230]. ئەگەر سەیری مێژووی نامەی یەکەمی بارزانی بکەین، لە کاتی سەرەتای پەیدا بوونی پەیوەندی عێراق و سۆڤیەت و سەرهەڵدانی نیشانەکانی پەشیمان

---

٢٢٨- شلومو نکدیمن: الموساد في العراق، ص ٢٦٥

٢٢٩- - ڕاپۆرتی پایك: ڕاپۆرتێکی ئامادەکراو بووە لەلایەن ئوتیس پایك نوێنەری نیویۆرك لە کۆنگرێسی ئەمریکی، کە وەکو سەرۆکی لیژنەیەك دیاری کرابوو بۆ لێکۆڵینەوە لە جوجۆڵەکان CIA، ڕاپۆرتەکەی لە ١٩/١/١٩٧٦ ئامادە کرد بۆ بەردەم کۆنگرێس، لە ڕێگەیەی ڕۆژنامەیەکەوە لە ڕۆژی ٢٢/٢/١٩٧٦ ئاشکرابوو، لە سێ مەسەلەی کۆڵیوەتەوە، لەوانە پەیوەندییەکانی ئەمریکا کورد. بڕوانە: محمد حسنين هيكل: الحل والحرب، ط١، بيروت١٩٨٥، ص١٣٧-١٤٠° ئەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل٦٦-٦٧.

٢٣٠- أمين هويدي: كيسنجر و ادارة الصراع الدولي، ص٧٦

بوونەوەی بەعس ویستوویەتی پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دابمەزرێنێ، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ لە راپۆرتی (پایک)دا هاتووە، کە بارزانی متمانەی بە شا نەبووە، داوای هاوکاری لە ئەمریکا دەکات نەك شا[231]، کەواتە بارزانی ویستویەتی بەسەر ئێراندا بازبدات و لەگەڵ ئەمریکادا پەیوەندی دابمەزرێنێت، لەلایەکی دیکەوە شا متمانەی بە دۆستایەتی بارزانی نەبووە، دەزگای ساواك ویستوویەتی بۆ فشار خستنە سەر عێراق سوود لە بزووتنەوەی کورد وەربگرێ، گوایە شا بێمتمانەیی خۆی بە بارزانی نیشانداوە، بەڵام قەناعەتیان پێکردووە[232]

ساڵ و نیوێك دوای رێککەوتنی ئازار، (ئەمریکا و ئێران، سەرکردایەتی کورد) دەچنە یەك بەرەو ئیسرائیلیش دەبێتە لایەنێکی دیکەی ئەو هاوپەیمانیەتییە، پەیوەندییەکانی سەرکردایەتی (پ.د.ك) لەگەڵ ئیسرائیل دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شۆڕشی ئەیلول[233]، ئیسرائیل دەستپێشخەری کردووە پەیوەندی هەبێت لەگەڵ سەرکردایەتی کورد، مەبەستی ئیسرائیل ئێستا لەو پەیوەندییە هاندانی کورد بووە لە سەر شۆڕش هەتا فشار لە سەر عێراق دروست بێت نەپەرژێتە بایەخدان بە هاوبەندی عەرەبی بۆ شەڕی ئیسرائیل[234]. سەبارەت بەو پەیوەندییە مەحمود عوسمان دەڵێ: ((سێگۆشەیەك هەبوو،"ئێران، ئیسرائیل، ئەمریکا"، شای ئێران کۆڵەکەی ناوچەکە

---

٢٣١- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٦).

٢٣٢- عیسی پەژمان: نهێنی یەکانی بەستنی، ل٦٠

٢٣٣ - البارزانی: البارزانی والحرکە، ج٣/ ص٣٧٩-٣٨٠" چارپێکەوتن لەگەڵ محمود عوسمان، بەشی یەکەم، کوردستانی نوێ ژمارە (١٥٢٤)ی ٢١/١٢/١٩٩٧.

٢٣٤- بۆ زانیاری زیاتر لە سەر پەیوەندی سەرکردایەتی کوردو ئیسرائیل بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و، ج٣/ ص٣٧٩-٣٨٢" محمود عوسمان: "دیرۆکی پەیوەندییەکانی کوردو ئیسرائیل"، رۆژنامەی کوردستانی نوێ، "چارپێکەوتن"، ژمارەکانی (١٥٢٢)و (١٥٢٤)، (١٥٢٥)، کانونی دووەمی ١٩٩٧).

بوو، هەر یەکێك بیوایە هاوپەیمان لەلایەك دەچووە ناو سێگۆشەکەوە، کورد لە ڕێگەی ئێرانەوە چووە نـاو سێگۆشـەکەوە، دواتـر پەیوەنـدی کـرد لەگـەڵ ئیسـرائیلو ئینجـا ئەمریکا...))[٢٣٥]، بەڵام ئەمە لای سـەرکردایەتی کورد شتێکی ناچاری نەبووە، بۆچوونی پێچەوانە لە ناوەندی بڕیاری ئەوکات دیدی دیکەمان دەداتی لە سـەر ئەو بابەتە، بەوەی ئەگەر شای ئێرانیش خیانەت لـە کـورد بکـات ئیسـرائیل بـەو پێگـە زۆرەی لـە لای داڕێژەرانی سیاسەتی ئـەمریکا هەیـەتی لـە ڕێگـەی ئیسـرائیلەوە دەتـوانێ شـتێك بکرێ[٢٣٦].

ئیسـرائیل لای خۆیەوە پێی وابووە تازەکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگـەڵ ئێـران لـە شەڕی (ئۆکتۆبەری ١٩٧٣)[٢٣٧]کوردەکـانیش کارێـك دەکـەن هـیچ نـەبێت هێزەکـانی عێراقی دەوەستێنن نەیتوانی بەشداری بەرەی شەڕ بکات، بەڵام ئەمە نەکراو ئیسـرائیل بێئومێدبوو[٢٣٨].

---

٢٣٥- بڕوانە: کوردستانی نوێ، ژمارە (١٥٢٢) ٢١/١٢/١٩٩٧. لێرەدا ئەوەی مەحمود لە سـەر مێژووی ئەو پەیوەندییە باسی دەکات بە دروست نایبینم چونکە پەیوەندییەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شۆڕشی ئەیلول، هەروەها لە ڕێگەی ئێرانیشەوە ئەو پەیوەندییە دروست نەکراوە.

٢٣٦- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٢٨١.

٢٣٧- شەڕی ئۆکتۆبەر: لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ بە دەستپێشخەری سووریاو میسر بەرانبەر ئیسرائیل هەڵگیرسا، دواتر عێراق بەشداری کرد، شەڕی ئۆکتۆبەر بۆ قەرەبووکردنەوەی تێکشکانی ١٩٦٧ی دەوڵەتانی عەرەب بووە.

٢٣٨-شلومو نکدیمون: الموساد في العراق، ص٢٧٥-٢٧٦

له راستیدا سەرکردایەتی کورد نەیدەویست بە هۆی شەڕو ناکۆکی خۆی لەگەڵ عێراق پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی عەرەب تێك بدات[239]، ئەگەر لە شەڕی ئۆکتۆبەر هەنگاوێکی لەو جۆرەی بهاویشتایە بێگومان ناکۆکییەکانی لەگەڵ عێراق فراوان دەبوو بۆ ناکۆکی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی، ئیسرائیل چاوەڕوانی دەکرد کورد لە بەرژەوەندی ئەوان بجوڵێت، پێش شەڕی ئۆکتۆبەری ۱۹۷۳ لە ڕێگەی باڵوێزی میسر لە بەغدا ئەنوەر سادات[240] داوای لە بارزانی کردبوو لە حاڵەتی هەڵگیرسانی شەڕی عەرەبو ئیسرائیل دان بەخۆدابگرن لە شەڕ دژی سوپای عێراقی هەتا عێراق بە ناوی سەرقاڵی شەڕی کوردستانەوە بیانوو نەهێنێتەوە[241]، بەڵام بە پێی گێڕانەوەی کۆچیراو ڕاپۆرتی (پایك) بارزانی بۆ ئەو مەسەلەیە پرسی بە کیسنجەر کردووە، ئەویش لە ۱۶/ ۱۰/۱۹۷۳ واتە نۆ ڕۆژ دوای دەستپێکردنی شەڕی عەرەب ئیسرائیل وەڵامی بارزانی داوەتەوە، کە ئەو کارە بە باش نازانێت. داواکردنی ئەنوەر ساداتو پەیوەندی عەرەبی- کوردیو ئارەزوونەبوونی ئەمریکا پێکەوە وایان کرد سەرکردایەتی کورد نەچێتە ژێر ئەو بارەیەوە، لەگەڵ ئەوشدا بەعس لە ئەدەبیاتی خۆیدا بە بەردەوامی

---

۲۳۹- مەحمود عوسمان بۆ ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی وتوویەتی: ئەگەر هاوکات کوردەکان شەڕی سەرانسەریان ڕابگەیاندایە دژی عێراق، قازانجەکەی دەچووە ناشی دوژمنانی کوردەوە، دەبووە بەڵگە کە کورد ئامادەیە لە پشتەوە تیر لە نەتەوەی عەرەبی بدات. بڕوانە: (شلومو نکدین: الموساد في العراق، ۲۷۸)

۲٤۰- ئەنوەر سادات: لە دوای مردنی جەمال عەبدوناسر لە ساڵی ۱۹۷۰ بۆتە سەرۆکی کۆماری میسر، لە ساڵی ۱۹۸۱ تیرۆر کرا، ئەنوەر سادات بە هۆی ڕێککەوتننامەی (کامپ دیڤید)ی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل شەقامی عەرەبی لە خۆی نیگەران کرد. بڕوانە: (محمد علی القوزي: موضوع خاص في تاريخ العرب الحديث، بيروت، ۱۹۹۹، ص۲۷۳-۲۷۷).

۲٤۱- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج۲/ ص۲۸۷-۲۸۸

شۆڕشی کوردی بە پیاوی ئەمریکاو ئیسرائیل تاوانبارکردووە، لە دوای دروستکردنی بەرەی بەعسو شیوعیەکان، (حشع)یش لە بڵاوکراوەکانی خۆیاندا تاوانی بە کرێگیراوی ئیمپریالیزمو سەهیونیان دەدایە پاڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان[٢٤٢] گەرچی کۆچێرا قەناعەتی تەواو پێچەوانەی هەیە دەڵێ: (ئەگەر شەڕی عەرەب - ئیسرائیل نەبایە سوپای عێراق هێرشی دەکردە سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە، ئەگەر کیسنجەریش بە بەرژەوەندی زانیبا، بێگومان بارزانی پاش چەند ڕۆژێك لە هەڵگیرسانی شەڕی عەرەبو جولەکە هێزی پێشمەرگەی وەگەڕ دەخست تا پەلاماری سەنگەرەکانی سوپای عێراق بدەن)[٢٤٣]

سەرکردایەتی (پدك) نەیویستووە پڕوپاگەندەی (حشع) لە سەر کوشتاری شیوعیەکان گەورە بێ، هەتا کاریگەری خراپی لە سەر کەسایەتی شۆڕش نەبێو بە بەرەی دژە کۆمۆنیستی نەناسرێت، پەیوەندیەکانی عێراقو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لایەك لە سەر مەترسی پەیوەندیەکانی سۆڤیەت وەستاوە لەگەڵ عێراق لە لایەکی دیکەوە بەشێکی دیکەی ناکۆکی ئەمریکا لەگەڵ عێراق پەیوەست بووە بە ناکۆکی عێراق لەگەڵ ئێرانی هاوپەیمانی ئەمریکا، ئەگەری ئاسایی بوونەوەی پەیوەندی عێراقو ئەمریکا بە دوور نازانرێت، بۆیە ئاماژە هەیە بەرەی یەکیەتی سۆڤیەت گەرمو گوڕ نەبووە لە زیاتر قوڵکردنەوەی ناکۆکی لەگەڵ ئێران، کە وڵاتی

---

٢٤٢- بڕوانە: نووسینێکی (عامر عەبدوڵلا) بە ناوی (ان العراق هو هدف و العدوان و هو في الوقت نفسه تجربة رائدة، قیادة الجناح الیمیني تتنكر المصالح القومية و الحقوق اساسية للكادحين الاكراد). لە ڕۆژنامەی (طریق الشعب) لە ژمارەکانی ڕۆژی ٢٥،٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٤

٢٤٣- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٣٧٤

هاوسنووری سۆڤیەتەو خراپ بوونی پەیوەندییەکانیان بە زیانی هەردوولا کۆتایی دێت"[٢٤٤]

دوای سەردانەکەی سەرۆکو وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئێران لە کۆتایی مایسی ١٩٧٢، لە ١٦ی حوزەیرانی ئەو ساڵە بڕیاریدا بڕی ١٦ ملیۆن دینار تەرخان بکات بۆ کڕینی چەك بۆ شۆڕشی کورد"[٢٤٥]، ئەو کات بڕیاریاندا نوێنەری تایبەتی (جۆن کەنالی)[٢٤٦] بنێرن بۆ لای شای ئێران هەتا ئاگاداری بکاتەوە، کە نیکسۆنو کیسنجەر رازین هاوکاری کوردەکان بکرێ، ئێرانیش رێوشوێنی یەکەم وەجبەی هاوکاری بگرێتەبەر"[٢٤٧]

لە تەموزی ساڵی ١٩٧٢ ئیدریس بارزانیو مەحمود عوسمان سەفەری واشنتۆن دەکەن لە بارەگای CIA چاویان بە بەرپرسان دەکەوێت لەوانە: سەرۆکی ئەرکانی کۆشکی سپیو ریچاد کیندی یاریدەدەری کیسنجەر پێشوازی کردن"[٢٤٨]، بەرپرسی باڵای CIAزۆر بە روونی پێی وتوون، کە لە سەر داخوازی شا پارمەتیان دەداتو پێشوازیان

---

٢٤٤- ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٦٤

٢٤٥- بڕوانە: (ئەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٠٩" سرهنگ غلامر جانهانی: تاریخ بیستو پنج ساله ایران، ل٢٥٦" بەڵگەنامەی ژمارە "٦").

٢٤٦- جۆن کەنالی: لەو سەردەمە پارێزەری چەند کۆمپانیایەکی پەترۆڵ بووە لە ئێران، دواتر هەر لە سەردەمی نیکسۆن کرایە وەزیری کۆگا "الخزانە" بڕوانە: (هیکل، الحل و الحرب، ص١٢٥)

٢٤٧- المصدر نفسه

C I A-٢٤٨: کورتکراوەی (وکالەتی هەواڵگری ئەمریکا)یە، یەکێکە لە دەزگا هەرە بایەخدارەکانی ئەمریکا بۆ کاری هەواڵگریو بەرگری لە سیخوڕی بەکاردێت، ئەرکی ئەو دەزگایە بەدەستهێنانی زانیاری دەرەکییە لەگەڵ کۆکردنەوەو دابەشکردنی، هەروەها ئەو چالاکیە نهێنیانە ئەنجام دەدات، کە ئامانجی سیاسی بەدیدەهێنێت. بڕوانە: (الکیالی و الاخرون: الموسوعة السیاسیة، ج٦/ ص١٢٥-١٢٦)

لێدەکات[٢٤٩]، پێدەچێت سەرەڕای نیگەرانی ئەمریکا لە پێگەی سۆڤیەت، هاندانی ئێران بۆ کێشکردنی ئەمریکا بۆ دژایەتی عێراق و خۆماڵیکردنی نەوت عێراق لە یەکێ حوزەیرانی ئەو ساڵە کاریگەری هەبووبێت بە سەر بڕیاری ئەمریکی بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی کورد، ئەگینا بەو ڕەهاییە داخوازی ئێران بە تەنیا بەس نەبووە، هەروەکو لە قسەکانی کیسنجەر بەدیار دەکەوێت دەڵێ: ((ستراتیژمان ڕوون و ئاشکرا بوو، هەر وڵاتێك پەیوەندی بە یەکێتی شورەوییەوە هەبێت دەبێت لاواز بکرێت، .شورەوی پەیوەندی سەربازیانەی لەگەڵ عێراق بەست، ئیتر یارمەتیدانی کورد لە جێی خۆیدا بوو))[٢٥٠].

لە لای خۆیەوە ئێران نەیدەویست بە هۆی پرۆژەی ئێران و ئەمریکا دژی عێراق ئەو پەیوەندییە باشەی لەگەڵ وڵاتانی عەرەب هەیەتی تێکی بدات[٢٥١]، چونکە وەکو بەدەردەکەوێ ئەمریکا و ئێران هاوڕای سیاسی و هاریکاری سیاسیان هەیە، بەڵام بەشێکی بەرژەوەندیەکانیان لە پشتیوانی کورد و فشار بۆ سەر عێراق جیاوازە، هەردووکیان لە سەر ئەوە کۆکن، کە مەبەستیان ڕوخانی حکومەتی عێراق نییە، بەڵکو دەبێت فشاری بخرێتە سەر هەتا بۆ ئەمریکا دێتەوە بازنەی هاوپەیمانیەتی و بۆ ئێرانیش ناچار دەبێت دان بە خواستەکانیدا بنێت لە شەتولعەرەب.

لە راپۆرتەکەی (پایك) کورد وەکو (کارتی یاری)[٢٥٢] ناوی هاتووە، دیارە ئەمەش بۆ فشارخستنە سەر عێراق بۆ چارەسەری نیگەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

---

٢٤٩- راندال: کوردستان یان، ل٢٢٣

٢٥٠ -هەمان سەرچاوە، ل٢٢١

٢٥١ - گرێتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل ٢٧٤

٢٥٢- کارتی یاری: لە راپۆرتی پایك بە راشکاوی بۆ شۆڕشی کورد بەکار هاتووە. دەڵێ: (...ئەو بروسکەو یاداشتانەی دەگەیشتنە C.I.A گوزارشتیان لە تێڕوانینی هاوپەیمانەکەمان "مەبەست لە ئێرانە" دەکرد،

لە دوورخستنەوەی پێگەی سۆڤیەت لە عێراق، دەیانەوێت بە فشاری کورد عێراق ناچار بکەن هاوپەیمانیەتی ڕۆژئاوا لە جیاتی ڕۆژهەڵات قبوڵ بکات.

پێناچێ سۆڤیەت بەرنامەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردو فشار خستنە سەر حکومەتی عێراق هەبووبێ، بەڵام دوای واژۆکردنی هاوپەیمانیەتی لەگەڵ عێراق هەوڵیداوە دۆستایەتی خۆی لەگەڵ سەرکردایەتی کورد بپارێزێت، هەم پەیوەندی کوردو حکومەتی عێراقی تێك نەچێت، نەوشیروان مستەفا دەنووسێت: ((بۆ دووەمین جار دوای واژۆکردنی پەیمانی سۆڤیەت - بەعس کاربەدەستانی سۆڤیەتی لەگەڵ عەزیز شەریف سەردانی بارەگای بارزانیان کرد، داوایان لێکرد بروسکەی پیرۆزبایی بۆ کاربەدەستانی عێراقی لێبدا، بارزانی نەك هەر ئامادە نەبوو پیرۆزبایی بکات، بەڵکو ناڕەزایی توندی دەربڕی، چونکە پێی وابوو سەرەنجام ئەو پەیمانە دژی کورد بەکاردەهێنرێ، لە سۆڤیەت چەك وەردەگیرێو کوردی پێ لە ناودەبات))[253]، بەڵام پەیمانی عێراقی - سۆڤیەتی نەك هەر کێشەی کوردی پشت گوێ خستبوو، بەڵکو پاڵپشتی گەورەی ڕژێمی بەعس بووە،[254]، بە کردەوە هۆکاربووە بۆ پەشیمانبوونەوەی حکومەتی عێراق لە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار، بەڵام لەبەرانبەردا سۆڤیەت زۆر نیگەران بووە لەوەی سەرکردایەتی کورد چۆتە بەرەی ئێرانو ئەمریکا، جارێکی دیکە (ئەندریە گرۆمیکۆ) وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت لە مارسی ١٩٧٤ سەردانی بەغدای کرد، پرۆژەی ڕێککەوتنەوەی نێوان بەغداو بزاڤی کوردی هێنا بوو، بەڵام بارزانی

---

لە سەر ئەو ئەتەوەیە "مەبەست کوردە"، کە دەیویست وەکو کارتی یاری بەکاری بهێنێت لە ناکۆکی لەگەڵ دراوسێیەکەی "مەبەست لە عێراقە". بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٦).

٢٥٣- پەنجەکان، ل١٠٩

٢٥٤- علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٧٩

قبوڵی نەکردو بەمەش تاوانبار دەکرێت، کە لە ژێر فشاری ئەمریکاو ئێران قبوڵی نەکردوە"[255]. لە راستیدا هیچ ئاسۆ روونیەك نەبووە هەتا ناوبژیوانی سۆڤیەتی قبوڵ بکات، هەر لەو ماوەیەدا (حشع) نەك هەر بە پشتگیری سۆڤیەت، بەڵکو بە فشاری ئەویش چووە بەرە لەگەڵ حیزبی بەعس، کەچی لەوکاتەی بەعس تەنگی بە شیوعیەکان هەڵچنی بوو، یەکیەتی سۆڤیەت هەڵوێستی نەبووە، ئەگەر کوردیش لە سەر قسەی سۆڤیەت بچووبایە بەرە لەگەڵ بەعس‌و بە ئۆتۆنۆمی رەمزی رازی ببوایە، لە هەموو حاڵەتێکی پەشیمان بوونەوەی بەعس، سۆڤیەت هیچ هەڵوێستێکی بە هێزتری لێ چاوەڕوان نەدەکرا، ئەوان پێش بەستنی رێککەوتن لەگەڵ بەعس (ئێچکن) لیپرسراوی کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوەیان ناردە لای بارزانی، لەوێدا زەمانەتی ئەوەیان نەدابوو کە بەعس باشە، بەڵام رێککەوتن لەگەڵ بەعسیان لە ئێران پێ باشتر بووە"[256]

پوختەی ناکامی مەیلی یەکیەتی سۆڤیەت ئەوە دەگەیەنێت، کە مەبەستی لە پڕچەك کردنی عێراق بۆ دژایەتی کورد نەبووە، گەرچی هەموو ئەو چەك‌و تەقەمەنیەی لە سۆڤیەتی وەرگرت بێجگە لە وێرانکردنی کوردستان‌و کوشتن‌و لە ناوبردنی کورد لە هیچ شەڕێکی دیکەی بەکارنەهێنا. پێناچێ سۆڤیەتیش لەمە بێئاگا بووبێت، کە حکومەتی عێراق بێجگە لە شەڕی کوردستان شەڕی دیکەی بەدەستەوە نەبووە، بەڵام خەونی خەیاڵیانەی سۆڤیەت لەمە دابووە، کە ئومێدی گەورەتری لە سەر رژێمی

255-سورية عوني: الاكراد، ص169

256- ئەرشیان مستەفا: پەنجەکان، ل 109

بەعس هەڵچنی بوو، کە پێی وابووە بە هۆی گەشەی ناسەرمایەداری عێراق بەرەو سوشیالیزمی دەچێت"[٢٥٧].

ئەگەرچی پەیمانی عێراق‌و سۆڤیەت شای ئێرانی زۆر نیگەران کرد، پێی وابوو ئەمە دژی ئێران کراوە[٢٥٨]، بەڵام رابەدیاردەکەوێ خەمی یەکەمی ئێرانی لەو هاوپەیمانیەتیە بەهێز بوونەوەی عێراق بێت بۆ ئاستێك ئێران نەتوانێ فشاری بخاتە سەر بۆ دابینکردنی خواستەکانی لە شەتولعەرەب‌و کەنداو، ئەگینا لە ناو بەشدارانی هەردوو کۆمەڵەی ناکۆك، ناکۆکی ئێران لەگەڵ سۆڤیەت دەبێتە پلە دوو، ئەمریکا لەگەڵ سۆڤیەت دەبێتە پلەیەك.

خواستی سۆڤیەتی لە عێراق‌و کەنداو‌و پەیڕەوکردنی (بنەماکانی نیکسۆن)[٢٥٩] بووە لە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی رۆژئاوا، کە شۆڕشی کوردی خستە نێوان دوو ماشەوە، دیارە ئەمە بەبێ ئارەزووی سەرکردایەتی کورد خۆی ناکرێت، لەگەڵ

---

٢٥٧-- ئەو بە تەنیا بڕوای شیوعیەکانی عێراق نەبووە، سۆڤیەتیش هەمان باوەڕی هەبووە. بەهائەدین نوری دەڵێ: (ئەمە بۆچوونی سۆڤیەت بووە، هەتا هەمان ئەزموونی کوریای باکوور یەمەنی باشوور لە عێراقیش دووبارە بێتەوە، کە شۆڕشی سوشیالستی لەو دوو وڵاتە لە حکومەتەوە راگەیەنرا). دیداری ئاوێراو، رۆژی ٢٠٠٦/٩/١٨" جەمال نەبەز: ئیدلۆژیای هوردە بورژوای مارکسی کورد، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٨، ل٥١

٢٥٨- دریە عونی: الاکراد، ص ١٦٦

٢٥٩- بنەماکانی نیکسۆن: بە کۆمەڵێك گرێبانکاری‌و مومارەسەی سیاسەتی ئەمریکی سەردەمی سەرۆکی ئەمریکا نیکسۆن دەوترێت، لە گواستنەوەی پێشوکێی دەولی بۆ ئلیاو ئەورووپا، دوورکەوتنەوە لە شەڕی راستەوخۆ لەگەڵ سۆڤیەت‌و بەکارهێنانی دەستەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەراست بۆ بەرژەوەندی ستراتیژیەتی ئەمریکا. بڕوانە: ارانداڵ: کوردستان یان، ل٢١٤" الکیالی و الاخرون: موسوعە السیاسیە، ج٦/ ص٦٥٧).

هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان شۆڕشی کوردو سوپای عێراق، بەلێکدانەوەی هەموو تەوەرەی خواستو ستراتیژیەتی لایەنە بەشدارەکانو پێشبینیەکان لە دوو ئەگەر بەدەر نابێ ئەوانیش:

هەردولا بێئومێد بن لە ناکامی بەردەوامی شەڕو پەنابردنەبەر دانووسانو رێککەوتن، یان شەڕ فراوان بێت بۆ نێوان عێراقو ئێرانو لەوێشەوە بۆ شەڕی راستەوخۆی هەردوو بلوکی خۆرهەلاتو خۆرئاوا.

ئەگەری یەکەم لە هەموان نزیکتر بووە، چونکە خواستەکانی لایەنە بەشدارەکانی دەرەوەی (شۆڕشی کوردو حکومەتی عێراق) روونە، ئەگەر ئاگربەستی تازە دروست بێت شەڕ فراوان نابێت، گرێدانی بەدەستهێنانی مافە رەواکانی کوردو رێڕەوی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستانی عێراق لەگەڵ هیچ کام لەو لایەنانە یەکانگیر نەبووە، لەوان ویستوویانە لە بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بهێنن یان هیچ نەبێت زیانلێکەوتوو نەبن لە بەشداری لەو ناکۆکیە.

لە دوای چوار ساڵ نە شەڕو نە ئاشتی، لە سەرەتای نیسانی ساڵی١٩٧٤ سەر لە نوێ شەڕی نێوان شۆڕشی کوردستانو حکومەتی عێراق دەستی پێکردەوە، لە راستیدا خۆسازدانی دیبلۆماسیو سەربازیو ئابووری لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٧٢ەوە بە رێژەی جیا لایەنە بەشداربووەکانی هەردوو بەرەی گرتبۆوە، هەروەها دەستپێکردنەوەی شەڕی ئەمجارە لە رووی دیبلۆماسیەوە مەودایەکی فراوانتری وەرگرتبوو.

شەش مانگی یەکەمی شەڕ، یارمەتی سۆڤیەتی بەرچاو دیار بوو بۆ حکومەتی عێراقی، لە بەرانبەردا ئێران بە چەلەو تفاقی شەڕ یارمەتی کوردی داوە بارودۆخی شەڕ بە ئاراستەیەك بوو لە مانگی ١٩٧٤ بارزانی ناچار بوو داوا لە ئێران بکات

سنوورەکانی لە بەردەم پەناهەندەی کورد بکاتەوە[260]. پێشتر ئەگەر ئەو دیدە هەبوویێت، کە ئێران لە نێوان ئەوانو ئەمریکا دایە بۆ گەیاندنی یارمەتییەکان[261]، کەچی ئێستا بەرەو رووی گرتنی پەناهەندە بۆتەوە، پێی وابووە ناچارە ئێران وەکو هاوپەیمانی سەرەکی بناسێ، دیارە ئەمە یەکەم خواستی ئێران بووە هەتا زیاتر شۆڕشی کورد بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیو لە کاتی پێویست وەکو بارمتە مامەڵە لەگەڵ پەناهەندەکان بکات. هەتا بەهاری ساڵی ١٩٧٥ ژمارەی پەناهەندەی کورد لە ناو خاکی ئێران گەیشتە نیو ملیۆن کەس[262]، ئەمەش پێدەچێ لە سەرەتاوە خواستی ئێران بووبێ.

لە شەش مانگی دووەم شەڕەکان چڕترو سەختر بوون، سۆڤیەت یارمەتییەکانی بۆ عێراق چڕتر کردنەوە[263]، لە بەرانبەردا شای ئێران لە هەوڵی سیاسەتی گەمارۆی هەردوولا (الاحتواء المزدوج) دابوو، لە لایەك یارمەتی کوردی دەدا، لەلایەکی دیکە لە هەوڵی دیبلوماسیدا بووە بۆ بەدەستهێنانی خواستەکانی لەگەڵ عێراق[264].

لە مانگەکانی تشرینی یەکەم بە دواوە، سەرکردایەتی کورد بە رەسمی داوای لە ئێران کرد، بە چەکی قورس یارمەتی بدات، هەتا گەیشتە ئەو رادەیەی چاودێرێك ئاماژە بەوە بکات، کە ئێران ڕاستەوخۆ سەرکردایەتی شەڕەکانی دەکرد[265]، یارمەتی ئێران سەرەڕای وەرگرتنی پەناهەندەکانو دابینکردنی شوێنی حەوانەوەیان، ئاسانکاری بۆ

---

٢٦٠- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٩

٢٦١- دریه عونی: الکراد، ص ١٦٩

٢٦٢- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٩ خۆشناو: مەسەلەی کوردو، ل١٧٧

٢٦٣- بڕوانە باسی دووەمی ئەم بەشە.

٢٦٤- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢١٠

٢٦٥- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٤

گەیاندنی یارمەتیەکانی دەرەوە بۆ ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش، ئاسانکاری بۆ پەیوەندی کردنی سەرکردایەتی کورد بە دەرەوە، رێگەدان بە رۆژنامەنووس و وەفدی دەرەوە بۆ لای سەرکردایەتی کورد و بەرەکانی جەنگ، هەموو یارمەتیەکی لۆجستی خستبووە خزمەت سەرکردایەتی کورد، لە تۆپ و دژە تانک و دژە ئاسمانی، بە بەشداری مەیدانی شارەزاو پسپۆڕ و بەکارهێنانی چەکی قورس و بێتەڵ و دابینکردنی ئازوقەو ..هتد[٢٦٦]، یارمەتیدانی ئێرانی گەیشتبووە ئەندازەیەك، ئێران هەست بکات کوردەکان بەم یارمەتی دانە بگەنە سەرکەوتن، بەم پشتیوانیە زۆرەی لە ئامانجی خۆی دوور کەوتۆتەوە لە فشار خستنە سەر عێراق[٢٦٧]، لەلایەکی دیکەوە کار گەیشتە ئەوەی بەپرسانی (پ.د.ك) دوای نووشستی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٧ ئاماژە بەوە بکەن، کە پشت بەستن بە دەرەوە بۆتە یەکەم رێگار پشتبەستن بە ناوەوە ببووە پلەدوو، یان یارمەتی و هاوکاریە دەرەکییەکان بەبێ هیچ زەمانەتێکی سیاسی رۆژ بە رۆژ زیادی کردووە، سەرکرایەتی نەیدەتوانی گۆڕانکاریە تازەکانی ئاستی دەولی تێبگات، کە کاریگەری راستەوخۆیان بە سەر واقیعی شۆڕشی کوردستانەوە هەبووە[٢٦٨]، سەرەنجام هەتا شەڕی نێوان شۆڕشی کوردستان و حکومەتی عێراقی مەودایەکی بەرفراوانی وەردەگرت و هەوڵە ژێربەژێرییەکان بۆ پێکهاتنەوەی عێراق - ئێران بەرەو پێش دەچوو.

کاریگەری ناکۆکیە دەرەکییەکان لە ماوەی شەڕی یەك ساڵە لای (حشع) ئەندام لە بەرەیی نیشتیمانی لەگەڵ بەعس شێوەی ئایدۆلۆژی کوێرانەی ناواقیعی وەرگرتبوو،

---

٢٦٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٨٤

٢٦٧- امین هویدی: کیسنجر و ادارة الصراع الدولي، ص٧٧" دانشجوان پیرو امام، اسناد لانە جاسوسی – کوردستان (٢)، شمارە (٣٢)، ل٥١

٢٦٨- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الحزب الدیمقراطي الكردستاني، اللجنة التحضیریة، تقیم مسیرة الثورة الكردیة انهیارها والدرس و العبر المستخلصة منها، ص٦٢-٦٣)

نەوشیروان مستەفا دەنووسێ: ((لە گەرمەی جەنگی کوردستان "حشع" پەیڕەوی بێ چەندو چوونی لە سیاسەتی سۆڤیەتی دەکرد، هەم بە چەلەو هەم بەرێگەی سیاسەتی پروپاگەندە بە توندی دژی بزوتنەوەی کورد راوەستا))[269]. پێدەچێ لای (حشع) مادام بەعس لەلایەن یەکیەتی سۆڤیەتەوە پشتگیری دەکرێت، لە بەرەی خەباتی گەلانی پێشکەوتنخوازە، بەمەش شۆڕشی کوردستانیش تەواو پێچەوانەیە.

لە ١٢/٢/١٩٧٤ عێراق یاداشتنامەیەکی لە سەر دەستدرێژی ئێران بۆ سەر سنوورەکانی عێراق بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان نارد[270]. ناردنی ئەو یاداشتنامەیە زیاتر پەیوەندی هەبووە بە سنووربەزاندنی ئێرانی لە ناوەڕاست و خواروو، بەڵام وەڵامی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ناردنی نوێنەری تایبەتی لە ٣/٤/١٩٧٤ بووە بۆ عێراق و لە ١٠/٤/١٩٧٤ بۆ ئێران بۆ راوێژکردن لە سەر ناکۆکیەکانی نێوانیان. لە سەر بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش بە ژمارە (٣٤٨)ی ٢٨ی مایسی ١٩٧٤، کە دەبێت کۆبوونەوەی هەردوو وڵات بەردەوام بێت[271]، ئەم هەوڵانەی ئەنجومەنی ئاسایش دەکەوێتە سەرەتای سەرهەڵدانەوەی شەڕی یەك ساڵەی شۆڕشی کوردو بەعس، وا بەدیار دەکەوێ ئەویش بوویێتە بەشێکی کۆنووسی کۆبوونەوەی نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ هەردوو وڵات.

---

٢٦٩- پەلەکان، ل١١١. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: رۆژنامەی (طریق الشعب) ژمارەکانی رۆژی (٢٨/٤/١٩٧٤، ٢٥/٩/١٩٧٤، ٢٤/١٠/١٩٧٤، گۆڤاری (الثقافة الجديدة) ژمارەکانی ٥٨ی ئازاری ١٩٧٤، ٦٠ی نیسانی ١٩٧٤، راپۆرتی کۆبوونەوەی ئاسایی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عیراقی لە ٢١/٢/١٩٧٥

٢٧٠- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢١٥

٢٧١- المصدر نفسه، ص٢١٧

گفتوگۆی راستەخۆ بۆ ناوبژیوانی نێوان عێراقو ئێران لە مانگی ئابی ١٩٧٤ەوە دەستی پێکرد، نەتەوەیەکگرتووەکانو ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت دەستپێشخەری ناوبژیوانی بوون، بەڵام بە بەشداری گەرمیهەندی وڵاتی عەرەبی لەو ناوبژیوانییە، لە سەر بڕیاری ژمارە ٣٤٨ی ئەنجومەنی ئاسایش بۆ بەردەوام بوونی وتووێژەکان، وەفدی عێراقو ئێران بەسەرۆکایەتی سەعدون حەمادی وەزیری دەرەوەی عێراقو عەلی خەلعەتبەری وەزیری دەرەوەی ئێران[٢٧٢] لە رۆژانی ١٢-١٨ی ئابی ساڵی ١٩٧٤ لە ئەستەنبوڵ کۆبوونەوە، لەوێدا بیروڕایان ئاڵوگۆڕ کرد لەگەڵ درێژەدان بە کۆبوونەوەی دووقۆڵی، هەر لە سەر بڕیاری کۆبوونەوەی ئەستەنبوڵ لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ وەزیری دەرەوەی هەردوو وڵات لە نیویۆرك کۆبوونەوە، رێککەوتن بەو نزیکانە دووبارە کۆببنەوە[٢٧٣]، لە گەرمەی شەڕەکانی نێوان شۆڕشی کوردو سوپای عێراق، شای ئێران لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٧٤ سەردانی مۆسکۆی کرد، یەك لە بابەتەکانی گفتوگۆی شا لەگەڵ مۆسکۆ لە سەر مەسەلەی بە ئاشتی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی شا بووە لەگەڵ عێراق[٢٧٤]

لە زستانی ساڵی ١٩٧٤ لە نیویۆرك هنری کیسنجەر وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ نوێنەری هەمیشەیی عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبۆوە بۆ ئەوەی ئالیەتێك دابنێن بۆ باشکردنی پەیوەندییەکانیان[٢٧٥]، لەگەڵ دوورخستنەوەی پێگەی سۆڤیەتیو ئاسایشی کەنداوو ناردنی نەوت بۆ رۆژئاوا

---

٢٧٢- الخرسان: التيارات السياسية، ص٢٢٣" منهوچر پارسادۆست، ناکۆکی ئێران – عێراق، و/موحسین علی ئەکبەر، چ١، سلێمانی ١٩٩٦، ل٥١.

٢٧٣- منهوچر پارسادۆست، ناکۆکی ئێران – عێراق، ل٢١٧-٢١٨

٢٧٤-نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١١١

٢٧٥- خۆشناو: مەسەلەی کورد، ل٤١٣

هەموارکردنی هەڵوێستی عێراق لە کێشەی فەلەستین لـە چوارچێوەی مەرجـەکانی ئـەمریکی، (غـانم عەبدولجـەلیل) سـکرتێری تایبـەتی سـەدام حوسـێن و ئەنـدامی سـەرکردایەتی حیزبی بەعس بە نهێنی وتووێژەکانی لەگەڵ ئەمریکا تەواوکرد. هەروەها ئاماژە هەیە، کیسنجەر بە نهێنی بۆ ماوەی ٢٤ سەعات سەردانی یەك لـە پایتەختـە عەرەبیەکانی کردبێت، لەگەڵ سەرکردەکانی بەعس بە نهـێنی کۆبووبێتـەوەو بنـەمای ڕێککەوتننامەی جەزائیری دانابێت[٢٧٦].

ئەو کۆبوونەوانەی لە نێوان عێراق و ئێران، یان ئێران و سـۆڤیەت یـان ئـەمریکاو عێراق ئەنجام دراون، ئەم چەند خاڵەی وەکو تێبینی لێ وەردەگیرێت:

یەکەم: کۆبوونەوەکان بە نهێنی ئەنجام دراون، یان هـیچ نـەبێت نـاوەڕۆکی ئاشـکرا نەکراوە، ئەمـەش ئەستەم بووە بۆ سەرکردایەتی کورد لە ئاکامەکانی تێ بگات.

دووەم: کێشەی کورد و شەڕی شۆڕشـی کوردسـتان لەگـەڵ حکومـەتی بـەعس لـە ئەرزی واقیع بەشێکی گرنگ بووە لە هاوکێشەکەی سەربازی، بەڵام لە ڕووی سیاسـیەوە نەهێنراوەتە گۆڕێ و پێنەچێ وەکو پاشکۆو پـەراوێزی ئاکۆکیـەکانی دیکـە مامەڵـەی لەگەڵ کرابێت، ئاکامی کۆتایش ئەوەی سەلماند.

سـێیەم: لە هەنگاوەکانی ساڵی ١٩٧٤ بەشداری عەرەبی بـە پلـەدوو دێـت، بـەڵام لەگەڵ ساڵی تازە ١٩٧٥ ڕۆڵی عەرەبی لەو بارەیەوە گەرم و گوڕ دەبێت، بە تایبـەت لـە دوای دوا دیداری نێوان وەزیری دەرەوەی عێراق و ئێران لە دەرەوەی ناوچەی عەرەبی، کە لە ١٦تا ٢٠ /١/١٩٧٥ کە لە ئەستەنبول ئەنجام درا.

چوارەم: بە هۆی ئاکامەکانی شەڕی ئۆکتۆبـەری سـاڵی ١٩٧٣، بـەو خرتندنـەوەی سوریا دژی ئاشتی عەرەب و ئیـسرائیلەو سادات لەگەڵ ئاشتی دابووە، عێـراق و سـوریا

٢٧٦- حامید محمود عیسی: القضیة الکردیة، ص١٠٢

ئەوكات ناكۆك بوون، چونكە ئاماژە هەیە بەوەی ئەمریكا پێی خۆش بوو عێراق لە كۆڵ شەڕی كوردستان بێتەوەو دەستی بە تاڵ بێت بۆ ناكۆكی لە گەڵ سوریا"[277]

لە ئاستی ناوخۆ لەگەڵ كۆتایی ساڵی ١٩٧٤و سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ شەڕەكان بەرەو سەختی چوون، هەردوو دەوڵەت نەیانویستوە پێكەوە بكەونە شەڕەوە، بۆیە بەبێ ئاگاداری بارزانی كەوتوونەتە گفتوگۆ"[278]. دیارە سەدام حوسێن لە ساڵی ١٩٧٤ ئامادەنەبوو لەگەڵ شا ڕێك بكەوێ، چونكە وای دەزانی بە یارمەتی سۆڤیەت دەتوانێ خەونەكانی بۆ زاڵ بوون بە سەر شۆڕشی كورد بەدی بهێنێت"[279] . گوایە كیسنجەر لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٧٥ لە شاری (زوریخ) لە كۆتایی گەشتەكەی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شای بینیوە، ئاگاداری كردۆتەوە، كە ئارەزووی هەیە لەگەڵ سەدام حوسێن گفتوگۆ بكات"[280]، (الخرصان) لەو بارەوە دەنووسێ: ((لەوكاتەی بارزانی لە تاران بووە شا بەرەو سویسرا چووە لە شاری زوریخ چاوی بە كیسنجەر كەوتووە، دوایی خێرا گەڕاوەتەوە هەتا بە پەلە خۆی بۆ كۆبوونەوەی جەزائیری ١٩٧٥/٣/٤ ئامادە بكات))"[281]، پێدەچێ ئەو هەواڵە دروست بێت، چونكە بارزانی لە ٢٦ی شوباتەوە بانگهێشتی ئێران كراوە شا لە ئێران نەبووەو دوای گەڕانەوەی لە جەزائیر لە ١١/٣/ بارزانی دیوە.

---

٢٧٧- هویدی: كیسنجر و ادارة الصراع الدولي، ص٧٧" كۆیشنەر دیشنەر: كورد گەلێكی ، ل٣٢٣ " محمد شیخ ئەحمەد، كوردستان لە ڕێككەوتننامە نێودەوڵەتیەكاندا، گۆڤاری (هەڵوێستی نیشتیمانی)، ژ ٢، نیسانی ١٩٩٧، ل١٧

٢٧٨- تریب: صفحات من تاریخ، ص٢٨٣

٢٧٩- جەبار قادر: چەند بابەتێكی مێژووی كورد، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٧٨

٢٨٠- سەروەر عەبدولڕەحمان: یەكیەتی نیشتیمانی كوردستان (١٩٧٥-١٩٧٦)، سلێمانی ٢٠٠٢، ل٤٩

٢٨١- التیارات السیاسیة، ص٢٢٦.

شانشینی سعودیه هاندەری پێکهاتنەوەی هەردوو دەوڵەت بووە، هەتا بە گفتوگۆ ناکۆکیەکانی نێوانیان چارەسەر بکەن[282] شای ئوردون شاحوسێن[283] و ئەنوەر ساداتی سەرۆکی میسرو هەواری بۆمدیەن سەرۆکی جەزائیر[284] ڕۆڵیان هەبووە لە ئاوبژیوانی هەردوو وڵات، بەڵام پوختەو دوا هەنگاوی پێکهێنانەوە بۆمدیەن تۆماری کرد.

شا لە ڕۆژی ٦/١/١٩٧٥ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ سەردانی (عەممان)ی پایتەختی ئوردونی کرد، لە ٨/١/١٩٧٥ سەردانی میسری کرد، هەموو ئەم سەردانانە بۆ مەبەستی پەرەپێدانی ڕۆڵی ناوبژیوانی عەرەبی بووە[285]، کە خوێندنەوەی سەرکردایەتی کورد بۆ ئەو جموجۆڵانە دیار نییە.

هەواری بۆمدیەن پێشتر لە کاتی کۆبوونەوەی وڵاتانی (ئۆپیک)[286] لە ٢٦/١٠/١٩٧٤ لەگەڵ سەدام حوسێن بۆ نەخشەی پێکهێنانەوەی عێراق و ئێران بۆ

---

٢٨٢- حبیب محمد کریم: تأریخ الحزب الدیمقراطي الکردستاني، ص١٣٨

٢٨٣- شا حوسێن: کوڕی عەلی شەریفی مەککەیە، لە ساڵی ١٩٦٥ دوای باوکی بووەتە پادشای ئوردون، جۆرێك لە هاوسەنگی ڕاگرتووە لە نێوان ناکۆکیە ئیقلیمیو عەرەبیەکاندا، لە ساڵی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کردووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الکیالي: موسوعة السیاسیة، ج٢، ص٥٤١-٥٤٢" www.wikipedia.org)

٢٨٤- هەواری بۆمدیەن: ساڵی ١٩٤٢ لە ڕۆژهەڵاتی جەزائیر لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٥٥ەوە پەیوەندی کردووە بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی جەزائیرەوە، لە سوپادا گەیشتۆتە سەرۆکی ئەرکانو وەزیری بەرگری، لە ساڵی ١٩٦٥ لە ڕێگەی کودەتای سەربازیەوە بۆتە سەرۆکی جەزائیر، لە ٢٧/١٢/١٩٧٨ مردووە. بڕوانە: (الکیالي والاخرون: موسوعة السیاسیة، ج٧/ ص١٦١-١٦٢" www.wikipedia.org)

٢٨٥- فوئاد کەریم: لە یادی ٢٤ ساڵەی پەیمانی شومی جەزائیر، ل٢١

٢٨٦- ئۆپیك: ڕێکخراوی ئەو وڵاتانەیە کە نەوت دەنێرنە دەرەوە، لە ساڵی ١٩٦٠ لە بەغدا دامەزراوە، وڵاتانی دامەزرێنەر بریتین لە: کوێتو عێراقو ئێرانو فەنزوێلا. ئامانجی دیاریکردنی نرخی نەوتو

مەبەستی ڕێگە خۆش کردن بۆ پێکهاتنەوە کۆبۆوە. دواجار لە پەراوێزی کۆبوونەوەی دەوڵەتانی خاوەن نەوت (ئۆپیک) لە ١٩٧٥/٣/٦ هەواری بومدیەنو شای ئێرانو سەدام حوسێن بە کۆبوونەوەیەکی لاوەکی کۆتاییانپێهێناو لە ڕێککەوتننامەی جەزائیردا یەکیان گرتەوە.

ئەو ڕێککەوتننامەیە تایبەت نەبوو بە یەکلاییکردنەوەی ناکۆکییەکانی چەند ساڵەی عێراقو ئێران، بەڵکو سەودایەکی هەردوو دەوڵەت بوو لە سەر حیسابی کورد، خاڵی ناو بەرانبەر تواندنەوەی شۆڕشی کورد.

بە گەڕانەوە بۆ هۆکاری بەشداری هەریەك لەو وڵاتانەی ڕۆڵیان لە سازدانی قۆناغەکانی ناوبژیوانی عێراقو ئێراندا بینی دەگەینە ئەو چەند خاڵەی خوارەوە:

یەکەم: سەرەتای کۆبوونەوەی نوێنەری هەردوو وڵات لە سەر بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان بووە، ئەویش بۆ بەپێوەچوونی سکاڵای عێراق، هەڵبژاردنی تورکیا بۆ یەکەم کۆبوونەوەی هەردوو وڵات وا سەرێنی نەبووە، تورکیای هاوپەیمان بە بلۆکی ڕۆژئاواو هاوهەڵوێست لەگەڵ عێراقو ئێران بە دژایەتیکردنی بەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد ناسراوە، لەو کۆبوونەوەیەدا ناتوانرێت قسە لە سەر پێکهاتنەوەی عێراقو ئێران بکرێت بە بێ قسە کردن لە سەر لە ناوبردنی شۆڕشی کوردستانی عێراقو بێبەشکردنی کورد لە سوود وەرگرتن لە ناکۆکی نێوان سێ وڵاتە سەرەکییەی کوردیان بە سەردا دابەشکراوە.

دووەم: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ویستوویەتی عێراق لەو شەڕە دەستی بەتاڵ بێت بۆ دژایەتی سوریا، هەتا پرۆسەی ئاشتی عەرەب لەگەڵ ئیسرائیل

---

چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی لە باری بازاڕی فرۆشتنی نەوتەوە ڕووبەڕووی وڵاتانی ئەندام دەبێتەوە. بڕوانە: (الكيالي والاخروون: موسوعة السياسية، ج١/ ص٣٧٩-٣٨٠)

سەربگری، کە سوریا ئەوکات دژی لێك جیاکردنەوەی هێزەکانی عەرەبی و ئیسرائیلی بووە[287]. سۆڤیەتیش دەیویست هاوپەیمانی عێراق بێت و جولانەوەی کوردستانیش چیدیکە بەرەو ئەمریکا نەچێت، یان بە واتایەکی دیکە ناوچەکە بەرەو دەستێوەردانی ئەمریکاو ئیسرائیل نەڕوات[288]. لە سەرەتاوە ئەوە روونکرایەوە، کە هەردوو وڵاتی زلهێز نەیانویستووە درێژەدانی شەڕ لە سیمای شەڕی سارد تێپەڕێت بۆ بەشداری راستەوخۆی هەردوولا لە شەڕی گەرم.

سێیەم: وڵاتانی عەرەبی هەریەك بە خواستی جیا دەیویست شەڕ بوەستێ و هەردوولا پێك بێن، ئەمە لە کاتێکدا وڵاتانی عەرەبی قورسایی گەورەیان هەبووە لە ناو رێکخراوی نزیك، کە لە پەراوێزی کۆبوونەوەی ئەو رێکخراوەش هەردوو وڵات بە یەکگەیەنراون[289]. لە کاتێکدا ئوردون لە سەرەتاوە بە هاریکاری ئەمریکی و ئێرانی و کورد خۆشحاڵ بووە[290]، چونکە لەو سەدارە خولاوەتەوە. گەرچی پێشوەخت میسر ویستوویەتی لە رێگەی باڵوێزەکەیەوە لە بەیروت کورد ئاگادار بکاتەوە لە ئەگەری لێك نزیکبوونەوەی عێراق و ئێران و باسی کورد لەو گفتوگۆیانەدا[291]، بەڵام سادات

---

287- ژیرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلیکی، ل٣١٢" صالح ملا عیسی: بحران افرینی، ص٩٢" نەجات حەمید ئەحمەد: گەڕانەوە بۆ جەزایەر یا دەستخۆشی لێکردنی جەزایەر. گۆڤاری گوڵان، دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی گوڵان. ژ(٢٧٠) ی ١٥ی ئازاری ٢٠٠٠، ل٢٤

288- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و، ل٢٩٠" محمد شێخ ئەحمەد: کوردستان لە رێککەوتننامە دەوڵەتیەکاندا، ل١٨

289- دیداری جەلیل گادانی لە رۆژی لە ٢٠٠٧/١/٦ لە شاری کۆیە.

290-خەرەیدون عەبدوڵڵا: بارودۆخی سیاسی کوردستانی عێراق، ل١٠٠

291- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و، ل ٣٨٩" فوئاد کەریم: لە یادی ٢٤ ساڵەی پەیمانی شومی جەزائیر، ل٢١

پێشتر بە هۆی ڕێککەوتنی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل تووشی گلەیی و گازاندەی شەقامی عەرەبی ببوو، حەزی کردووە عێراقیش بکەوێتە خاڵێکی سازشەوە، هەتا سازشی حکومەتی میسری لە بیر بکرێت[292]

لە سەر گەرم و گوڕی هەواری بومدیەن چەند هۆیەك باس دەکرێت لەوانە: گوایە جەزائیر ترساوە لە ئاکامەکانی درێژەکێشانی شەڕی ناڕاستەوخۆی یەکیەتی سۆڤیەت و ئەمریکا دەریای سپی ناوەڕاست ببێتە مەیدانی ناکۆکی[293]، دووەمیان، گوایە تیتۆی سەرۆکی ئەوکاتەی یوگسلافیا هەواری بومدیەنی هانداوە لە سەر پێکهێنانەوەی عێراق و ئێران ئەو ڕۆڵە بگێڕێت[294]، یان ئەو بۆچوونەی (دریە عونی) کە دەنووسێ: ((جەزائیر لە مەودای سەرکەوتنی کورد دەترسا، نەبادا گەیشتنی کورد بە مافەکانی لە چوارچێوەی عێراق هاندەر بێت بۆ (بەربەر)[295] لە هەرێمی قەبائیل لە جەزائیر، ئەوانیش داوای هەمان ماف بکەن، کە کورد داوای کردووە))[296]، پێدەچێ هۆکاری ئابووری لە هەموو بۆچوونەکانی دیکە نزیکتر بێ، کە پشتبەستن بە ڕاپۆرتی هەواڵگری

---

٢٩٢- ئیبراهیم جەلال: خولرووی کوردستان و، ل٣٩٠

٢٩٣ حەمان سەرچاوە، ل٣٩٠

٢٩٤-دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٩١

٢٩٥- بەربەر: دانیشتوانی کۆن و ڕەسەنی جەزائیر و مەغریبی عەرەبی و کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستن، پێیان دەوترێت ئەماغیزی، سیمای نەتەوەیی تایبەت بەخۆیان هەیە. لە جەزائیر دەکەونە بەشی باشووری ئەو وڵاتە. لە مافی فەرهەنگی و کەلتووری نەتەوەیی بێ بەشکراون. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ابراهیم ابن سليمان الاحيدب: اقليم الصحراء الكبرى، البحث في الموسوعة الجغرافية في العالم الاسلامي، المجلد ١١، ط٢، الجامعة امام محمد بن سعود الاسلامية، ١٩٩٩، ص٤٨-٤٩، ناونیشانی ئەلیکترۆنی:wikipedia.org.

٢٩٦- الاكراد، ص١٦٧

ئەمریکی دەڵێ: بومدیەن پێویستی بە پشتگیری دارایی هەردوو وڵات هەبووە بۆ دانانی پرۆژەیەکی ئابووری پەیوەست بە پەرەپێدانی بەرهەمی نەوتی خاو[297]، یان بومدیەن دەیویست هەردوو وڵات پێك بهێنێتەوە، پێکەوە سێگوچکەیەکی بە هێزین لە ناو رێکخراوی (ئۆپیك)[298]، لێرەدا سەرچاوەی زیاترو تایبەتتر بەو مەسەلەیە لە بەردەستدا نیە، هەتا بزانین کام هۆکار زیاتر سەرۆکی جەزائیری هاندابێت ئەو ناوبژیوانیە بکات، ناوی بۆمدیەن وەکو ناوبژیوان و سەرپەشتیار لەگەڵ دەقی رێککەوتننامەکەدا بێت، لە دوایی سێ پرۆتۆکۆڵی پاشکۆی رێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوان وەزیری دەرەوەی هەردوو وڵات بە سەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی جەزائیر واژۆبکرێت[299]. ئەم هەنگاوەی دەماغاتە ژێر باری وەڵامی ئەو پرسیارەوە کە بۆچی سەرۆکی جەزائیر ئەو کارەی گرتە ئەستۆ، شوێنی کورد لە کوێی هۆکارەکانی ئەو جدیەتەی (بۆمدیەن)ەوەیە.

لەلایەکی دیکەوە ئەندامانی رێکخراوی دەوڵەتانی (ئۆپێك)یش ئەو هەنگاوەیان بە سەرکەوتنی خۆیان دەزانی، عێراقیش لەلای خۆیەوە پێی رابووە بە قبوڵکردنی رێککەوتننامەی جەزائیر مەترسی شەڕی عێراق _ ئێرانی لە خۆی دوور خستۆتەوە، لە ئەگەری دەستێوەردانی ئەمریکای لە کەنداو دەربازی بووە، یەکێتی دەوڵەتانی ئۆپیکی پاراستووە[300]، بەڵام ئەمانە هەمووی دڵدانەوەی سەرکردەکانی بەعس و نووسەرەکانیەتی بەو بیانوانە بۆ لە دەستدانی شەتولعەرەب سازش دەهێننەوە.

---

297- ايوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية و صراع القوى، ص٥٨٠-٥٨١

298- فەرەیدون نووری: بزاڤی بارزانی، ل٣٨٥

299- بۆ دەقی رێککەوتننامەو هەرسێ پرۆتۆکۆڵ بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٢، ٣).

300- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢١

بە هەر شێوەیەك بگەڕێین بە دوای ئەو فاکتەرانەی هەریەك لە دەوڵەتانی ناوبژیوانی هانداوە عێراق و ئێران پێك بهێنن، دەگونجێ بەشێکی راست بێت یان زۆربەی فاکتەرە راستەقینەکان پێك بهێنن، بەڵام مەرج نیە لێرەدا هەموو فاکتەرەکان خرابنەڕوو.

## بەشی دووەم

## ڕێککەوتننامەی جەزائیرو چارەنووسی شۆڕشی کورد

باسی یەکەم:

ڕێککەوتننامەی جەزائیر

باسی دووەم:

ئامادەکاریەکانی سەرکردایەتی کورد بۆ نەگەری ڕێککەوتنی عێراقو ئێران

باسی سێیەم:

کاریگەری ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە سەر هەرەسی شۆڕشی کورد

بەشی چوارەم:

چارەنووسی هێزی (پ‌م)و پەناهەندەکانو کەرەستەکانی دیکە دوای بڕیاری هەرەسیشۆڕش

## باسی یەکەم:

## ڕێککەوتننامەی جەزائیر

لە دوای زنجیرەیەك كۆبوونەوەی ئاشكراو نهێنی لە ئاستی وەزارەتی دەرەوەی عێـراق‌و ئێران‌و بە هەوڵی ناوبژیوانان لە كۆبوونەوەی وڵاتانی ئەندامی ڕێكخـراوی (ئۆپیـك)، بەسـەرپەرشتی (هەواری بۆمدیـەن)ی سـەرۆكی جـەزائیر، لەلایـەن (سـەدام حوسـێن) جێگری سـەرۆك كۆماری عێراق‌و شای ئێرانەوە ڕێککەوتننامەی جەزائیر واژۆكرا.

ڕێککەوتننامەكە لە دەقێكی كورت پێك هاتووە، سێ (پرۆتۆكـۆڵ)ی[301] تایبـەت بە ڕێککەوتنی ئاسایش‌و سنووری ئاوی‌و وشكانی[302] و چـوار ڕێککەوتننامـەی دیكـە بەدوا داهات[303]، بێجگە لە خاڵە نهێنیەكانی.

---

301- پرۆتۆكۆڵ: لە یاسای نێودەوڵەتیدا گوزارشتە لە كۆمەڵێك ڕێوشوێن‌و ئامادەكاریی، كە لە بەرئەنجامی واژۆكردنی پەیماننامە یان ڕێككەوتننامەیەك دێتەدی. بۆ زانیاری زیاتر: الكيالي و الاخرون: موسوعة السياسية، ج٧/ص٥٢٨

302- بڕوانە: (جابر ابراهيم الراوي: مشكلات الحدود العراقية الايرانية والنزاع المسلح، بغداد ١٩٨٩، ص٣٠٨" خليل ابراهيم احمد و جعفر عباس حميدي، تأريخ العراق المعاصر، ص٢٦٧" بەڵگەنامەی (٣)

303- البارزاني: البارزاني والحركة، ج٢/ص٧١٢

پوختەی ئەو دەقەی بە ناوی پەیمانی سنووری نێودەوڵەتی‌و مافی هاوسێیەتی نێوان عێراق‌و ئێران (معاهدة الحدود الدولية و حسن الجوار بين العراق و ايران) واژۆیان لە سەر کردووە[204]، بەڵام زیاتر بە ناوی (رێککەوتننامەی جەزائیر)ەوە ناسراوە[205]، کە بێجگە لە پێشەکی‌و پاشەکی ئەمە دەقەیەتی:

خاڵی یەکەم: کێشانی تەخشەی کۆتایی سنووری وشکانی هەردوولا لە سەر بنەڕەتی پڕۆتۆکۆلی قوستەنتینیەی ساڵی ١٩١٣و کۆنووسی لیژنەی دیاریکردنی سنووری ساڵی ١٩١٤[206]

خاڵی دووەم: دیاریکردنی سنووری ئاوی بە پێی خەتی تالوك[207]

---

٢٠٤-المصدر نفسه، ج٣/ص٧٠١

٢٠٥- بە ناوی شاری جەزائیری پایتەختی وڵاتی جەزائیرەوە ناوی دەرکردوە.

٢٠٦- پڕۆتۆکۆلی ساڵی ١٩١٢ بە رێگەی لیژنەیەکی هاوبەشەوە رێکخرا، بۆ چارەسەر گرتنی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی‌و دەوڵەتی ئێرانی، لە وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانی‌و باڵوێزی روسیا‌و بەریتانیا پێکهاتبوو، سەرەڕای چارەسەری کێشەی نێوان هەردوو دەوڵەت ئەرکی چارەسەری کێشەی سنووری دەوڵەتی عوسمانی‌و روسیاشیان کەوتبووە ئەستۆ، بە درێژایی ئەو ساڵە لیژنەکە لەگەڵ لیژنە فەرعیەکانی لە کاردابوو، هەتا گەیشتنە واژۆکردنی پڕۆتۆکۆلێك بە ناوی (قوستەنتینیە)، لیژنەکە پشت ئەستوور بووە بە پەیمانەکانی پێشتری نێوان هەردوو وڵات.

لە ساڵی ١٩١٤ بۆ درێژەدان بە کاردکانی لیژنەی ساڵی پێشوو لیژنەیەکی مەیدانی کەوتە رووپێوی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت بۆ چارەسەرکردنی تەواوی ئەو گرفتانەی مابوونەوە. کارەکانی ئەو لیژنەیەش بە کۆنووسی لیژنەی دیاریکردنی سنووری ساڵی ١٩١٤ ناسراوە، ئەو پڕۆتۆکۆلە بووە میرات بۆ دەوڵەتی عێراق. پەیمانی ١٩٣٧یش بۆ هەمان پڕۆتۆکۆل گەڕاوەتەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (شاکر صابر الضباط: العلاقات الدولية و معاهدات الحدود بين العراق و ايران، ص٧٦-٨٧، ٨٨-٩٣)

٢٠٧- تالوك (thalwek): وشەیەکی ئەڵمانیە لە دوو بڕگە پێك دێت (thau) واتە دۆڵ (wey) واتە رێڕەوی دۆڵ، (Thalweg)، زاراوەیەکی دەولیە بەکاردێت بۆ دیاریکردنی مافی خاوەنداریەتی لە

خاڵی سێیەم: لە سەر هەردوولایە ئاسایش و متمانە بگەڕێننەوە بۆ یەکتری و لە پێناو چارەسەرکردنی کۆتایی بۆ هەموو سنووربەزاندنێک، کە بەمەستی کاری تێکدەرانە لە هەر لایەکەوە بێ ئەنجام بدرێت پابەند بن بە دانانی چاودێری توندو کاریگەر لە سەر سنووری هاوبەش.

چوارەم: هەروەها هەردوولا ڕێککەوتن، کە ئەو خاڵانە پێکەوە یەک ڕەگەز پێکدەهێنن و گشتگیرن و لێک جیا ناکرێنەوە، هەر درزێک لە یەکێک لەو خاڵانە ببێت تێک دەگیرێت لەگەڵ گیانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر، هەردوولا لە پەیوەندی بەردەوامدا دەبن لەگەڵ (هەواری بۆمدیەن) هەتا لە کاتی پێویست هەرچی هاوکاریەکی برایانە هەبێت لە پێناو جێبەجێکردنی بڕیارەکان بیخاتەڕوو.

وەکو دیارە ئەو دەقەی لە ٦/ ئازاری ساڵی ١٩٧٥ لە جەزائیر لە سەری ڕێککەوتن دوورو درێژ نیە، پوختەو هێڵە گشتیە بۆ ئەو پرۆتۆکۆڵ و ڕێککەوتنامانەی لە بەرئەنجامەکەی پێی گەیشتن، دەقی واژۆکراوی جەزائیر لە چوار خاڵ و پێشەکیەکی و پاشەکیەکی کورت پێک هاتووە[٢٠٨]، کە هەموو دەقەکە نزیک بە (٢٥٠ وشە) دەبێ، چوار خاڵی بە ناوەڕۆک چڕ، لەگەڵ ئەو پێشەکی و پاشەکیە ئەو خاڵانەی خوارەوەی لە خۆگرتووە:-

---

ناوەڕاستی ڕێڕەوی ڕووبار. بۆ شەتولعەرەب دەکاتە ناوەڕاستی قوڵایی ڕووبارەکە هەتا دەگاتە دەریا. بڕوانە: (العزي: مشكلة شط العرب، ص١٢٤-١٢٩" البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص٧٠٠ " ماریون ویتر سلوجت: العراق الحديث، ص٢٤٣)

٢٠٨- بڕوانە: جريدة (الثورة)، ع٢٠١٤، ٧/٣/١٩٧٥" بەڵگەنامەی ژمارە (٢)

• سوپاس و پێزانین بۆ (هەواری بومدیەن) بۆ سازادانی کەش و هەوای گفتوگۆ و لە یەکتر نزیکخستنەوەی هەردوولا.

• سووربوونی هەردوولا لە سەر دوورخستنەوەی دەستێوەردانی دەرەکی.

• رێزگرتنی هەردوولا لە پیرۆزی سنوور و خاک و ئاسایشی یەکتر.

• نیشاندانی ئەو پەڕی راشکاوی و راستگۆیی لە تەوەرەکانی بابەتی گفتوگۆ.

• بە بانگهێشتنی رەسمی شای ئێران سەردانی عێراق دەکات و سەدام حوسێن جێگری سەرۆک کۆماری عێراق سەردانی تاران بکات.

• لە ١٥ی ئازارەوە لە سەر ئاستی وەزارەتی دەرەوە بە ئامادەبوونی وەزیری دەرەوەی جەزائیر لە تاران هەردوولا بۆ دانانی رێوشوێنی پێویست بۆ وردەکارییەکان و چۆنیەتی جێبەجێکردنی رێککەوتننامەی جەزائیر کۆبینەوە، دواتر کۆبوونەوەکان لە بەغداو تاران بە نۆرە دەبێ.

شای ئێران بانگهێشتی سەرۆکی عێراق (ئەحمەد حەسەن بەکر)ی قبوڵ کرد بە رەسمی سەردانی عێراق بکات، لە بەرانبەردا سەدام حوسێن قبوڵی کرد لەو بەروارەی لە سەری رێکدەکەون سەردانی ئێران بکات[٣٠٩]

٣٠٩- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٢).

**پوختەی سەرنج لە سەر ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکەو ئەوەی پەیوەندی بە کوردەوە هەیە:-**

یەکەم: خاڵی یەکەم و چوارەم پێویستی بە هەڵوێستە لە سەرکردن نیە، تەنیا ئەو بڕگەیە نەبێت، کە دەڵێت: ((ئەو ڕێوشوێنانەی ئاماژەمان پێ کردن لە سەرەوە بۆ چارەسەری گشتگیر یەك ڕەگەزن و لێك جیانابنەوە، هەر درزێك بکەوێتە یەکێك لە ڕەگەزەکانی ئەوە تێك دەگیرێت لەگەڵ گیانی هەموو ڕێککەوتننامەی جەزائیر))، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕێککەوتننامەکە لە پراکتیکدا لەت ناکرێت و لادان لە هەر خاڵێك جەوهەری ڕێککەوتننامەکە هەڵدەوەشێنێتەوە.

دووەم: هەردوو خاڵی دووەم و سێیەم خاڵی سەرەکین و بەرانبەر بە یەکتن، ئێران داواکاری خۆی لە خاڵی دووەم دەستکەوتووە، عێراقیش لە خاڵی سێیەم[210]. عێراق لە خاڵی دووەم دۆڕاندویەتی و لە خاڵی سێیەم لە ڕوخساردا بردوویەتیەوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ئێران لە خاڵی دووەم بردوویەتیەوەو لە خاڵی سێیەم هیچی نەدۆڕاندوە، بۆیە دروست وتراوە، کە ڕێککەوتننامەی جەزائیر زیاتر بە سەرکەوتنی ئێران هەژمار کراوە،

٢١٠- ئەوانەش کە بە بە پوختی دەیانەوێت بە سەر ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە گوزەر بکەن زیاتر ئاماژە بەو دوو خاڵە دەکەن. لەو بارەوە بڕوانە: (جرجيس حسن: تركيا في ستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه، ط١، د.م،١٩٩٩، ص٦٤" ترىب: صفحات من تأريخ العراق، ل٢٨٣" صلاح سعد الله: المسألة الكردية في العراق، القاهرة ٢٠٠٦، ص١٠٥" نەوشیروان مستەفا : پەنجەکان، ل١١١" لێنتیسار: بتنزنەتەوایەتی کوردی، ل١٦٨"، ناونیشانی ئەلیکترۆنی: org.www.kurdistannet.

کە شا دەستکەوتی گەورەی لەو رێککەوتننامەیەدا پێبڕاوە[٣١١]، چونکە ئەوەی شا وەکو دەستکەوتی ستراتیژی دەژمێردرێ‌و وەکو دەوڵەت سوودمەندبووە.

ئەمە لە لای بەعس بە شێوەیەکی دیکە دەخوێندرێتەوە، کە پێی وابووە قبولکردنی رێککەوتنێکی لەو جۆرە عێراقی لە مەترسی رزگار کردووە، کە هەڕەشەی لە یەکێتی‌و ئاسایش‌و داپۆشی کردووە[٣١٢]، یەکێك لە خەسڵەتە مەترسیدارەکانی حیزبی بەعس ئەوە بووە، کە رژێم‌و حیزبەکەی لە دەوڵەت بە پیرۆزتر دانابوو، سازش لە سەر پیرۆزی دەوڵەت لە خاك‌و ئاو گرگترین رەگەزی دەوڵەت پێك دەهێنن، کراوەتە قوربانی لابردنی ئەو مەترسیانەی لە سەر حیزبی دەسەڵات هەیە، بۆیە لە دیدی بەعس ئەو سازشە بە خیانەتی نیشتیمانی هەژمار ناکرێ.

سێیەم:عێراق لە سەرەتاوە لە مەبەستی ئێران تێگەیشتبوو، سەدام حوسێن لە دوا گفتوگۆی لەگەڵ (ئیدریس بارزانی) سەرۆکی وەفدی (پ.د.ك) بە راشکاوی وتبووی: ((ئەوە بەباوکت رابگەیەنە: ناچارمان نەکات سازش بۆ شای ئێران بکەین، ئەگەر مەترسی کەوتە سەر قەوارەی عێراق ئەوکات سازش دەکەین لە سەر شەتولعەرەب بۆ لابردنی ئەو مەترسیە))[٣١٣].

---

٣١١- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (راندال، کوردستان یان، ل٥٨" مارتین فان برونسن: ئاغاو شێخ‌و دەوڵەت، و/ کوردۆ. سلێمانی، ١٩٩٩، ل٥٨)

٣١٢- راپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێسانە، حوزەیرانی ١٩٨٢، ل٢٦

٣١٣- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٢٩٦" محمد صالح العقراوي: الكرد و الدولة المستقلة وفق المعهدات و المواثيق الدولية،، اربيل، ٢٠٠٥، ص٢٠٨" مثنى امين: قضايا القوميات و اثرها على العلاقات الدولية، سليمانية، ٢٠٠٤، ص١٧٠-١٧١

بەپێی دوا ڕێککەوتننامەی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئێران شەتولعەرەب بە تەنیا هی عێراق بووە بەکاری بهێنێت بۆ کەشتیەانی[٣١٤]، بە دابەشکردنی شەتولعەرەب بە پێی هێڵی (تالوك) ئێران لەگەڵ عێراق بووە بە بەرا بەش. پێدەچێ سەدام حوسێن بێجگە لە خواستی سنوور داخستنو قەدەغەکردنی پەڕینەوە باسی هیچ خواستێکی دیکەی لاگرنگ نەبووبێ، بۆ عێراقیش وەکو دەوڵەت لە ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیە هیچی دەست نەکەوتووە. بێجگە لە (بە شێوەیەکی کاتی) لە ناوبردنی مەترسی شۆڕشی کوردستان نەبێت[٣١٥]

چوارەم: ئێران لەو ڕێککەوتننامەیە دەستکەوتی ستراتیجی بردۆتەوە، بەڵام بەعس بە داننەنانی بە مافی میللەتی کورد کارتی شۆڕشی کوردستانی خستبووە دەست ئێران، بۆ وەرگرتنەوەی ئەو کارتە شەتولعەرەبی دۆڕاندووە. بە بیرکردنەوەی سەدام حوسێن دۆڕانی شەتولعەرەبی لە دۆڕانی کوردستان چاکتربووە.

ئێران وەکو دەوڵەت سوودمەند بوو، بۆیەش بە زوویی پشتی شۆڕشی کوردستانی بەردا[٣١٦]. لە کاتێکدا دەگونجێت وڵاتێك بە بڕیارێك بەشێك لە خاکی خۆی لە دەست بدات، بەڵام بە بڕیارێك نەستەمە ویستی گەلێك بۆ ئازادی دەستبەسەرا بگرێ، چونکە ئەو مافە لە دەست وڵاتێکی دراوسێدا نییە، هەتا بیگێڕێتەوە، باروودۆخێکی سیاسیو سروشتی مامەڵەی سەرکردایەتی شۆڕش لەو کاتە کاریگەری ئەو وڵاتە دراوسێیەی

٣١٤- بە پێی ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٣٧ ئێران بە تەنیا لە ئاستی شاری عابادان خاوەنی ئاوی شەتولعەرەب بووە،، کەشتی ئێرانی لەگەڵ هاتنەئاوەوەی بۆ شەتولعەرەب دەبوایە ئاڵای عێراق بەرزبکاتەوە. بڕوانە: (صالح ملا عیسی: ئێران الفرنسي، ص١٧٤

٣١٥- بڕوانە: (بەشی کۆتایی ئەم توێژینەوەیە)

٣١٦- حامید محمود عیسی: القضية الكردية، ص٣٧٤" ژیرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلێکی، ل٢١٥-٣١٦" ڕاندال: کوردستان یان، ل٢٤٢

بەسەر خۆیەوە دروست کردووە، مەرج نییە تا سەر ئەو کاریگەرییە بێنێتەوە. بۆیە ئێران وەکو رژێمو دەسەڵاتی سیاسی لە شا نیگەران بوون، بەڵام لێرەدا دەستکەوتی گەورەی بۆ وڵاتەکەی مسۆگەر کردووە، (عیسی پەژمان) لە بیەوەرییەکانیدا دەنووسێت: ((.. ئەم رووداوە نەك هەر شانازیە بۆ دەورانی سەڵتەنەتو بۆ دەسەڵاتی ئەو لە مێژوو تۆمار دەکرێ، بەڵکو هەموو بەرپرسو هەڵسوڕێنەرانی ئەم گەڵاڵە مەزنە، کە لە راستیدا هەر لە سەرەتاوە ناوێکی پڕ بە پێویستیان لە سەر دانا، واتە (گەڵاڵە نامەی پیرۆز)، زیاتر سەربەرزە لە ویژدانی خۆیدا هەست بە فیزو سەربەرزیو خزمەتگوزاری بە راستی بۆ مللەو میللەتی گەورەی خۆیان کردووە..))[٣١٧].

پێنجەم: هیچ کام لە شای ئێرانو سەدام حوسێن (کورد)یان لەو رێککەوتننامەیە بەڕەوا نەدیووە، تەنیا بە دەربڕینی ناراستەوخۆی وەکو: ((لە پێناو سنووردانانی کۆتایی بۆ هەموو سنووربەزاندنێك کە بە مەبەستی کاری تێکدەرانە بێت لە هەر لایەکەوە بێت))[٣١٨]، لەوێدا شۆڕشی کورد بە ناوی (سنووربەزێنەری تێکدەرانە) هاتووە.

---

٣١٧-عیسی پەژمان: نهێنی یەکانی بەستنی، ل١٩٩٧

٣١٨- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٢)

## پرۆتۆکۆڵەکان و بزاڤی رزگاریخوازی کورد.:

پرۆتۆکۆڵـەکان بەشـی سـەرەکی رێککەوتننامـەی جـەزائیر پێـك دەهێـنن، لـە پەیماننامەیەکەو سێ پرۆتۆکۆڵ پێك هاتووە بەم شێوەیە:

یەك: یەکەم پرۆتۆکۆڵ لە شێوەی پەیماننامەیەك دایە، لە پێشـەکیەکەو (٨) مـادە پێکهـاتووە[٣١٩]، هـەموو مادەکـانی بـە بنەمایـەك دادەنرێـت بـۆ ئـەو پرۆتۆکـۆڵ و رێککەوتنامانەی لە نێوانیان واژۆکراوە. بەڵێنامەکە بۆتـە سـەرەتا، لەوێـدا ئالیـەت دیاریکراوە بۆ مامەڵەکردنی یاسـایی لەگـەڵ هـەر حاڵـەتێکی نـاکۆك لـە ئاکـامی تەفسیری مادەکان دروست ببێت، تەواو بەرتەنجامی بەدگومانی هەردوولا بـەدیار دەخـا بەرانبەر یەکتری.

دوو: یەکەم پرۆتۆکۆڵ تایبەتە بە دیـاری کردنـی سـنووری ئـاوی: لـە (٩) مـادە پێکهاتووە[٣٢٠]، لەوێدا هەموو وردەکاریـەکانی دابەشـکردنی شـەتولعەرەب لـە نێـوان هەردوو وڵات هاتووە، بە شێوەی مادەو بۆ وردتر بە سەر خـاڵ دابـەش کراوەتـەوە، ئـەو بابەتانەی بە پێی خەتی تالوك تایبەتن بـە دیـاریکردنی سـنوور، هاتوچـۆی کەشـتی مەدەنیو بازرگانیو سەربازی لەوێدا روون کراوەتەوە، هەروەها چارەسەری یاسـایی لـە حاڵەتی گۆڕینی شوێنی رووباری شەتولعەرەبو چەندان بابەتی دیکـەی پەیوەسـت بـە سنووری ئاوی ئارتوێ کراوە. لەوێـدا عێـراق شـەتولعەرەبی دۆڕانـدووە، ئـەو بەشـەی

---

٣١٩- بەڵگەنامەی ژمارە (٣).

٣٢٠- بەڵگەنامەی ژمارە (٣).

دۆزاندریەتی لەگەڵ ئەو بەشەی بۆی ماوەتەوە، وردەکاریـەکانی بەشـکردنەکەیان لـەو پرۆتۆکۆڵەدا رێکخـستووە[321]

سێ: پرۆتۆکۆڵی دووەم تایبەتە بە دووبارە نەخشەکێشانەوەی سـنووری وشکانی، لـە (٦) مادە پێك هاتووە. هەموو مادەکان بە بەراورد لەگەڵ پـێش خـۆی گـۆڕانی تـازەی تێدا نابینرێت، زیاتر جەختکردنەوەیە لـە سـەر هـەردوو پرۆتۆکـۆڵی سـاڵی ١٩١٣و ١٩١٤، دانانی ئەستونگە (الدعامات)ی تازە بە درێـژایی سـنووری وشـکانی نێـوان هەردوولاو چۆنیەتی پاراستنیانو رێنەگرتنی شوێنی دروستی سنوورو دانانی رێوشوێن بۆ دەستکاری نەکردنی ئەو ئەستونگانە.

چوار: پرۆتۆکۆڵی سێیەم بە نـاوی (پرۆتۆکـۆڵی تایبـەت بـە ئاسایشـی سـنووری عێراقی –ئێرانی).

پرۆتۆکۆڵی ئاسایشی سنوور، سەرەڕای پێشەکیەك لە (٨) مادە پێکهاتووە[322]. لـە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ لە بەغدا واژۆکراوە. لەلایەن ئێرانـەوە (عـەلی خەلعەتبـەری) وەزیـری دەرەوەو لەلایـەن عێراقـەوە (سـەعدون حـەمادی) وەزیـری دەرەوە، وەکـو سەرپەرشتیار وەزیری دەرەوەی جەزائیر (عەبدولعەزیز بۆتەفلیقە)[323] واژۆیـان لـە سـەر ئەم پرۆتۆکۆڵانە کردووە[324].

---

٣٢١- پرۆتۆکۆڵی ناوبراو لە بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٣٢٢- بەڵگەنامەی (٢)

٣٢٣-عەبدولعەزیز بۆتەفلیقە: لە ساڵی ١٩٣٧ لەشاری (تەلیسمان)ی جەزائیر لە دایك بووە، لە قۆناغی ئامادەییەوە وازی لە خوێندن هێناوەو پەیوەندی کردووە بە سوپای رزگاری نیشتیمانی جەزائیرەوە، پلەکانی سەربازی بڕیوە هەتا گەیشتۆتە ئەندامی سکرتاریەتی ئەرکان، لە یەکەم کابینەی حکومەتی سەربەخۆدا لە ساڵی ١٩٦٣ کراوەتە وەزیری وەرزشو لاوانو دوایی لەگەڵ ژەنەڕاڵ (هەواری بۆمەدیەن) بەشداری لە کۆدەتا کردووە بە سەر (بن بیلا)، بووە بە وەزیری دەرەوە، لەو پۆستەدا مایەوە هەتا نەخۆشیە کوشندەکەی

پرۆتۆکۆلی تایبەت بە ئاسایشی سنوور راستەوخۆ پەیوەندی بە بزاڤی رزگاریخوازی کوردستانەوە هەیەو بۆ عێراق زیاتر جێی بایەخ بووە، بە پوختی ناوەڕۆکەکەی پێك دێ لە:

١. لە دیباجەی پرۆتۆکۆلەکەدا هاتووە: ((بە پێی بەرئەنجامی بڕیارەکانی رێککەوتننامەی جەزائیر بە مێژووی ١٥ی ئازاری ١٩٧٥ لە بابەت بایەخدان بە گەڕانەوەی ئاسایش و متمانە لە نێوان هەردوولا، بە درێژایی سنووری هاوبەش و بە جدیەتی هەردوولا چاودێری توندو کارا لە سەر سنووری هاوبەش دادەنێن بۆ مەبەستی بەرگریکردن لە هەموو رووداوێکی سنووربەزاندنی تێکدەرانەو هاوکاری توندوتۆلی یەکتری لەو پێناوەدا، بۆ مەبەستی قەدەغەکردنی هەموو کارێکی سنوور بەزاندنی نایاسایی بە درێژایی سنووری هاوبەش، کە بە مەبەستی گێرەشێوێنیو یاخیبوون و هەلگەڕانەوە دەکرێت))[٣٢٥]

٢. مادەی یەکەم تایبەتە بە هاریکاری یەکتر بۆ رێگەگرتن لە جموجۆلی (پەم) لە سەر سنوورەکان، لەو مادەدا رێکدەکەون: أ- پابەند بن بە هەواڵدان بە لایەنی بەرانبەر سەبارەت بە ناسنامەی ئەو کەسانەی سنوور دەبەزێنن.

---

بزمدیەن لە ساڵی ١٩٧٨. لە ساڵی ١٩٩٨ەوە سەرۆك کۆماری جەزائیرە. بڕوانە: الکیالی: موسوعە السیاسیە ج٣، ص٨٣٧ عبد العزیز برتفلیقە ناونیشانی ئەلیکترۆنی:
www.elmouradia.dz/arabe/presidence/portrait/bouteflika.htm

٣٢٤- دەقی پرۆتۆکۆلەکان لە بەلگەنامەی ژمارە (٣)

٣٢٥- بەلگەنامەی ژمارە (٣)

ب- هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست دەگیرێتەبەر بۆ قەدەغەکردنی ئەوانەی کاری تێکدەرانە ئەنجام دەدەن[٣٢٦].

٣. مادەی دووەم تایبەتە بە هەموو جۆرە شێوازێکی هاریکاری لە نێوان دامەزراوە پەیوەندیدارەکانی هەردوو حکومەت، وەکو وەزارەتی (دەرەوە، بەرگری، ناوخۆ) هەتا دەگاتە بالاترین دەسەلاتی ئەو وەزارەتانە، بۆ ئەو مەبەستەی لە دیباچەی پڕۆتۆکۆڵەکە دیاری کراوە.

٤. لە مادەی سێیەم، ئاماژە بۆ ئەو کۆنووسە کراوە، کە لە ئاکامی کۆبوونەوەی لیژنەی هاوبەشی هەردوولا لە خاڵی سنووری تورکیاوە هەتا دەگاتە شەتولعەرەب تێیدا هەموو قاچاغە ڕێگاکانیان سەرژمێری کردووە، کە دەکاتە ٣٨ قاچاغەڕێگا[٣٢٧]، لەوانە (٢١) قاچاغەڕێگا لە حاجی ئۆمەرانەوە هەتا دەگاتە (خانەقین- قەسری شیرین)، ئەوەی دیکە بەرەو باشوور هەتا دەگاتە کۆتایی سنووری ئاوی لە سەر شەتولعەرەب، کە (١٧) قاچاغەڕێگای دەگرتەوە، هەر لەو مادەدا ئاماژە بە دوو ئەگەری تری مەترسیداری پەڕینەوە کراوە، ئەوانیش خاڵە گومرگیەکانو ئەو قاچاغە ڕێگایانەی نەکەوتوونەتە ناو ئەو ٣٨ شوێنە[٣٢٨].

٥. لە مادەی چوارەم لە لایەن دەسەلاتدارە پەیوەندیدارەکانی هەردوولاوە بۆ گرتنو ڕاوەدوونانی (پەم)و جێبەجێکردنی حوکمی یاسا بە سەریاندا بڕیار لە سەر

---

٣٢٦- بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٣٢٧- دەربارەی کۆنووسی تایبەت بەو ٣٨ قاچاغەڕێیانە بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٤)

٣٢٨- بەڵگەنامەی ژمارە (٥)

دابینکردنی هەموو کەرەستە مرزیی‌ومادیەکان دراوە، هەروەها رێککەوتوون لەو بارەوە ئالوگۆڕکردنی زانیاری تەواو هەبێت[٣٢٩].

٦. مادەی پێنجەم، تایبەتە بە رادەستکردنەوەی نەك بە تەنیا (پ‌م) بەڵکو برگەکانی زۆر بە کراوەیی هاتووە، کە هەموو هەڵاتووەیەکی وڵاتی بەرانبەر بگرێتەوە[٣٣٠].

٧. مادەی شەشەم بە دەربڕینێکی کورت‌و کراوە رێککەوتوون لە سەر چۆلکردنی هەموو ئەو ناوچانەی (پ‌م) بۆ پەڕینەوە یان بۆ حەوانەو کارکردن بەکاری دەهێنن[٣٣١].

٨. لە مادەی حەوتەم، هەموو باڵوێزخانەو دیبلۆماسەکانی وەزارەتی دەرەوەی عێراق‌و ئێران دەبنە سیخوڕ لە سەر هەموو جموجۆڵێکی سیاسی کورد لە وڵاتانی دەرەوە بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی دەستگیرکردنی (پ‌م)و شۆڕشگێرانی کورد لە سەر سنوورەکان، لەوبارەیەوە دەبێت ساڵانە بەرپرسان لە وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ بەرپرسە کارگێڕیە پەیوەندارەکانی ناوچە سنووریەکان کۆببنەوە بۆ هەر هاریکاریەك خزمەت بەو ئامانجە بکات، کە لە پرۆتۆکۆڵەکەدا هاتووە[٣٣٢].

٩. لە هەردوو مادەی هەشتەم‌و نۆیەم رێککەوتون لە سەر:

أ - تێکنەگیانی مادەکانی پرۆتۆکۆڵی ئاسایش لەگەڵ رێککەوتننامەکانی تری نێوان عێراق‌و ئێران تایبەت بە پاراستنی سنوور و مافی مەڕ لەوەڕاندن.

---

٣٢٩- بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٣٣٠- بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٣٣١- بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٣٣٢- بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

ب-دانانی بنکەی چاودێری لە ناوی شەتولعەرەب بە ڕێگەی بەلەمی ئێشکگر (الزوارق الدوریە)[233].

دەتوانین سەرنج و تێبینیەکان لە سەر پەیماننامەو هەر سێ لە پڕۆتۆکۆڵەکان و بە تایبەت پڕۆتۆکۆڵی سێیەم و پاشکۆی پەیوەست بە پڕۆتۆکۆڵەکە بەم شێوە پوخت دەکرێتەوە:

یەکەم: پەیماننامەکەو پڕۆتۆکۆڵەکان لە رووی کارگێڕیەوە لەو پەڕی وردەکاریدان، لە رووی تیۆریەو درزێکیان نەهێشتۆتەوە باسیان لێوەنەکردبێ.

دووەم: زمانی پەیماننامەکەو وردەکاری پڕۆتۆکۆڵەکان بێمتمانەیی تەواوی لێ بەدی دەکرێت لەبەرانبەر یەکتری، چونکە ویستوویانە هەموو مەترسییەك، کە لە ناکامی خوێندنەوەی جیا بۆ دەقەکان یان کەمتەرخەمی تووشیان دەبێت بە روونکردنەوەی زیاتر چارەسەری بۆ بدۆزنەوە.

سێیەم: ڕێککەوتننامەی جەزائیرو هەموو پڕۆتۆکۆڵەکان بە تایبەت پڕۆتۆکۆڵی ئاسایشی سنوور، تایبەتە بە ڕێککەوتن بۆ لە ناوبردنی جوڵانەوەی کورد، بەڵام ناوی کوردی نەبردووە، کەچی لە راستیدا سەودایەك بووە بۆ ئەو مەبەستە[234]، لە بەرانبەردا کۆمەڵێك وشەو گوزارشتی دیکەی بۆ (پ م) مەفرەزەی چەکدار، پارت و گروپی سیاسی کوردی بەکارهاتووە وەکو: ((لە پێناو راگرتنی هەموو هەنگاوێکی سنووربەزاندنێك، کە ئامانجی تێکدەرانەی هەبێت، ئەمە سەرەڕای چەندان بڕگەی وەکو

---

٢٣٣- بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٢٣٤- بڕوانە: (خۆشناو: مەسەلەی کوردو، ل١٧٦-١٧٧" نەوشیروان: پەنجەکان، ل١١١" نورەدینی: سیستەمی نوێی جیهانی، ل١٠٥" زهیر الزاهر، اتفاقیة الجزائر ١٩٧٥ للموقف منها و البدیل عنها، الثقافة الجدیدة، ع ٢٣٥، السنة(٣٨)، تموز، ١٩٩١، ل١٢)

تێکدەرانە، یاخی بوون، هەڵگەڕانەوە، ئەنجامدانی کاری تێکدەرانە لە هەرێمی بەرانبەر، لایەنە تێکدەرەکان، کەسانی تێکدەر، تێکدەر، تێکدەرانی هەڵاتوو))[335]. پێدەچێ بەکارنەهێنانی وشەی کورد یان دەربڕینێك گوزارشت لە بزاڤی میللەتی کورد بکات، ڕەنگدانەوەی دڵڕەقی و شۆفێنیەتی هەردوو ڕژێم بێت بەرانبەر کورد.

هەموو خاڵەکانی عێراق و ئێران لە سەری ڕێککەوتوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان کۆیان لە ژێر ناونیشانی (پەیماننامەکانی عێراق و ئێران) بە ژمارەکانی (١٤٩٠٣ تا ١٤٩٠٧) لە ئەرشیفی سکرتاریەتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵگیراوە[336].

دواتریش حیزبی بەعس لە هەموو لێدوانێکی لە بابەت هۆکارەکانی بەستنی ئەو ڕێککەوتننامەیە بە ڕاستەوخۆ ناوی کوردی نەبردووە، بە وشەو بڕگەی تر ناوی هێناوە وەکو: ((دەستێوەردانی ئێرانی لە کاروباری ناوخۆ... جەیبی عەمیل... شەڕی شاراوە... زیان گەیاندن بە یەکیەتی خاکی عێراق...))[337].

چوارەم: زۆربەی ئەو ڕستەو دەربڕینانەی بۆ هاریکاری هەردوو وڵات لە بابەت ڕێوشوێنی توندی ئەمنیەوە لە پرۆتۆکۆڵی تایبەت بە ئاسایشی سنووردا هاتووە، دەستکراوەیی داوەتە دەست بەرپرسە پەیوەندیدارەکان و بەو پەڕی جدیەت دارێژراون. وەکو دەبڕینەکانی : ((...چاودێری توندو کاریگەر لە سەر سنوورەکان... یان...هەموو ڕێوشوێنێك...یان هاوکاری جۆراو جۆر... یان...هەتا لەبەرزترین ئاستی وەزارەت... یان...هەر خاڵێکی دیکەی قاچاغەڕێ، کە دوای بدۆزرێتەوە...یان...پەرەپێدانی

---

٣٣٥-ئەو دەقانە بە زمانی عەرەبی ڕۆشنتر بەدەردەکەون. بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٣).

٣٣٦- فوئاد کەریم: لە یادی ٢٤ هەمین، ل٢٣

٣٣٧- صباح سلیمان: اضواء علی الحرب العراقیة الایرانیة، بغداد، ١٩٨١" بدر غیلان: تأریخ الاطماع الفارسیة، ص٢١٨-٢٢٢

پەیوەندییەکانی هەردوو وڵات بە هەر شێوەیەك بخوازێت... یان..هۆکارەکانی مرۆیی و مادیی پێویست..یان..پەرەپێدانی پەیوەندی بەپێی پێویست..یان بەستنی کۆبوونەوەی نائاسایی..یان.. باشترین شێواز بۆ راپەڕاندنی بڕیارەکان...)[٣٣٨]

ئەو رێککەوتنامانەی لە پەراوێزی رێککەوتننامەی جەزائیرەوە واژۆکران.

بێجگە لە پرۆتۆکۆڵەکان چوار رێککەوتننامەی دیکە لە نێوان ئەو دوو وڵاتە واژۆکراوە لە سەر مەسەلەکانی:

١- هاریکاری دەربارەی کەشتیوانی لە شەتولعەرەب.

٢- هاریکاری دەربارەی مافی بەکارهێنانی لەوەڕگاکان.

٣- رێککەوتن دەربارەی رووبارە سنوورییەکان.

٤- رێککەوتن دەربارەی مافو ئەرکی قۆمیسەری سنوورەکان[٣٣٩].

وەکو بەدەردەکەوێ خاڵەکانی ئەو رێککەوتنانە وەکو ناوهێنانی راستەوخۆو ناراستەوخۆ پەیوەست نەبوون بە کورد، بەڵام ئەسڵی رێککەوتنامەی جەزائیر، کە کورد هۆکاری دیارو بەرچاوی تێیدا بووە بارێکی سیاسی وای دروست کرد، عێراق و ئێران بە هەموو جومگەکانی پەیوەست بە بەرژەوەندی ئابووریو سیاسیو کاگێڕیو ئەمنی نێوانیاندا بچنەوە.

---

٣٣٨- بۆ ئەو دەقانە بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٣).

٣٣٩- بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ص٧١١)

بەڵێنیداوە بیگەڕێنێتەوە بۆ ئێران[٢٥٥]، بەڵام ناوی ئەو سنوورە وشکانیە لە پرۆتۆکۆڵەکاندا نەهاتووە، کە عێراق بەڵێنی گەڕانەوەی دابێت.

## ئەو ئالیەتەی گرتیانە بەر بۆ گەیشتن بە ئاکام.

سەرچاوەی بڕیار بۆ قبوڵکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر ئێران جێی پرسیار نییە، چونکە وڵاتێکی پاشایەتی بووەو ئێران لەو ڕێککەوتننامەیە براوە بووە، بەڵام سەدام حوسێن جێگری سەرۆك کۆمار واژۆی لە سەر ڕێککەوتننامەیەك، کە لە سەرووی ئەوەوە سەرۆك کۆماری عێراق (ئەحمەد حەسەن بەکر)[٢٥٦] و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و بەرەی نیشتیمانی و نەتەوەیی و پێشکەوتوخواز هەیە، ڕۆڵی ئەوانە لە پەسندکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیەدا ونە.

هەردوو وڵات بۆ هەموو وردەکاریەکان، کە لە پرۆتۆکۆڵ و ڕێککەوتننامەکاندا خۆی دەدیتەوە، سپێردرا بە لیژنەیەك لە لایەن حکومەتی عێراقەوە (سەعدون حەمادی) وەزیری و لەلایەن ئێرانەوە (عەلی خەلعەتبەری) وەزیری دەرەوە بە هاریکاری

٢٥٥- موحسین دزەیی لە یاداشتەکانیدا دەنووسێ، کە مەنسور پور وتوویەتی : (... عێراق سازش دەکات لە سەروەریەتی بەشی ڕۆژهەڵاتی شەتولعەرەب لەگەڵ ئەو زەویە سنووریانەی لە دیوی ئێران جێگەی ناکۆکی هەردوولا بووە...) بڕوانە: (دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٠١)

٢٥٦- - ئەحمەد حەسەن بەکر: لە دوای کودەتای ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ بۆ ماوەی شەش مانگ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بووە، لە کودەتای دووەمی بەعس لە ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ بووە سەرۆکی کۆماری عێراق و سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و دواتر سەرۆکی بەرەی نیشتیمانی و نەتەوەیی و پێشکەوتوخواز، لە ناوەڕاستی تەمووزی ساڵی ١٩٧٩ دەستی لە کارکێشایەوەو سەدام حوسێنی جێگری جێگای گرتەوە. بڕوانە: (الریب: صفحات من تاريخ العراق، ص٢٦١-٢٩٦، wikipedia.org)

بۆیە ڕێگەی جموجۆڵی ئێمەی نەدەدا... لە ڕێبەندانی ١٣٥٦/١٩٧٩ داوای لە ئێمە کرد دەبێ لە عێراق بچینە دەرێ، یان ئەندامەکان بە ڕەسمی بینە پەنابەرو واز لە تێکۆشانی سیاسی بهێنن...))[٢٤٣]

دووەم: عێراق لە بانگەشەی عروبەو موزایەدەی بەرگری لە مافی عەرەبەکان، بەوەی یارمەتی بزووتنەوەی عەرەبەکانی ناوچەی عەرەبستان (خوزستان) دەداتو ڕکەبەری ئێرانە لە دەسەڵاتی ئێران بە سەر هەرسێ دوورگەی (عەرەبیو ئێرانی)[٢٤٤] لە کەنداو، کە لە ساڵی ١٩٧١ەوە لە لایەن سوپای ئێرانەوە داگیر کرابوون[٢٤٥]، بەڵام دوای ئەو ڕێککەوتننامەیە لە بیر خۆی بردەوە، ئەمەش لەو شەپۆلە ناڕەزاییە بەدیاردەکەوێت، کە ڕۆژنامە عەرەبییەکان بە تایبەت ڕۆژنامەکانی سوریا لەو ڕووە سەرزەنشتی عێراقیان کرد[٢٤٦]، سەرۆکی سوریا ئەوکات ئەو هەنگاوەی بە ناشیرین ڕێنا دەکرد، پێی وابووە پیلانێکی ئیمپریالیستیە بۆ لە دەستدانی خاکی عەرەب بۆ بێگانە، دووبارە ناکۆکیەکانی عێراقو سوریا گەرم بۆوە[٢٤٧]

---

٢٤٣- عەبدوڕەحمان قاسملو، عەبدوڵڵای حەسەن زادە: کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی، ل٢٧٩، ٢٨٣-٢٨٤

٢٤٤- مەبەست هەرسێ دوورگەی (تونبی بچوکو تونبی گەورەو ئەبوموسایە).

٢٤٥- خۆشناو: مەسەلەی کوردو، ل٤٠٧" کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢٠، (ی.ن.ك) لە بەیاننامەی دامەزراندنی خۆیدا لە ١٩٧٥/٦/١ ئەو سازشەی ڕووژاندووە، دەگوترێت ئەوکات بۆ سەرنج ڕاکێشانی ڕای عەرەبی بەسوود بوویێت. حکومەتی عێراقیش هەتا دوای ڕوخانی شا وازی لە وروژاندنی ئەو مەسەلەیە هێنابوو. بۆ بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ك) بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

٢٤٦- خۆشناو: مەسەلەی کوردو، ل٤٠٧

٢٤٧- سلومو تکدین، الموساد في العراق، ص٣٠٨

سێیەم: وڵاتانی کەنداو نەکرێنە داشی دامەی زلهێزەکان، لەو بارەیەوە هیچ لایەکیان پشتیوانی لە ناکۆکیە ناوخۆییو ناوچەییەکان نەکەن[٣٤٨]، کە لە راستیدا دوای رێککەوتننامەی جەزائیر دەستێوەردانی هەردوو وڵات لە کێشەی ناوخۆیی عومان کۆتایی هاتو جارێکی دیکە لەلایەن عێراقو ئێرانەوە نەخرایەوە بەر باس.

چوارەم: ئێران هاریکاری عێراق بکات لە تواندنەوەی تەرلوی شۆڕشی کوردو گەڕانەوەی ئاوارەکان بۆ عێراق هەتا لە ئایندە ئەگەری هەڵگیرسانەوەی شۆڕش نەمێنێت، شا رێگەی بە عێراق دابوو هێزەکانی بۆ راوەدوونانی پێشمەرگە سنووری ئێران ببەزێنن، جۆناتان دەڵێ: (( لە رۆژی ١٢/٣/١٩٧٥ شای ئێران، کە زانی بارزانی بەلای بەرگریو درێژەدان دایە بە شۆڕش بە پەلە ژەنەراڵ (مەنسور پوور)[٣٤٩]ی نارد بە بارزانی رابگەیەنێت، شا لە چاوپێکەوتنی جەزائیردا بەڵێنی بە عێراق داوە چی دی چاو لە کورد نەپۆشێتو رێگەی بە هێزەکانی عێراق بدات بۆ جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکە بێنە ناو خاکی ئێرانەوە ))[٣٥٠]. لە کاتی سەردانی ژەنەراڵ (ئەزهاری) لە ساڵی ١٩٧٨ بۆ بەغدا لە کۆبوونەوەی تایبەتی لەگەڵ فەیلەقی ١ی سوپای عێراقی، لە سەر ئەوە رێککەوتن، کەعێراق بۆی هەیە ئاسمانو زەوی ئێران بەکاربهێنێت[٣٥١]، لە کاتی رێککەوتننامەی جەزائیریش عێراق (٣٠٠) ملیۆن دۆلاری دابوو بە ئێران لە بەرانبەر خەرجی ئاوارە کوردەکانی عێراق لە ئێران[٣٥٢].

---

٣٤٨-کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢١

٣٤٩- پێدەچێ بەرپرسێکی باڵای ساواکی ئێران بووە.

٣٥٠- راندال: کوردستان یان، ل٢٤٥" دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٠٠-٢٠١.

٣٥١- نەوشیروان مستەفا : لە کەناری دانوبەوە، ل١٨٩، لە بەرانبەر سازشی عێراق لە شەتولعەرەب ئێران بەو پەڕی چاوەڕێ نەکراوی هەمو پشتگیریەکی گرتەبەر بۆ هاریکاری عێراق، دەستەوەستانی سوپای عێراقی لەبەرانبەر شۆڕش رەواندەوە، کەچی فاضیل البراك دەنووسێ: (...جوولانەوەی چەکداری لە دوای

یاوەری مەحمود عوسمانو موحسین دزەیی[360] بەرەو ئێران چوو، بە روونی دەردەکەوێت، کە شا ویستوویەتی بە هۆی رێککەوتن لەگەڵ بەعس لە ئازاری ١٩٧٠ تۆڵە لە بارزانی بکاتەوە، بە دەرفەتی زانی بارزانی لە تاران بێتو رێککەوتننامەکە رابگەیەنرێت، شا لەگەڵ گەڕانەوەی فەرمانی بە سەرۆکی ئەرکان (سەرتیپ ئەزهاری) کرد، (دەستەی تۆپخانە)و (بنکەکانی موشەک)ی لە کوردستان بکێشێتەوە، ئەو کارانە بە بێ ئاگاداری ئێمە کرا، بروسکەمان بۆ شەفیق قەزاز[361]ی نوێنەری خۆمان لە تاران نارد، هەتا بزانین چی بووە، بە درێژی لە هەواڵی خیانەتێکی گەورە ئاگاداری کردینەوە، داوای رێنومایمان لە بارزانی کرد، وەڵامی دایەوە، کە موحسین دزەیی بە هەموو ئاگادارییەکەوە دەگەڕێتەوە لاتان))[362]. هەر لە بارەی بیستنی هەواڵی رێککەوتننامەی جەزائیرەوە ئیبراهیم جەلال دەنووسێت: ((رۆژی ١٩٧٥/٣/٦ هەواڵ وەك هەورە تریشقەی پاش بروسکەی گەواڵە هەوری بەهار لە هەموولایەك، لە بەرەکانی شەڕ، لە بارەگاکانو لە فرۆشگاو بازارەکان، لە ناو ئۆردووگاکان، لە کوردستانو عێراقو ئێران دەنگی دایەوە))[363]. هەروەها دەڵێ: ((ئێوارەی رۆژی ١٩٧٥/٣/٦ ئێران تۆپخانەو چەكو جبەخانەکانیانو سوپاکەیان کێشایەوە بۆ ناو

٣٦٠- موحسین دزەیی: لە هەولێر لەدایك بووە، دەرچووی کۆلێژی یاسایە، ئەندامی باڵای داداگاری شۆڕشو دوایی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیو باڵوێزی عێراق بووە لە چیکۆسلۆڤاکیاو وەزیر بووە لە حکومەتی عێراق. بڕوانە: (دزەیی: أحداث عاصرتها).

٣٦١- شەفیق قەزاز: لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، برازای سەعید قەزازی ئەوا وەزیری ناوخۆی سەردەمی پاشایەتی بووە، نوێنەری شۆڕش بووە لە تاران. بڕوانە: (دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٩٦، ٣٠٦)

٣٦٢- البارزاني و الحركة، ج٣/ص ٢٤٥-٢٤٧

٣٦٣-خوارووی کوردستانو ل٢٩٢

## خاڵە نهێنیەکانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر

هەتا ئێستاش دەقی تایبەت بە بەشە نهێنیەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە بەردەست نین، پوختەی گرنگترین ئەو دۆسییانە ناراستەوخۆ بەپێی بەرئەنجامەکانی دەرکی پێدەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوە پوخت دەبنەوە:

یەکەم: نابێت عێراق هیچ جۆرە پشتیوانیەك لە ڕێکخراوە دژە ئێرانیەکان بکات، کە شاری بەغدایان کردبووە مەڵبەندی خۆیان بە تایبەت (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران = حدکا)[240] و (شۆرشگێڕانی زەفار)[241]، کە وەکو بەرهەڵستکاری ڕژێمی شا بەدیارکەتبوون و عێراق پشتگیری لێدەکردن[242]. ئەمەش لەوەدا پشتڕاست دەکرێتەوە، کە

قاسملو دەڵێ: ((دەوڵەتی عێراق تازە ڕێککەوتننامەی لەگەڵ ئێران مۆر کردبوو نەیدەویست لە جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ئەلجەزائیردا نوختەیەکی بێتەوە سەر،

---

٢٤٠- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران:لە سەر درێژەدانی خەباتی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان (ژێکاف) لە ساڵی ١٩٤٥ بە سەرۆکایەتی قازی موحەممەد دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٤٦-١٩٤٧ خاوەنی سەروەری سەرکردایەتیکردنی کۆماری کوردستانە. یەکێك بووە لە پارتە سەرەکیەکانی کوردستانی ئێران. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عەبدوڕەحمان قاسملو، عەبدوڵڵای حەسەن زادە: کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ب. ش، ٢٠٠٢" عثمان علي: دراسة في حركة الكردية للعاصرة، ص٦٤٥-٧٧٨)

٢٤١- شۆرشگێڕانی زەفار: (١٩٦٥-١٩٧٥) لە هەرێمی زەفار لە عومان دژی سوڵتانی عومان پەیدابوون، دواتر دروشمی ئازادکردنی هەموو عومان و کەنداوی عەرەبیان بەرانبەر داگیرکەری بەریتانی بەرزکردەوە ، عێراق و هەندێ لە وڵاتانی عەرەبی پشتیوانیان لێکرد، بەڵام ئێران لە بەرانبەردا پشتیوانی لە سوڵتانی عومان دەکرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (محمد علي اللوزي: موضوع الخاص في تاريخ العرب الحديث،، بیروت ١٩٩٩، ص٤٣٢-٤٣٦)

٢٤٢- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢١

لیژنەیەکی بەرفراوان لە بالۆیزو شارەزایانی بواری جوگرافیاو ئەندازەو نوێنەری زۆربەی وەزارەتە گرنگەکان[٣٥٧]

کۆبوونەوەکان لە ئاستی وەزارەتو لیژنەی بالاو لیژنە فەرعیەکان لە مانگی ئازاری ١٩٧٥ەوە بە شێوەیەکی کارا دەستیان بەکارەکانیان کرد، ئەو لیژنە هاوبەشە بە سەرپەرشتی (عەبدولعەزیز بۆتەفلیقە)ی وەزیری دەرەوەی جەزائیر بووە، لە ١٣ی حوزەیران هەموو پرۆتۆکۆڵەکان لەلایەن وەزیری دەرەوەی جەزائیرو وەزیری دەرەوەی عێراقو ئێرانەوە واژۆکران[٣٥٨].

٣٥٧- بۆ زانیاری لە سەر پێکهێنانی ئەو دوو لیژنەیە. بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٤)

٣٥٨- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: پرۆتۆکۆڵەکان لە بەڵگەنامەکانی (٣)

## باسی دووەم

# ئامادەکارییەکانی سەرکردایەتی کورد بۆ ئەگەری ڕێککەوتنی عێراق و ئێران

پوختەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لەوەدا کورت دێ، کە سەودای داگیرکارانی کوردستان بوو لە سەر حیسابی شۆڕشی کوردستان[٣٥٩]، بۆیە گرنگە هەڵوێستی سەرکردایەتی سیاسی کورد تێبگەین بەرانبەر پیلانێکی کارای لەو جۆرە، ئەمە لە کاتێکدا مێژووی شۆڕشەکانی کورد زۆر ویستگەی تێدایە لە بابەت هۆکاری دەرەکی و هەڵوێست نواندنی کورد لە هەمبەر ئەو هۆکارە. لێرەدا لە دوای خستنەڕووی وردەکارییەکان لە بەبابەت بڵاوبوونەوەی هەواڵی ڕێککەوتننامەی جەزائیر باس لە هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد دەکەین.

لە بارەی هەواڵی بەستنی ئەو ڕێککەوتننامەیەوە مەسعود بارزانی دەنووسێت: ((لە سەر داوای شا، بارزانی بانگهێشتی تاران کرابوو، لە ٢٦ی شوباتی ١٩٧٥ بە

٣٥٩- نورەدینی: سیستەمی نوێی جیهانی و، ل١٠٥، عەبدولڕەزاق عەلی: پیلانی جەزائیر گەلەکۆمەکی دونیای دوو جەمسەری بە دژی کورد و شۆڕشەکەی، گۆڤاری گوڵان، دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گوڵان، ژ(٢٦٨) ی ٢ی ئازاری ٢٠٠٠، ل١٢

لە دوا بڕیاری بارزانی بۆ کۆتایی هێنان بە بەرگری یەکێك لە گرفتە گەورەکانی ئێران هەردوو وڵات ئاوارەبوانی کوردی عێراق بوو بۆ ئێران، بۆ ئەو مەبەستەش ئێران ڕێگەی تەواوی بە ڕاگەیاندنی عێراقی دابوو لە ناو ئاوارەکان کار بکات بۆ گەڕانەوەی زۆرترین ئاوارە بۆ عێراق[٢٥٣].

لە هەموو دەقی ڕێککەوتننامەکەو پرۆتۆکۆڵەکانی لەگەڵیدا واژۆکران، وردەکاریەکانی میکانیزمی تواندنەوەی شۆڕشی کوردو ڕێگری کردن لە سەرهەڵدانەوەی شۆڕش بە هێما گوزارشتی لێکراوە یان براوەتە خاڵە نهێنیەکان، یان لە دەقە نهێنیەکان باسی هاتووە، بەڵام ئەو ئاماژانەی سەرەوەو شرۆڤەکاری مەیدانی، کە لە ئاکامی بەرئەنجامەکانی دەست دەکەوێت، ئەوە دەسەلمێنن، کە ڕێککەوتننامەی جەزائیر مادەی نهێنی هەیە.

خاڵێك هەیە عێراق لە بیانوو هێنانەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر دەی ووژاند، ئەویش گەڕاندنەوەی ئەو زەویانەی ئێران دەستی بە سەراگرتووە، کە گوایە ئێران لە سەردەمی شا نەیگەڕاندۆتەوە، دەبوایە بیداتەوە عێراق، وەکو (زەینەلقوس و سەیف سەعد)[٢٥٤]، کە لە ڕێککەوتننامەو پرۆتۆکۆڵە ئاشکراکانی ساڵی ١٩٧٥ بەرچاو ناکەوێت، لە بەرانبەریشدا بەرپرسانی ئێران باس لە هەندێك سنووری وشکانی دەکەن، کە ناکۆکی لە سەر بووەو بە پێی پێکهاتنی هەردوولا عێراق

---

ئازاری ساڵی ١٩٧٥ بە نیهادەی یەکگرتووی عێراق و بە هەوڵی سەرکردایەتیە کارزانەکەی دەستی بە سەرداگیرا) بڕوانە: (مصطفى البارزانی بین الاسطورة و الحقیقة، ص١٩٣)

٢٥٢- دانشجوان پیرو امام، اسناد لانە جاسوسی – کوردستان (٢)، شمارە (٣١)، ص١٠٣

٢٥٣- البارزاني: البارزاني و الحركة، ص٢٩٦

٢٥٤- هريدي: كيسنجر و ادارة الصراع الدولي، ص١٧٥-١٧٦.

ڕێککەوتنێکی نووسراو نەبووە[٣٧٥]، لە وتارێکی ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسیدا هاتووە، کە ((...ئێران هەرگیز نەیهێشتووە کوردەکان لە بەشی سێ ڕۆژان پتر تەقەمەنیان لە بەردەست دابێت، کۆمەکی سوپای ئێرانی بۆ لەشکری کوردی زۆر بە قورسی خرابووە ژێر چاودێرییەوە...))[٣٧٦]، یارمەتی نەدانی شۆڕشی کورد بەو ئەندازەیەی لە شەڕی بەرگرییەوە بچێتە شەڕی هێرش بردنو تەنگهەڵچنین بە سوپای عێراقی جێگەی هەڵوێستە لە سەر کردن بووە[٣٧٧]، لەو بارەیەوە جەرجیس حەسەن دەنووسێت: ((...هارکاریکردنی بزووتنەوەی چەکداری کورد بە ئەندازەیەك بووە نەبێتە سەرچاوەی تەنگژەو لاوازی بۆ عێراق، کە سەرکەوتنی تەراو بەدەست بهێنن، هەتا شا گەیشتە ئەو باوەڕەی کورد ئەرکی سەرشانی بەجێ هێناوە، بۆیە لەگەڵ سەدام حوسێن لە ڕێککەوتنی جەزائیر بە یەکگەیشتن))[٣٧٨]، ڕاپۆرتی پایك ئەو بابەتەی بە ڕوونی بەدیار خستووە، کە ئەمریکاو ئێران لە سەر ئەو خاڵە یەك دەنگ بوون، دەنووسێت: ((..ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکەمان سیاسەتی "سەرکەوتن بە دست نەهێنان"یان پەیڕەو دەکرد، چونکە ئەو بەڵگانەی لە بەردەست دان بە ڕوونی ئەوە بە دیاردەخەن، کە هەر یەك لە سەرۆکەو کیسنجەرو سەرۆکی دەوڵەتی بیانی

---

٣٧٥- ئەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٢

٣٧٦- ژێرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلێکی، ل٢١٥

٣٧٧- ئێرانو ئەمریکا هەتا لە سەر جۆری ئەو چەکەی دابوویانە شۆڕشی کوردستانو چۆنیەتی بەکارهێنانی یەك دەنگ بوون. کە چۆن جولانەوەی کورد وەکو کارتی فشار بەکاری بهێننو خواستی ستراتیژی نەیاتەدی. بۆ زانیاری زیاتر لەوبارەیەوە. بڕوانە: (گۆزینتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٣٣١-٣٣٢)

٣٧٨- ترکیا في ستراتیجیة الامریکیة، ص١٢٤

بۆ کراوە، کە ئەو شەوە ئێران بە بێ ئاگاداری پێشوەخت هەموو چەکو هێزەکانی بەرگری زەویو ئاسمانی کێشاوەتەوە بۆ ناو ئێران، دەڵێ: ((ئەوجا ئێمە تێگەیشتین لە گەورەیی ئەو پیلانە))[369].

هەر لەوبارەیەوە نەوشیروان مستەفا دەنووسێت: ((...کۆبوونەوەی شاو سەدام لەگەڵ یەکتریو رێککەوتنەکەیان بۆ بارزانیو سەرکردایەتیو بزوتنەوەی کورد رووداوێکی کتوپڕی چاوەڕێ نەکراو بوو، ئەوانیش وەکو خەڵکی دیکە لە دەزگاکانی راگەیاندنی جیهانیەوە بیستیان...))[370].

لە روانگەی ئەو دەقو روونکردنەوانەی پێشەوە گومان نامێنێت، کە رێککەتنامەی جەزائیر بەو شێوەی گەیشتنە ئاکام، دوای هەشت سەعات لە واژۆکردنیەوە دەستکرا بە جێبەجێکردنی، ئەوە بۆ مستەفا بارزانیو سەرکردایەتی کورد لە ناکاوو جێگەی سەرسوڕمان بووە، تویژەر ناتوانێت دەروازەیەك بدۆزێتەوە بۆ گومان دروستکردن لە سەر ئاگاداری پێشوەخت.

ئاماژەو شرۆڤەی هەوڵەکانی پێش ساڵێك لەو رێککەوتنامەیە ئەوە دەگەیەنێت، کە سەرکردایەتی کورد لە سەرەتای وەرگرتنی هاوکاری لە ئێرانو ئەمریکا درکی بە ئاکامێکی لەو جۆرە کردووە، بەڵام رێوشوێنی جێگرەوەی نەگرتۆتەبەر.

لە چاوەڕوانی سەرکردایەتیەوە بەدوور بووە بەو شکڵو میکانیزمە رووبدا، لایەنی کەم حیسابی بۆ ئەو تێگەیشتنو هەواڵو ئاگادارییانە نەکردووە، کە لە سەر لێك نزیکبوونەوەی هەردوو وڵات بیستوویەتی، بەڵام نەخشەی سیاسیو سەربازی زیاتر ئەگەری پێشهات دادەنرێت، ئەو ئەگەرەش بۆ ئەو حاڵەتانە هەمیشە کراوە بووە.

---

٣٦٩- أحداث عاصرتها، ص٢٩٢

٣٧٠- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٢٨-٢٩

ئەگەر بە شێوەی پرسیار بیخەینەڕوو، سەرکردایەتی کورد لە سەر چ کەرەستەیەك بڕوای بە خۆی هێنابوو، کە عێراق‌و ئێران هەرگیز ڕێك ناکەون یان ڕێککەوتن‌و بەو گەرم‌و گوڕیە کاردانەوەی لە سەر شۆڕشی کوردستان نابێت، لێرەدا ئەو کەمتەرخەمیە بەدیار دەکەوێ.

یەکەم: لە سەرەتای سالّی ١٩٧٤و کۆتایی سالّی ١٩٧٥ گەرمەی هەوڵی ناوبژیوانان بووە بۆ پێکهێنانەوەی هەردوو وڵات، ئاماژەیەك دەست ناکەوێت لە سەر کۆبوونەوەی سەرکردایەتی‌و (م‌س)ی (پ‌د‌ك) لە سەر دیراسەکردنی ئەو مەترسیانەی لە سەر ئەگەرە دەرەکییەکان هەبووە، لە بەرانبەردا ئاماژەی ڕوون هەیە، کە مستەفا بارزانی متمانەی بە شا نەبووە، کە چۆتە ناو هاوکێشەی ئەمریکی – ئێرانی ئەو بێمتمانەییەی نەشاردۆتەوە[271]، ئەمریکیەکانی پێ زەمانەت بووە، ڕاپۆرتەکەی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا (پایك) ئەو قەناعەتەی پشت ڕاست کردۆتەوە[272]، ئەمە لەکاتێکدا مستەفا بارزانی دوای نووشستی شۆڕشی کورد دان بەوەدا دەنێ، کە هیچ زەمانەتی نووسراو نەبووە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە، بە پێی بەڵگەکان لە سەردانەکەی

---

٢٧١- بۆ زیاتر دڵنیابوون لە بەدیارخستنی بێمتمانەیی مستەفا بارزانی بە شای ئێران بڕوانە: (گۆێتەر دیشنەر: کورد گەلیکی، ل٣٤٢" بارزانی: البارزاني و الحركة، ص٢٧١-٢٧٢)

٢٧٢-لە ڕاپۆرتی ناوبراودا هاتووە-(سەرۆکی کۆمەڵەی ئەو ڕەگەزە "مەبەستی مستەفا بارزانی"یە لە زۆر بۆنەدا وتوویەتی، کە متمانەی بە هاوپەیمانەکەمان "مەبەست لە شای ئێران"، نیە، بەڵام ئەو متمانەیەی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیەتی، هەر وەکو خۆی دەریبڕیوە متمانەی بە هیچ زلهێزێکی دیکە نیە..) بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٦).

لە وەڵامی پرسیارێکی (گۆزێنتەر) لەو بارەیەوە ئایا گەورەترین هەڵەی شەخسی چی بووە بارزانی کردبێتی؟ لە وەڵامدا دەڵی: ((گەورەترین هەڵەی ژیانم، ئەوەیە متمانەم بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، باوەڕم بەو گفتو بەڵێنانە کرد کە پێیان داین)) [287]

دووەم: بە پێی ئەو ئاماژانەی لەبەردەستدان سەرکردایەتی کورد گوێبیستی هەواڵی کۆبوونەوەی نوێنەرانی عێراق و ئێران بووە، لەو بارەیەیەوە مەحمود عوسمان دەڵێ: ((سەرکردایەتی کورد ئاگاداری ئەو پەیوەندیانە بووە لە نێوان هەردوو وەزیری دەرەوەی عێراق و ئێران کراوە)) [288]، هەروەها مەسعود بارزانی دەنووسێ: ((لە هاوینی ساڵی ١٩٧٤ لە گەرمەی شەڕەکانی کوردستان بە رێگەی هەواڵگری خۆمان هەواڵمان پێگەیشت لە سەر گفتوگۆی نهێنی نێوان رژێمی عێراق و ئێران، کە نزیکە رێک بکەون، کۆبوونەوەکەش لە نێوان (سەعدون حەمادی) و (عەلی خەلعەتبەری) وەزیری دەرەوەی عێراق و ئێراندا بووە لە ئەستەنبوڵ، دوای ئەوەش کۆبوونەوە هەر بەردەوام بووە، ئەوەمان بیست، کە ئیسرائیل رۆڵی لەو کارەدا هەبووە، لە هەمان کات بەڕێوەبەرایەتیە ئیسرائیلیەکان جەختیان دەکردەوە، کە شا خیانەت لە شۆڕشی کورد ناکات) [289].

ئەوانەی لەو کاتە لە نزیکەوە چاودێری رووداوەکانی کوردستانی عێراقیان کردووە لەو بڕوایەدابوون سەرکردایەتی لە پێشتر ئاگاداری سەرەداوی ئەو نەخشەو پیلانە بوو،

---

٢٨٧- گۆزێنتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٣٤٥.

٢٨٨- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٢٤)

٢٨٩- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص ٣٤٤.

ئێران...))[٣٦٤]، کۆچێرا دەنووسێت: ((...کوردەکان هەواڵی ڕێککەوتنی جەزائیریان لە ڕادیۆوە ژنەوت.... لە ڕادیۆی بی بی سی، لە دەنگی ئەمریکا، لە ڕادیۆی قاهیرە، ڕادیۆی ئیسرائیل‌و ڕادیۆی بەغدایە))[٣٦٥]، هەروەها دەنووسێت: ((...هەمان شەوی ١٩٧٥/٣/٦ ئێرانیەکان ئەو تۆپخانەو فڕۆکەشکێنانەیان، کە بۆ بەرگری لە بارەگای جەنەڕاڵ بارزانی لە حاجی ئۆمەران هێنابوو کۆیان کردەوەو بردیانەوە بۆ ئێران...))[٣٦٦]، دیارە سەرکردەکانی کورد بەو بێویژدانیە چاوەڕوانی ئاکامەی نەدەکرد، چونکە تا کۆتایی باوەڕیان نەدەکرد، بە ئەمابوون ڕێککەوتنەکە هەندێ شتی بۆ کوردیش تێدابێت[٣٦٧].

موحسین دزەیی یاوەری بارزانی بووە، لە یاداشتەکانیدا ئەوەی روون کردۆتەوە، کە لە تاران بوون‌و لە ڕێگەی ڕادیۆی تاران‌و بەغداو لەندەنەوە گوێیان لەو هەواڵە بووە، خۆیان بەوە دڵخۆش کردووە، کە ئەمەش وەکو ڕێککەوتنامەکانی دیکەی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە جێبەجێ نابێت[٣٦٨]، بۆ بەیانیەکەی شەفیق قەزاز نوێنەری شۆڕش لە تاران هاتۆتە لایان‌و پێی ڕاگەیاندوون، کە بروسکەی لە ئیدرس بارزانی‌و مەسعود بارزانیەوە

---

٣٦٤-هەمان سەرچاوە، ل٢٩٣

٣٦٥-کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا، ل٤٢١

٣٦٦-هەمان سەرچاوە، ل٤٢٢

٣٦٧- هەمان سەرچاوە، ل٤٢٣-بە لای حکومەتی عێراقیشەوە وا بەزووی چاوەڕوان نەکراو بوو، بەڵام دەستکەوتی ئێران لەو ڕێککەوتنە ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێ، کە گەرەو گوڕ بەرەو پەی جێبەجێکردنی ئەو ڕێککەوتنامەوە بچێ..

٣٦٨- لە ڕێککەوتنامەی ساڵی ١٩٣٧ بە دواوە هیچ ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان عێراق‌و ئێران وازۆلە کراوە جێبەجێ نەکرابێ، هەتا وەکو پاساو ئومێدی جێبەجێنەکردنی ئەو ڕێککەوتنامەیەی لە سەر بنیات بنرێ.

دەیانویست بەکرێگیراوەکانمان سەرکەوتن بە دەست نەخەن...))[279]، ئەوە مەبەستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، کە هاوڕای ڕژێمی شا بووەو وەك بەکرێگیراو سەیری بزوتنەوەی کوردی کردووە.

لەلایەکی دیکەوە لە دوای شەش مانگی یەکەمی شەڕ نیو ملیۆن کەسی مەدەنی لە سەر سنوورەکان خڕبوونەوەو بارزانی داوای پەنابەری بۆ لە ئێران کردن[280]، ئەمەش دەچێتە خانەی ئەو ڕەخنەیەی دەکرێ لە سەرکردایەتی بگیرێ، کە ناکرێ ولاتێك متمانەی پێی نەکرێ‌و ئەو ئەندازە پەناهەندەیە ئەو هەنگاوە پێچەوانەی باوەڕی سەرکردایەتی پێی هەبووە.

سەرکردایەتی داوای لە هەموو ئەندام‌و لایەنگرانی خۆی لە ناو دام‌و دەزگاکانی حکومەت‌و ژێردەسەلاتی حکومەت کردووە بێنە ناوچە ئازادکراوەکان[281]، لەلایەکی دیکەوە، پشتبەستنی تەواو بە چەلو دژە ئاسمانی ئێران بەستووە، کە چالاکی پێشمەرگانە بە تەواوی لە کۆتایی سالی ١٩٧٤ەوە کەوتۆتە دەست ئێران[282]، ئەفسەرو پلەدارانی ئەو ولاتەی متمانەی پێناکرێت! ئەمەیە دژە لە نێوان قەناعەت‌و هەنگاونان، سەرەتای هەنگاونانی سەرکردایەتی کورد بە بێ بەرچاوڕوونی.

سەرکردایەتی کورد لە بەرانبەر شا بە گومان بووە، بەلام ئەو هەنگاوەی ئەوکات هاریشتوویەتی هیچ مانای بۆ بێمتمانەیی نەهێشتۆتەوە، قورسایی پشتیوانی شۆڕشی

---

٢٧٩- بڕوانە: ڕاپۆرتی پایك بەلگەنامەی ژمارە (٦)

٢٨٠- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٩

٢٨١- لە ڕێگەی ئێزگەی شۆڕشەوە لە ڕۆژی ١٩٧٤/٣/٢٣ ئاگاداری بۆ هەموو چین‌و توێژەکانی کوردستان خوێندرایەوە، کە ناوچەکانی ژێردەسەلاتی بەعس چۆل بکەن.. بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٩٦)

٢٨٢- هەمان سەرچاوە، ل٣٧٤

کورد لە ئەستۆی ئێران دابووەو لە سەرەتاوە ئێران ڕێنوماییی ئەمریکای کردووە بۆ بەکارهێنانی کارتی کورد دژی پێگەی یەکێتی سۆڤیەتی لە ناوچەکە.

مەحمود عوسمان دەڵێ: ((...یارمەتی ئەمریکی‌و ئیسرائیلی ڕەمزی بوون، کەچی ئێران بە تایبەت لە ساڵانی ١٩٧٣، ١٩٧٤ دە ئەوەندەی بۆ دەناردین))[٢٨٣]، بڕوا بە خۆهێنان، کە ئەمریکا ڕێگە نادات شا پشت لە کورد بکات!. بەڵام لە مەیدانەکەدا ئێران لە بەردەم شۆڕشی کورد بە دۆست‌و پاڵپشتی ستراتیژی بە دیار کەوتووە. ئەوەی پێویست بوو لە ئاستی ناوخۆ پشتبەستن بە ئێران کەم نەکرایەوە، بە جۆرێ حیساب بۆ ئەو ئەگەرە نەکرا، کە جێی متمانە نەبووە، بە پێچەوانەوە ئێران لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە بە کردەوە بە وڵاتێکی متمانە پێکراوو دۆستی ستراتیژی دەچێ، وەکو نووسەر ئاماژەی پێداوە، لە بەرانبەر زەمانەتی متمانە بە ئەمریکاش هیچ ڕێککەوتننامەی نووسراوو بەڵێنی گرەنتی نەبوو بۆ ئەو دڵنیاییەی سەرکردایەتی ئومێدی لە سەر هەڵچنیبوو[٢٨٤]، ئەو خاڵە بزوە کە سەرکردایەتی کورد پشتی پێ قایم کردبوو[٢٨٥]. سکرتێری ئەوکاتەی (م‌س)ی (پ‌د‌ك) حەبیب موحەممەد کەریم دەڵێ: ((لە هاوینی ساڵی ١٩٧٢ لە تاران بارزانی کیسنجەری بینیوە))[٢٨٦]، سەرچاوە لەبەردەستدانییە لە ئاڵوگۆڕی نامە بەولاوە کیسنجەر خۆی نیشاندابێ، بۆیە لە ئەندازەی پەیوەندییەکانی کوردو ئەمریکادا زیادڕەوی بووە.

---

٢٨٣- چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لەگەڵ ناوبراو لە ژمارەی (١٥٢٤)ی ڕۆژی ١٩٩٧/١٢/٢٣

٢٨٤- گۆرتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٢٨٠

٢٨٥- بە پێی ڕاپۆرتی (پایك) پشتیوانی ئەمریکا بۆ کورد زیاتر لە ڕێگەی ئێرانەوە ڕوخسارێکی هەواڵگری پێوە دیار بووە. بڕوانە: (دەقی ڕاپۆرتەکە لە بەڵگەنامەی ژمارە (٦)).

٢٨٦- حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص١٣٢.

نیکسۆن‌و کیسنجەر لە ١٩٧٢/٥/٣٠ بۆ ئێران شا پشتگیری لە شۆڕشی کورد وەکو فشار بۆ سەر حکومەتی عێراقی پێشنیاری شا بووە نە سەرۆکی ئەمریکا[٣٧٣]

لایەنێکی دیکەی پشت بەستنی مستەفا بارزانی بە هاوکێشەی ئێران‌و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەکو نووسەر روونی کردۆتەوە لە سەر قەناعەتێکی هەڵە دانرابوو، دەنووسێ: ((هەڵەکە لەوەدا بوو بارزانی وای دەزانی یارمەتی وەرگرتن لە (c.i.a) بەو مانایەیە بزوتنەوەی کورد بە شێوەیەکی نیوەڕەسمی لەلایەن ئەمریکاوە ناسراوە، راستییەکەی ئەوە بوو بارزانی بە زهنیەتی ئەخلاقییەوە ئاگاداری تیۆریی واقیعخوازانەی سیاسەتی ئەمریکاییەکان نەبوو، بۆیە گەشبینانە دەیروانیە بابەتەکەو بەهیوا بوو ئەمریکا بۆ بەردەوامبوونی یارمەتی بزوتنەوەکەی بدات))[٣٧٤]، لێرەوە بەدەردەکەوێ، کە بارزانی ئومێدی لە سەر یارمەتی‌و پشتگیری ئێران هەڵنەچنیبوو، بەڵکو ئەوەی جێی ئومێدی ئەو سەرکردایەتیەکەی بووە، ئەمریکا بووە، کە بەنیاز بووە وەکو پشتیوانیەکی ستراتیژی بێنێتەوە بۆ بزاڤی رزگاریخوازی کوردی.

لێرەدا درك کردنی مستەفا بارزانی بە گومان خستنەر سەر شای ئێران بۆ پشتکردنی لە شۆڕشی کورد، بە تیژی‌و پێشبینی ئەو بە دیاردەخات لە بەرانبەر پێشهاتەکان‌و ناسینی دوژمنان، بەڵام ئەوە بەتەنیا بەس نەبووە، بەڵکو ئەو بۆشایە گەورەیە ماوەتەوە، کە چۆن ئاراستەی چارەنووسی هەموو شۆڕشەکەی لە دەست ئێران ناوە، نەخشەو پلان‌و رێوشوێنی جێگرەوەی نەگرتۆتەبەرو لەگەڵ سەرکردایەتیەکەی ئەو بابەتەی نەخستۆتە دووتوێی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی رێگەچارەی هاتنە پێشەوەی ئەو نەگەرە مەترسیدارە، ئەمە لە کاتێکدا ئاماژە هەیە، کە لەگەڵ ئێران هیچ

٣٧٣- ایوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية و صراع القوى، ص٥٠٧-٥٠٨، ٥١٢
٣٧٤- فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، ل٣٥٩

کە دواتر ناکامەکەی دەرکەوت[٢٩٠]، بەڵام بە ڕاشکاوانە ڕێوشوێنی گونجاریان نەگرتۆتە بەر، سەرۆکی ئەوکاتەی میسر ئەنوەر سادات لە دوای کۆبونەوەی لەگەڵ شای ئێران لە ڕێگەی باڵوێزی خۆی لە لوبنان داوای دیتنی بارزانی کردووە، (سامی عەبدوڕەحمان) بە نوێنەرایەتی بارزانی چووە قاهیرە، لە ڕۆژی ٢١ی شوباتی ١٩٧٥ سەردانی ئەنوەر ساداتی کردووە، بە ڕاشکاوی سادات هەواڵی گفتوگۆی نێوان عێراق و ئێرانی پێڕاگەیاندووە، ئەوەشی پێ وتووە، کە کۆبوونەوەی عێراق و ئێران پەیوەندی بە کوردیشەوە هەیە[٢٩١]، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکی دۆستانەی ڕاستەوخۆ بووە، بەوەی کورد مشوری خۆی بخوات و ئایندەی خۆی لە بەر ڕۆشنایی ئەگەری پێکهاتنەوەی عێراق ئێران دیراسە بکات، لەو سەفەرە سامی چاوی بە ڕۆژنامەنووسی میسری بەناوبانگ (موحەمەد حەسەنین هەیکەل) کەوت، هەیکەل ئەو ئەگەرەی خستۆتە بەردەم سامی عەبدوڕەحمان، کە ئەگەر هەردوو وڵات پێک بێن سەرکردایەتی کورد چی دەکات[٢٩٢]. دەکرێ لە بەرانبەر پرسیارێکی ڕۆژنامەنووسیدا بڵێت بەرگری دەکەین،

---

٢٩٠- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٩٢" الخراسان: التيارات السياسية، ص١٨٩، بە مێژووی ٢٢ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ مستەفا بارزانی نامەی بۆ کیسنجەر نووسیوە، ئاگاداری کردۆتەوە لە مەترسی لێکنزیکبوونەوەی عێراق و ئێران و چارەنووسی کورد، دوای لێکردووە وەختێکی کوردی سەردانی ڕاشتۆن بکات، کیسنجەر بە مێژووی ٢٢ شوباتی ١٩٧٥ وەڵامی نامەی بارزانی لە چەند بڕگەیەکی گشتیدا داوەتەوە، بەڵام دڵنیاکردنەوەی تێدا نییە. بۆ دەقی نامەی کیسنجەر بۆ بارزانی. بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٧)

٢٩٠- چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لەگەڵ مەحمود عوسمان. بڕوانە: ژمارەی (١٥٢٤)ی ڕۆژی ١٩٩٧/١٢/٢٣

٢٩١-کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤١٧" ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٨٩

٢٩٢- کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤١٧، نەوشیروان مستەفا : لە کەناری داتوبەوە، ل ٢٧

بەلام ئەمە لە رووی سیاسییەوە ئاگادار کردنەوەی پێشوەخت بووە بۆ سەرکردایەتی شۆڕش، کە کاری لە سەر نەکردووە، سەرەڕای ئاگاداری ئاوبڕیوانی میسر، بارزانی ئاگاداری هەوڵەکانی ئوردن‌و جەزائیریش بووە بۆ کۆتایی هێنانی ناکۆکی عێراق‌و ئێران[٢٩٣]. لە مانگی شوباتی ١٩٧٥ەوە سەرکردەکانی شۆڕش ئاگاداربوون بە ئاوبڕیوانی کردنی عێراق‌و ئێران، بەلام پێیان وابوو ئەو دوو وڵاتە دەگەنە یەك[٢٩٤]، کە ئەمەش شرۆڤەی دروست نەبووە بۆ پێشهاتەکان یان هیچ نەبێ لە رێگەی سەرکردایەتی‌و (م‌س) بە کۆمەڵ شرۆڤە بۆ پێشهاتەکان نەکراوە.

سێیەم: هەڕەشەی سەدام حوسێن لە ئیدریس بارزانی لە دوا کۆبوونەوەی نێوان وەفدی سەرکردایەتی کوردو بەعس، ستراتیژیەتی بەعس لە بەرانبەر هەڵگیرسانەوەی شەڕی ٨ی ئازاری ساڵی ١٩٧٤ زۆر روون‌و ئاشکرا کردووە، بەمەش نەخشەی رێگای حکومەتی عێراقی لەبەردەم سەرکردایەتی کورد ئاشکراکردووە، واتە لە هەموو حاڵەتێکی پاشەکشێی حکومەت، کە بە پشتیوانی ئێران ئەنجام بدرێ، ئەوا سازش بۆ ئێران لە بەردەم حکومەت کراوەیە.

چوارەم: بەر لە رێککەوتننامەی جەزائیر لێدوان‌و چاوپێککەوتنی بەرپرسانی هەردوو وڵات، حاڵەتی پێکهاتنەوەی پێوە دیارە، بەلام هەڵوێستە لە سەر ئەو لێدوان‌و چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانیانە نەبووە، لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ رۆژنامەی ئەهرامی میسری لە ٢١ی شوباتی ١٩٧٥ واتە ٢٠ رۆژ پێش راگەیاندنی رێککەوتننامەی جەزائیر سەدام حوسێن دەڵێ: ((کوردەکان لە بارزانی دەکشێنەوە، ئەوەی بەدەستیەوە دەمێنێت راوێژکارە ئیسرائیلیەکانە، باسی هاریکاری ئێرانی نەکردووە بۆ بارزانی،

---

٢٩٣-ئیتیسار: ئێتنونەتەوایەتی کوردی، ل٢٦٤.

٢٩٤ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٨٨-٢٨٩

ئاماژەی کردووە بە تـەبایی دراوسـێیەتی لەگـەڵ ئێـرانو نەچـۆتە سـەر باسـی مـافی سـەروەریەتی عێراق لە شەتولعەرەب))[295]، پێدەچێت سەدام حوسێن ئەو کـات بڕیـاری ئەوەی دابێت، کە بەو نزیکانە پەنا بەرێتە بەر سازش بۆ ئێـران، کـە بەرئەنجامـەکانی دواتر ئەوەی بەدیارخـست.

ئەو ڕێوشوێنەی گیابووە بەر لەو ئاستەدا نەبووە، خۆی لەبەر ئـەو ئەگـەرە بگـرێ، مەسـعود بـارزانی لەوبارەیـەوە دەنووسـێت: ((...چـەند هەوڵمانـدا ئامـانج لـەو نزیکبوونەوەی عێراقو ئێران بـزانین. لـە سـەر ئـەو زانیاریانـەی دەسـتمان کـەوتبوو نامەمان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نارد، داوامان لێکردبوون وەفادارین بەو پەیمانـەی بـە ئێمـەیان داوە، هـەتا شۆڕشـەکەمان نووشسـتی نـەهێنێت... لێـدارەی ئەمریکی بە تەواوی نەفیان کردبوو، کە لێکنزیکبوونەوەیەك یان مـۆرکی سیاسـی وا هەبێت زیان بە تێکۆشانی کورد بگەیەنێت، لەلایەکی دیکەوە لە سەر ئەو زانیـاریانـە نامەمان بۆ شا نارد ئەویش لە نامەیەکدا بـۆ بـارزانی دڵنیـایی کـردەوە، کـە پشـتی شۆڕشی کوردی بەرنادات، بارزانی بە نوێنەری تایبەتی خۆی لە سـەر ئـەو زانیاریانـە نامەی بۆ هەریەك لە مەلیك حوسێنو سادات نارد))[296].

لە شوباتی ساڵی ١٩٧٥یش بارزانی، بە سامی عەبدوڕەحمان نامـەی بـۆ سـادات ناردبوو، لەو نامەیەدا داوای لێکردبوو، کە عەرەب بێنو ئەو کێشەیە لە نێوان کوردو عێراق چارەسەر بکەن، ساداتیش بـەڵێنی دابـوو هەرچـی لـە توانـای دابێـت هـەوڵ

---

٢٩٥- سلومر تكدين: الموساد في العراق، ص٢٩٨

٢٩٦- البارزاني و الحركة التحررية، ج٣/ ص٢٤٤. کە لە ڕاستیدا مەسعود بارزانی لە پەراوێزی بەڵگەنامەکان نامەیەکی درێژی مستەفا بارزانی خستۆتەڕوو، کە لە ١٩٧٤/٢/١٦ ئاراستەی هەموو پاشاو دەوڵەتانی ئیسلامی کردوە لە سەر کارە دژێوەکانی حکومەتی عێراق بەرانبەر کورد. بۆ دەقی نامەکە بڕوانە: (البارزاني والحركة، ج٣/ ص٨٥٦-٨٥٨)

بدات[297]، ئەمەش هەنگارنانێکی دروستی دیکە بووە لە ئاست رێگە چارە بۆ ئەو مەترسیە، بەڵام تەنیا هەوڵێکەو نەبووە بە ئەڵتەرناتیڤ، هەروەکو دواتر دەرکەوت سادات هەنگاوی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە نەهاویشت، نامەکەی مستەفا بارزانیش درەنگ بووە، چونکە ئەوکات عێراقو ئێران تەواو لێك نزیك ببوونەوە.

لێرەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، ئاگاداری گفتوگۆی نێوان عێراقو ئێران بووە، شۆڕشیش هەموو قورسایی پشتیوانی خۆی بە ئێرانەوە بەستۆتەوە، ئەگەر هەردوو وڵات پێك بێن شۆڕشی کوردستان زیانی لێدەکەوێت، بەڵام چاوەڕوانی زیانی وا گەورە نەبوون، هەنگاوی کردەیشیان نەگرتەبەر بۆ ئەگەری ئەو زیانەی لە شۆڕشی کورد دەکەوێت، لە ئاستی بەرەکانی جەنگو شێوازی شەڕ، حیسابکردن بۆ ئازوقەو تەقەمەنیو چەك لە حاڵەتی سنوور داخستنی ئێران، لە ئاستی دۆزینەوەی رێگە چارەیەکی گونجاو بۆ ئاوارەکان، هەر هیچ نەبێت ئاگاداری خەڵك بکەن ئەوەی دەتوانێت لە شارو گوندی خۆی بمێنێتەوە، ئارام بگرێو ئاوارە نەبێت، خەڵکی مەدەنی لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش دووربخەنەوە، رێرەوی نەخشەی شەڕ لە شەڕی بەرەییەوە لە سەرخۆ کەم بکەنەوە، بیگۆڕن بە شەڕی پارتیزانی، ئەوانە هیچی نەکرا، بارزانی وەکو لە دوای ٢٦ی شوباتی ئەو ساڵە لە تاران بە (موحەمەد حەسەنین هەیکەل)ی وتبوو، ئەگەر عێراقو ئێرانیش رێك بکەون ئێمە شاخەکانو چەکەکانو پێشمەرگەکانمان هەر دەمێنن، بەردەوام دەبین لە خەباتی خۆمان[298]، ئەمە لەو کاتە دەکاتە ١١ رۆژ پێش راگەیاندنی رێککەوتننامەی جەزائیر،

---

٢٩٧- هەمان سەرچاوە.

٢٩٨- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٨٩

ئەگەر ڕیوشوێنی وردکردنەوەی ئەو پیلانەی بارزانی بە کردەوە بگیرایە خزمەتی پاراستنی شۆڕش دەکرد.

لە ماوەی مانگەکانی شوبات و سەرەتای ئازاری ۱۹۷٥ زانیاری دەست ناکەوێت لە سەر ئەنجامدانی کۆبوونەوەی (م‌س) و ئەنجومەنی سەرکرایەتی لە سەر بارودۆخی چاوەڕوانکراو بۆ ڕاوێژکردنی ئەگەری وەستاندنی پشتیوانی ئێران، پێدەچێت بەشێکی هۆکاری کۆنەبوونەوەی سەرکردایەتی لە سەر ئەو ئەگەرە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە لە مایسی ۱۹۷۲ لەوکاتەی چوونە ناو هاوپەیمانی ئەمریکی و ئێرانی بە بڕیار و ئاگاداری هەموو ئەندامانی سەرکرایەتی نەبووە، هەتا لە کاتی بەرئەنجامە مەترسیدارەکانی ئەو کارە کۆبینەوە و پرس و ڕای هەموانی لە سەر بکرێت، چونکە وەکو ئاماژە هەیە، لە ناو هێزی پێشمەرگە و فەرماندە سەربازیەکان ئەو هەواڵانە هەمووی نهێنی بووە[٣٩٩].

کاروباری سەرکردایەتی و پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە لە بندەستی بازنەیەکی بچوك کورتهەڵهاتبوو، کە ئەوانیش توانای سیاسی و لێکدانەوەی ڕووداوەکانیان سنووردار بووە، کارەکان لە ماوەی ئەو ساڵە بە کۆمەڵ نەبوون، زیاتر پەیوەندی دەرەوەش لەگەڵ ئێران و ئەمریکا بووە، ئەویش بۆ داواکاری مادی و چەك و تەقەمەنی، ئەگینا بەشداری کردن لە کۆنفراس و کۆبوونەوە پەیوەندیدارەکان بە مافی مرۆڤ و گەیاندنی کێشەی کورد بە ناوەندە نێودەوڵەتیەکان لە ماوەی دوای بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ و بە تایبەتی لە ماوەی شەڕی یەك ساڵە زۆر لاواز بووە، پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی بەرەی سۆشیالیزمی و وڵاتانی بێلایەنی ناو ململانێی هەردوو جەمسەر نەبووە، لە ئاستی دەرەوە بە تەواوی شۆڕشی کوردستان بۆتە پەراوێز و پاشکۆ بۆ ناکۆکی ئیقلیمی لە

---

٣٩٩- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٢/ص٣٧٨

نێوان عێراق و ئێران و ناکۆکی شەڕی سارد لە نێوان دوو جەمسەری بەرەی وارشۆ[٤٠٠] و ناتۆ[٤٠١]. بۆیە نووشستی شۆڕشی کوردستانی باشوور لە ئاکامی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ناوەندە ڕۆشنبیری و ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکان نارەزایی لێدروست نەبوو.

لە کاتی ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەی جەزائیریش سەرکردایەتی لە داوی پیلانی شا دابوو، شا بۆخۆی ئێرانی بەجێهێشتووە، بەرەو ئوردون چووە بۆ خۆئامادەکردن بۆ کۆبوونەوەی ڕێکخراوی (ئوپێك). ئەو کۆبوونەوەی تێیدا ڕێککەوتننامەی جەزائیری مۆرکرد، لە ٢٦ی شوبات بارزانی بانگهێشت کرابووە ئێران و چاوەڕوانی نەکردووە بارزانی ببینێت، یان دەکرێ بۆ ئەو مەبەستە وستبێتی لە ئێران بمێنێتەوە، لە ڕۆژی دوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر گەڕایەوە تاران، بەڵام پێنج ڕۆژ دوای ئەوە لە ١١ی ئازار خۆی نیشانی بارزانی و وەفدی یاوەری داوە، پێنج ساڵ لەوەپێش بارزانی لە ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ ڕێککەوتننامەی واژۆکرد و پرسی بە شا نەکردووە، گوێی بە نارەزایی شا نەداوە، شا ئەو ڕۆژەی وەکو تۆڵەکردنەوە دیاریکردووە[٤٠٢]، ئەمانەش بە

---

٤٠٠- بەرەی وارشۆ: هاوپەیمانیەتی سەربازی بووە لە نێوان وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات بە سەرۆکایەتی یەکیەتی سۆڤیەت کە لە ئایاری ساڵی ١٩٥٥ لە شاری وارشۆی پایتەختی وڵاتی پۆلۆنیا دامەزراوە، یەکیەتی سۆڤیەت و پۆڵەندەو تیشکۆسلۆڤاکیاو مەجەر و ڕۆمانیاو ئەلبانیاو بولغاریا ئەندامی بوون دواتر ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات چووە پاڵیان. بارەگای هاوپەیمانیەتی وارشۆ لە مۆسکۆ بووە، بەپێی پرتیپەکانی دامەزراوەی تایبەت بە خۆی هەبووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الكيالي و الاخرون: موسوعة السياسية، ج٧/ ص٢٤٨-٢٤٩)

٤٠١- بۆ زانیار زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: (اللجنة التحضيرية، تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص٦٢-٦٩)

٤٠٢- لەو بارەیەوە بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٣٤٥" ژیارە چالیارە و ئەوانیتر: گەلێکی، ل٣٩٥)

هۆی لە خۆبایی بوونی شارە بووە[٤٠٣]، بەڵام ناکرێ هەمووی بخەینە خانەی شرۆڤەی سایکۆلۆژیەتی شا لەبەرانبەر بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠و بارزانی.

موحسین دزەیی لەو سەفەرە یاوەری بارزانی بووە، بەو شێوەیە دیدارەکە دەگێڕێتەوە: ((... بەیانی رۆژی ١١ی ئازار ژەنەراڵ نەسیری هات، یاوەری بارزانیو هاوەڵانی بکات بۆ لای شا، وابزانم سەعات دەی بەیانی بوو، سەیارەیەکی هێنا بوو بارزانی لەگەڵ خۆی سوار کردو سەیارەیەکی دیکەش بۆ دکتۆر مەحمود عوسمان ئەندامی (م.س)، کە بارزانی بە سیفەتی راوێژکاری هەندێك جار لە سەفەرەکانی لەگەڵ خۆی دەیبرد[٤٠٤]، هەروەها شەفیق قەزاز بە سیفەتی نوێنەری شۆڕشی کوردی لە تاران، من مەبەستم نەبوو بچم، پێشتر لە هیچ کۆبوونەوەیەك لەگەڵ شا دانەنیشتبووم، تەنیا لە ئوتێل بۆ بەرێکردنیان دەرچووم، نەسیری تەماشای کردمو داوایکرد منیش بەشدار بم، منیش سەیری بارزانیم کرد، ئاماژەی کرد لەگەڵیاندا سواربمو بچم...)). لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا دەنووسێ: ((... دوای ئەوەی دانیشتین بە ماوەیەکی کەم شا بە لووت بەرزیەوە هاتە لامان، سەلامی لێکردینو وەڵامان دایەوە، یەکسەر هاتە ناو بابەتەکەوەو وتی: سەبارەت بەو رێککەوتننامەیە لەلایەن دۆستانەوە زۆر سەرکۆنە کراوین، بەوەی

---

٤٠٣- پێشتر مستەفا بارزانی لە کۆماری مهاباد لای دەسەڵاتدارانی ئێرانی حوکمی لە سێدارەدانی هەبووە، لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بە قسەی (عیسا پەژمان) دەزگای ساواك قەناعەتی بە شا کردوە دادگایی بارزانی هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە بۆ فشار خستنە سەر رژێمی تازەی عێراقی جێگرەوەی بارزانی نییە. بڕوانە: (عیسی پەژمان: نهێنی یەکانی بەستێنی، ل٤٩-٥١)

٤٠٤- ئەندازەی ناتەبایی سەرکردەکانی شۆڕش لێرەدا بەدەردەکەوێ، مەحمود عوسمان لە ساڵی ١٩٦٤ەوە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بووە، بەشداری زۆربەی کۆبوونەوەی هەستیارەکانی کردووە لەگەڵ حکومەتی عێراقیو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵام بەدیدی یەکێك لە نزیکەکانی بارزانی "بە سیفەتی راوێژکاری" هەندێ جار لەگەڵ خۆیدا دەیبرد. توێژەر.

ئەگەر ئێمە هاوکاری ئێوە نەکەین هەتا عێراق سیاسەتی خۆی بگۆڕێت، بە تەواوی بڕیارماندا وە لە سەر ئەو ڕێگەیە بڕۆین، بۆ ئێوەش سێ ڕێگاتان لە پێش دادەنێین، بگەڕێنەوە عێراق لێبوردنی گشتیتان بۆ دەردەکات، کە من داوام لێکردووە، "وەکو خۆی دەیوت" یان پەنا بهێننە بەر ئێران، یان بە بێ هیچ یارمەتیەکی ئێران بەردەوام بن لە شەڕ ، تەنانەت لە کۆتایی مانگی ئازارەوە سنوورتان لە سەر دادەخەین، لە بەرانبەردا دکتۆر مەحمود عوسمان وتی: چ وەڵامی گەلی خۆمان بدەینەوە، ئەوان چی بە ئێمە دەڵێن؟ شا بە توڕەییەوە وتی: دەڵێن سەرکردەکانمان زۆریان وت و مافیان بە فیڕۆدان. پرسیارم لێکرد ئایا ڕێگە بە پەناهەندەکانمان دەدات، ئەو خێزانانە لە ئێرانن بهێننەوە، ئەگەر شەڕ بەردەوام بێت؟ وتی باش دەبێت.

بارزانی وتی: بە ڕاستی لە بەر ڕاستگۆیی دەستمان خستە دەستتان نەك بۆ ئەوەی دەستمان ببڕن، لێرەدا شا هەستا، کە ئاماژە بوو بە کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەکە، پێش ئەوەی بڕوات من پێم وت: باڵوێزی عێراق بووم و چاك لە مەبەستی ئەوان تێدەگەم سەبارەت بە خوزستان و ئەوانی دی، بە لە خۆبایی و فیزەوە وەڵامی دایەوە، کە هەمووو ئەوانە دەزانم، بەڵام ئێمە بە هێزین، چیان بۆ ناکرێت، من (تاقیان دەکەمەوە) چەندە ڕاستگۆن، دوایی خوا حافیزیمان کرد، هەمووی نیو سەعاتماینەوە))[٤٠٥]. ئەمە دەقی گێڕانەوەی یەکێك لە بەشدارانی دوا دیداری شا و بارزانی و وەفدی یاوەری بووە، بەڵام ئەوانەی باسیان لەو کۆبوونەوەیە کردووە هەموویان لە سەر ناوەڕۆکی باسەکانی ئەو کۆبوونەوەیە کۆکن نین. ناگونجێت لە ماوەی نیو سەعات دانیشتن هەر هێندە قسەیە کرابێت، لە هەڵسەنگاندنەکەی (لیژنەی ئامادەکاری) کە مەحمود عوسمان بەرپرسی

٤٠٥- أحداث عاصرتها، ص٢٩٨

ئەو دەستەیە بووە[٤٠٦] و یاوەری بارزانی بووە بۆ لای شا لە راپۆرتەکەیاندا هاتووە، کە دوای ئەوەی شا ڕێگەکانی خۆی خستە بەردەم بارزانی ئەویش وتی: ((ئێمە گەلی ئێوەین مادام ئێوە بە ڕێککەوتننامەکە رازین لە بەرژەوەندی ئێرانە، ئێران وڵاتی دایکمانە هیچ دژایەتیمان لەگەڵیدا نییە، لە ژێر فەرمانی تۆداین، بڵێی بمرە دەمرین یان بڵێی بژی دەژین. دڵسۆزی تۆین، لە ئایندەش بە دڵسۆزی تۆ دەمێنینەوە، خوازیارین بەردوام بیت لە چاودێریمانو لە چاودێری کێشەکەمان...))[٤٠٧]. لە راپۆرتەکەدا هاتووە، کە پێویستی نەدەکرد ئەو قسانەی بکردایە[٤٠٨]، لەوانەیە ئەو هەستی بە گەورەیی پیلانەکە کردبێتو ویستبێتی هیچ نەبێت بۆ ئایندە دەروازەیەك بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شای ئێران بهێڵێتەوە، هەتا بە لاوازیش بێت بتوانێت جوڵانەوەکە

٤٠٦- لیژنەی ئامادەکاری (پ.د.ك): لە دوای شۆڕشی ئەیلول مەحمود عوسمانو شەمسەدین موفتی، عەدنان موفتیو قادر جەباری سەرکرایەتیەکیان پێکهێنا بوو بە ناوی (لیژنەی ئامادەکاری پ. د. ك)، لەو لەئاعەتدا بوون دوای هەڵوەشانەوەی نووشستی شۆڕشی ئەیلول هیچ سەرکردایەتیەك شەرعیەتی نەماوەو دەبێت کار بکرێت بۆ کۆنگرە. چالاکی نووسراوی ئەو لیژنەیە کە گوزارشت لە بیروبۆچوونیان بکات لەو نووسراوە بەولاوە هیچی دیکە لە بەردەست دا نیە. لە تەوەری یەکەم هەڵسەنگاندنێکی رەخنەییە لە سەر شۆڕشی ئەیلولو تەوەری دووەم خستنەڕووی هەڵوێستی لیژنەی ئامادەکاریە لە سەر دروستکردنەوەی پارتی وەکو هێزێکی سیاسیو چەند بابەتێکی سیاسی تایبەت بەو قۆناغە. بڕوانە: (الحزب الديمقراطي الكردستاني. اللجنة التحضيرية: تقيم مسيرة الثورة الكردية و انهيارها والدروس و العبر المستخلصة منها).

٤٠٧- اللجنة التحضيرية: تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص١٠٤-١٠٥،

٤٠٨- اللجنة التحضيرية، تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص١٠٤-١٠٥، بۆ گێڕانەوەی زیاتر لە سەر دەقی قسەکانی ئەو کۆبوونەوەیە. بڕوانە: (راندال: کوردستان یان، ل٢٤٣-٢٤٤" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٢٩)

درێژە پێبدات، چونکە لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ سەرکردایەتی لە ناوپردان لە ڕۆژی دوایی ١٩٧٥/٣/١٢ لەگەڵ هەڵبژاردنی بەرگری‌و درێژەدان دابوو بە شۆڕش[٤٠٩].

دوای ئەوەی ئێرانیەکان هەموو چەکە قورس‌و دژە ئاسمانیەکانیان کێشایەوە ناو خاکی ئێران بۆ ڕۆژی دوایی واتە ٣/٨/ ١٩٧٥ عێراق هێڵی (هاملتۆن)[٤١٠]ی لە سەرەوە بۆ خواری بۆردومان کرد[٤١١]، سوپای عێراق ئەمەی بە دەرفەت زانی هێرشێکی چڕی بۆ سەر بارەگاکانی پێشمەرگە دەستپێکرد[٤١٢]، بەڵام هێرشەکەی ڕووبەڕووی بەرگری پێشمەرگە بووە[٤١٣].

لە کاتێکدا زۆربەی زۆری ئەندامانی (م‌س)و سەرکردایەتی‌و فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە لە کوردستان بوون، کەچی گێڕانەوەی جیا هەیە لە سەر هەڵوێستی (م‌س)و سەرکردایەتی لە ڕۆژی ٣/٦ هەتا ٣/١٢ کاتی گەڕانەوەی بارزانی‌و ڕۆژانی دواتر.

---

٤٠٩- بۆ ڕای بارزانی لە سەر درێژەدان بە شۆڕش. بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص٣٥٢* دزایی: أحداث عاصرتها، ص٣٠٠)

٤١٠- دۆڵی هاملتۆن: بەو ڕێگەیە دەڵێن کە هەولێر بە حاجی ئۆمەران‌و دواتر بە ئێرانەوە دەبەستێتەوە، پێشتر ڕێگەی کاروانی هاتوچۆی نێوان موسڵ‌و شارەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بووە، لە ساڵی ١٩٢٨ دروست کراوە، بە ناوی هاملتۆن کە ئەندازیاری سەرپەرشتی ئەو پرۆژەیەکە ناسراوە، هاملتۆن لە دایکبووی ساڵی ١٨٨٩ نیوزلەندایە، لە ساڵی ١٩٧٣ مردووە. بڕوانە: (گزیتەر دیشەر: کورد گەلێکی، ل٢٥٩-٢٦٠)

٤١١-ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان‌و، ل٢٩٢* ژیرار شالیان: تراژیدیای کورد، ل١١٦

٤١٢- ڕانداڵ: کوردستان یان، ل ٢٤٢

٤١٣- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان‌و، ل٢٩٢

مەسعود بارزانی باس لە کۆبونەوەیەی ٩ی ئازار دەکات، کە موحسین دزەیی پێش وەفدی تاران گەڕاوەتەوە، نامەی مەحمود عوسمانی هێناوە، ئەو ئەندامە سەرکردایەتیانەی لە حاجی ئۆمەران بوون و کۆبونەتەوە هەتا بڕیارێك گەڵاڵە بکەن. دەنوسێ: ((نامەکەی مەحمود عوسمانم خوێندەوە، هەروەها گوێمان لە قسەی موحسین دزەیی گرت...))[٤١٤]، کە لە تارانەوە گەڕابۆوە بۆ گەیاندنی دوا هەواڵی ئەوێ. لە بارەی کۆبونەوەکەوە دەنوسێت: ((هەواڵەکە زۆر ناخۆش بوو، هەموو بەشدارانی کۆبونەوەکەی تووشی شۆك کرد، ئەمان دەتوانی بە روخسارمانەوە دیار نەبێت، کەسمان کۆبونەوەکەمان بە هێمنی بۆ کۆنترۆڵ نەدەکرا...))[٤١٥]، ئەم حاڵەتە گرژیە بەردەوام بووە هەتا دوایی لە سەر چەند بڕیارێك رێککەوتوون وەکو پێشنیاز بە موحسین دزەیی بۆ بارزانی نێردرا، کە خۆی لە چەند خاڵێك دەبینێتەوە لەوانە: کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق بە ناوبژیوانی ئێرانی‌و چارەسەری کاتی بۆ ئاوارەکان‌و کەمکردنەوەی هێزەکان، خۆئامادەکردن بۆ شەڕی پارتیزانی، دیارە بارزانی پێش گەڕانەوەی‌و دوای گەڕانەوەی رەزامەندی لە سەر نیشانداوە، بەڵام مەسعود بارزانی دەنوسێت: ((دوای چەند رۆژێك بۆمان دەرکەوت ئەو رێککەوتنە پیلانێکی چەندە گەورەیە لە سەر شۆڕشەکەمان، عێراق‌و ئێران رێککەوتن بۆ لێدانی شۆڕشی کورد سوپایان بێتە ناو خاکی یەکتر))[٤١٦]، بۆیە دوا بڕیار هاتە گۆڕینی هەڵوێست لە بەرگریەوە بۆ خۆبەدەستەوەدان، لەوێدا باس لە بەساڵاچوویی بارزانی‌و نەخۆشی ئەو دەکات، هەروەها بارزانی نەیویستووە گەلی کورد شەڕێك بکات بێئاکام‌و خۆی تووشی

٤١٤- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص ٢٤٩

٤١٥- المصدر نفسه، ج٣/ص٢٤٩

٤١٦-المصدر نفسه، ج٣/ص٢٥٠-٢٥١

لە ناوچوون و مەرگەسات بێت[٤١٧]، سەرەڕای ئەوانە سەرکردەکانی شۆڕش ئامادەییان تێدا نەبووەو بە باشیان زانیوە خۆ هەڵگرن بۆ دەرفەتێکی سیاسی و دەولی لە بارتر[٤١٨]

لە ١٩ی ئازار بڕیار درا شەڕ رابگیرێت و شۆڕش بە کۆتا بگات[٤١٩]. لە ئاکامی رێککەوتننامەی جەزائیر هەڵوێستی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان خۆبەدەستەوەدان بووە، ئایا ئەمە دەچێتە بازنەی ئیجتیهادی کارزانی و حیکمەتی سەرکردایەتیەکی

---

٤١٧- المصدر نفسه، ج٢/ص٢٥٣-٢٥٤، کۆچێرا باس لە چاوپێکەوتنێکی موحەمەد حەسەنەین هەیکەل کردووە لە مایسی ئەو ساڵە لەگەڵ مستەفا بارزانی، بارزانی لەوێدا وتوویەتی: (.. تەنانەت ئەگەر سنوورەکانیشیان داخستایە من هەر لەگەڵ بەردەوام بوونی شۆڕش دابووم، بەڵام وام بە چاک زانی لەوەی پتر نەبمە مایەی رشتنی خوێنی گەلی کوردو عێراق..) بڕوانە: (کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢٦)

٤١٨- حەمید گەوهەری بەبێ دیاریکردنی شوێن و کات، باس لە کۆبوونەوەیەکی بارزانی دەکات لەگەڵ فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە لەو کۆبوونەوەیەدا لە سەر بارزانیەوە دەڵێ: (..ئەوەی بەسەرمان دا هاتووە هەمووی لە ئیهمالی و زوڵمی ئێمە بووە، زیاتر لە هەموو کەس من تەحەمولی مەسئولیەت دەکەم، بەڵام شتێك هەیە دەمەوێ پێتان بڵێم، نابێ مەئیوس بن، ئەمڕۆکە پیلان لە سەر کورد کراوە، وای بەچاک دەزانم حالی حازر بڕۆین، بڵێن لە بەرچی؟ لەوەلەن ئەمن نەخۆشم، وەکو جاران توانام نیە، گوند بەگوندو چیا بەچیا لەگەڵتان بم‍‍ـ ـ دە کەس حالی حازر ئامادە نیە سەرکردایەتیتان بکات.ـهەتا دەگاتە ئەوەی دەڵێ: وا باشە ماوەیێ بڕۆین، شەش مانگێتر ناخایانێ وەزع تەگۆڕێتەوە، ئێمە ئەتوانین بە هیمەتی ئێوە دووبارە خۆمان رێك بخەینەوە، سیاسەت بە مانگ و دوو مانگ گۆڕانی تیا یە.) بڕوانە: حەمید گەوهەری، رۆڵی بارزانی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی سەدەی بیستەمی کوردستان، گۆڤاری گوڵان، دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی گوڵان. ژ (٢١٧) ی ١٥ی ئازاری ١٩٩٩، ل١٦، سەرچاوەی تر ئەو کۆبوونەوەیە بە شێوەی تر دەگێڕێتەوە، کە مستەفا بارزانی لە بەرەو ڕووی ناڕەزاییەکی گەورەی ئامادەبوان بە تایبەت بەرپرسە کۆنەکانی باڵی (م.س) وەکو (عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، ئیبراهیم ئەحمەد..) بووێتەوە، بڕوانە: حەمە نوری توفیق: یادنامە، ل١١٠-١١٢.

٤١٩- ئەوشیلوان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٠.

شۆڕشگێڕ، یان لەو نێوەندەدا پێناسەیەکی دیکە هەڵدەگرێت. بەدواداچوون و بڕیارداز دەبێتە ئەمانەتێکی مێژوویی، بەڵام ئەوەی لە واقیع ڕوویدا، لە ماوەی ٢٠ی ئازار سەرکردایەتی گەلی کوردی توشی نائومێدیەکی گەورە کرد، کە بڕیاری کۆتایی هێنانی شۆڕشی بوو. لە ٢٠ی ئازار بروسکەی بۆ هەموو هێزی (پ‌م) نارد، کە بە هۆی پیلانی دەولیەوە ناتوانرێت درێژە بە شۆڕش بدرێ و کۆتایی پێ بهێنن[420].

بۆ تێگەیشتن لەو هۆکارانەی لە پشت بڕیاری کۆتایی هێنان بە شۆڕشەوە بوون لە پاڵ دەنگە نارازیەکان و هەڵبژاردنی ئەو جۆرە هەڵوێست وەرگرتنە، پێویست بە خستنەڕووی فاکتەرە هەستپێکراوەکانی دەکات.

لە خوێندنەوەی هەڵوێستی ئەوکاتەی سەرکردایەتی کورد ئەو هۆکارانە لەسەر بڕیاری هەرەس بەدیاردەکەوێت:

یەکەم: هاتنی ژەنەراڵ (مەنسور پور) بۆ لای بارزانی هەتا لە بیەی بەرگری و درێژەدان بە شەڕ دووریان بخاتەوە و مەترسی ناکامی ڕێککەوتنی نهێنی و ئاشکرای هەردوو وڵاتیان پێ رابگەیەنێت. ئەوەی توێژەر لێی تێدەگات هاتنی ژەنەراڵ نەسیەی تەنیا لە بازنەیەکی بەرتەسك پێشوازی کراوە، بەڵام دروستی ئەم هاتنە بە پشت بەستنە بە دوو خاڵ: یەکەمیان، بەر لە گۆڕینی ڕای بارزانی بۆ شەڕ ڕاگرتن مەنسوور پور یان بەرپرسی دیکەی ئێرانی نەناسراو بۆ ئەو مەبەستە هەیە[421]. دووەمیان، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە بارزانی دوای گەڕانەوەی بۆ حاجی ئۆمەراز

---

٤٢٠- بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: (الخرصان: التيارات السياسية، ص٢٣٣" على سنجاري القضية الكردية و حزب البعث العرب الاشتراكي في العراق، دهوك، ٢٠٠٦، ج١/ص٧٧-٧٩)

٤٢١- بۆ دڵنیایی زیاتر بڕوانە: (دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٠٠-٢٠١)

جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و شای بینیوە، پێی وتووە، کە قبوڵی ناکات درێژە بە شەڕی چەکداری بدرێ"[422]

دووەم: بارزانی نامەی بۆ کیسنجەر ناردووە هەتا فشار بخەنە سەر ئێران شۆڕشی کورد لە بارێک نەبات، دەگوترێت بارزانی لە سەر ئەو نامەیەی ئومێدی زۆری هەڵچنیبێت، بەڵام کیسنجەر وەڵامی نەدایەوە"[423]. دەڵێن ئەو سەفەرە نهێنییەی بارزانی بۆ لای شا، دوا گەڕانەوەی بۆ حاجی ئۆمەران لە ٣/١٣، هاوکات بووە لەگەڵ وەڵامی کیسنجەر، کە بارزانی ئاگادار کردۆتەوە بەرگری نەکات"[424]، بۆ جاری دووەم بینینی شا

---

٤٢٢- سەرچاوەی هەواڵی ئەو گوزارشتە مەحمود عوسمانە، گوایە لەو سەفەرەدا شا بە بارزانی وتووە ١٢ ساڵ لە یەکیەتی سۆڤیەت ماوەتەوە، وەرە لە ئێرانیش دوو سێ ساڵ بمێنەوە. بڕوانە: (کۆچیها: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢٥-٤٢٦" ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و، ل٣٩٦)

٤٢٣-هەمان سەرچاوە، ل٣٩٦، لەو نامەیەی بارزانی بۆ کیسنجەری ناردووە لە ١٠ی ئازاری ١٩٧٥ نووسیویەتی: (دڵمان خوێنی لێدەچۆڕێ بەرانبەر لەو ئەنجامە راستەوخۆو بەراییانەی رێککەوتننامەی جەزائیر، کە گەلەکەمان بە شێوەیەک رێژان دەکات پێشتر ڕێنەی نەبووە، ئێران سنوورەکانی بە تەواوی بە ڕووماندا داخستووە، لە هەمان کات عێراق گەورەترین هێرشی مێژوویی لە دژمان دەست پێکردووە، کە هەتا ئێستا ئەو هێرشە بەردەوامە.... ئەوەی روو دەدا لە ناوچوونی بزاڤەکەمان و گەلەکەمانە بە ڕێگەیەکی نەشیاو لە سایەی بێدەنگی کردەیی هەموو لایەکە.. وەزیری پایەبەرز ویلایەتە یەکگرتووەکان پابەندی ئەخلاقی و سیاسییە لەبەرانبەر گەلەکەمان، کە چارەنووسی بەستراوەتەوە بە سیاسەتی وڵاتەکەتانەوە، وەزیری پایەبەرز.. ئێمە چاوەڕوانی وەڵامێکی بە پەلەی ئێوەین، ئێمە زۆر نیگەرانین..) بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: (راندال: کوردستان یان، ل٢٤٦" الخرصان: التیارات السیاسیة، ص٢٢٨" بەڵگەنامەی ژمارە (٦))

٤٢٤-راندال: کوردستان یان، ل٣٩٦

بە دوور نازانرێت، بەڵام کیسنجەری نەبینیوە، چونکە لە راپۆرتی (پایك) بە راشکاوی ئەوە باس کراوە، کە وەڵامی ئەو نامەی ١٠ی ئازاری بارزانی نەدراوەتەوە[٤٢٥].

سێیەم: ئەو پەیوەندییەی سەرکرایەتی شۆڕش لەگەڵ ئیسرائیل دروستی کرد بوو، بەو هیوایەی لە رێگەی بە کارهێنانی پێگەی خۆی لای داڕێژەرانی سیاسەتی ئەمریکا بتوانێت شتێك بکات، بەڵام ئەویش هیچی نەکردو خۆی لەو پیلانە بە دوور گرت[٤٢٦].

چوارەم: دراجار بۆ دەربازکردنی شۆڕش لە فەوتان لە دەرگای حکومەتی عێراقیشیاندا. بە ناوی (م.س) لە ٣/١٨ بروسکەیان بۆ حکومەتی عێراقی ناردو داوای دانوسانیان کرد، لە سەر ئەو کارتەش هیوایان هەڵچنیبوو هەتا بتوانێ بشوویەك بدا بۆ درێژەدان بە مانەوەی شۆڕش، حکومەتی عێراقی بۆ رۆژی دواتر لە ٣/١٩ وەڵامی دانەوە، کە رازی نیە لەگەڵیاندا بکەوێتە دانوسان، لەو بروسکەیەدا حکومەتی عێراقی داوای خۆ بەدەستەوەدانی بێ مەرجی کردووە[٤٢٧]، لێرەدا ئەو هەوڵەش بۆ مانەوەی شۆڕش بێ ئاکام بوو.

---

٤٢٥-بەڵگەنامەی ژمارە (٦)

٤٢٦- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص٢٨١-٢٨٢

٤٢٧- دەقی بروسکەی (م.س) بۆ حکومەتی عێراقی: ((بۆ ئەنجومەنی سەرکردایەتی بەرێز.. لە/ مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە ١٨/٣/١٩٧٥. ئەو ناخۆشیانەی لە رابردوو بە هۆی شەڕ لە نێوان ئەوەکانی یەك نیشتیمان رووی داوە، ئەو زیانانەی لێی کەوتۆتەوە، هەتا زیاتر خوێن نەڕژێ و لە بەر بەرژەوەندی باڵای وڵات و یەکێتی نیشتیمانیدا، بۆ ئەوەی هەموومان لە ئاست بەرپرسیارێتی دابێین و کاربکەین بۆ لابردنی هەموو سەرکەشی و هەڵەکانی رابردوو، چارەسەرێکی کۆتایی بۆ کێشەی کورد دابنێین بە شێوەیەك هەمووی خزمەت بە بەرژەوەندی باڵای نیشتیمان بکات، ئێمە پێمان وایە دەستەبەرکردنی چارەسەرکردنی جێگیر گرنجاو رێگر دەبێت لە دەستێوەردانی دەرەکی، بۆ ئەو مەبەستە ئامادەی دەست پێکردنی گفتوگۆین لەگەڵ حکومەت و حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالستی، ئەگەر ئێوە

کاتێك بارزانی ئەو ئەگەرانەی بڕیاری درێژەدان بە شۆڕشی لە سەر بنیاتنابوو سەری نەگرت، بە ناچاری بڕیاری کۆتایهێنانی شۆڕشیدا[428].

بارزانی پێی وابوو پیلانەکە گەورەیە، دەبێت لەم بارودۆخەدا شەڕ بکاتو بکەوێتە بەر مەترسی لە ناوچونو مەرگەساتی گەورە یان شۆڕش بکاتە قوربانی مانەوەی گەلی کورد[429]، بۆیە بڕیاریدا هەتا بارودۆخێکی سیاسی لەبارتر شۆڕش رابگیرێت[430]،

---

ئامادە بن نوێنەرمان دەنێرینە لاتان. تکایە ئاگادارمان بکەنەوە) بڕوانە: علی سنجاري: القضية الكردية ر، ج١/ص٧٣، دەقی وەلامی حکومەت بۆ (م.س) - (بۆ/ ئەوەی پێی دەڵێن مەکتەبی سیاسی یاخیبوان- ١٩٧٥/٣/١٩- بروسکەتان لە رێگەی فەرماندەی فیرقەی دووەوە گەیشت، ئێمە هەتا ئێستاش خۆمان بە بێتاوان دەزانین بەرانبەر لوت بەرزیو لە خۆبایی بوون بە شێوەیەك جێی رەزامەندی خەڵکو گەلەکەمان بێت...پێش ١١/ئازاری ١٩٧٠ بە راستگۆیی تەواوەوە رێ نیشاندەرتان بووین لەو ئایندە تاریکەی چاوەڕێی دەکردن، ئەو زیانەی لە گەلەکەتان دەکەوت، بە هۆی سواربوونی ئێوە لە ئەسپی سەرکەشی بەرەی دژ بە گەلو ئامانجەکانیو دژ بە گەلی کوردو ئاسایشەکەی. ئێمە بە دڵێکی پڕ لە بڕوا بە سەرکەوتنو خواو گەل بەرەنگاری کارە خراپەکانی ئێوە بووینەوە، رای گشتی لەگەڵ ئێمەدایە.. لە ئێستادا بە هۆی ئەزموونی تاڵی رابردوو، دەرفەت نەماوە مەبەستتان تاڵی بکەینەوە، متمانەمان نەماوە، تاکە دەرفەت لە بەردەمتان، کە رێگر بێت لە خوێنڕشتن، بەبێ هیچ مەرجێك سوود وەرگرتنە لەو لێبووردنە گشتییەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، کە لە ١ی نیسان کۆتایی دێت، چارەسەری چەسپاوو گونجاوە بۆ کێشەی گەلی کوردمان لە رێگەی یاسای ئەو ئۆتۆنۆمییەوە تەواو دەبێت، کە لە ١/ئازاری ١٩٧٤ رامانگەیاندوە، دەرفەتی پاشقول گرتن نەما.. کۆتایی) بڕوانە: علی سنجاري: القضية الكردية ر، ج١/ص٧٥، حکومەتی عێراقی وەلامەکەی خۆی لە رۆژنامە رەسمییەکاندا بلاوکردەوە. بڕوانە: رۆژنامەی (الثورة) ع(٢٠٢٦) لە ١٩٧٥/٣/٢٠" هاوکاری ژ(٢٥٩) لە ١٩٧٥/٣/٢١

٤٢٨- ئیبراهیم جەلال: خواروی کوردستانو، ل٢٩٦" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣١" فوئاد کەریم: لە یادی ٢٤ هەمین، ل٣٤

٤٢٩- رۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٢٧٩٥)ی ١٩٩٩/٣/١١

٤٣٠-شێخ لاتیع محمد: رۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٢٧٩١)ی ١٩٩٨/٣/٧

داکۆکیکردن لە کەسایەتی مستەفا بارزانی بەوەی هەنگارێکی ژیرانەو ئازایانە بووە،قوربانی داوە بە لەکەدار بوونی کەسایەتی خۆی لە بەرانبەر کارەساتێك کە بەرەو رووی گەلەکەی دەبێتەوە[431]، ئەمە ئەو ئیجتیهادە سیاسیە بووە، کە هەڵیبژارد، بەڵام چوونە سەر ئەو رێگەیەی کە لەبەردەم دوو ئەگەردا خۆی ببینێتەوە، رێگەی دیکەی لەبەردەمدا نەبێ، پەیوەستە بەو پێشینەیەی کە ئەویش خۆی لێی بەرپرسیاربووە.

لە لایەکی دیکەوە هەیە پێیان وایە هەموو ئەو هەوڵانەی بۆ درێژەدان بە شۆڕش، بە خۆخافڵاندنی مستەفا بارزانی دەزانن‌و لە سەرەتاوە ئەو هەڵوێستەی بڕیار دابوو، بەڵام زیاتر بۆ کات کوشتن‌و ساغکردنەوەی چارەنووسی بارەگاو کەلوپەلەکانی شۆڕش کاتی پێویست بووە، لەگەڵ گەڕانەوەی لەلای شا ئاوازی ماڵ ئاوایی پێوە دیار بووە.[432]، یان بە گومانەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن‌و پێیان وایە هۆکاری پیری‌و نەخۆشی‌و پیلانی جەزائیر بە تەنیا جێی قەناعەت پێهێنان نییە، نهێنی شاراوەی دیکە هەیە[433].

ڕێگە خۆشکردن بۆ دروستکردنی (سەرکردایەتی کاتی) کە لە هەوڵەکانی ژمارەیەك لە کادیرە نزیك‌و باوەڕپێکراوەکانی ئەوکاتەی نزیك لە دەزگای پاراستن بووە بە دووری مەسعود بارزانی‌و هەوڵەکانی ئیدریس بارزانی لە دوای نووشستی شۆڕش لە

---

431- البارزانی: البارزانی و الحرکه، ج٣، ص٢٤٧" علی سنجاری: القضیه الكردیه، ج١/ ص٧٢-٧٧

432- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٠-٣١" ژیرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلێکی، ل٢٩٥، دەگوترێ بۆچوونی نووسەر لە هەمان سەرچاوە وەڵام بێت بۆ ئەو خوێندنەوەیە لە سەر هۆکاری دواکەوتنی بڕیاری هەرەس کە دەنووسێت: (.. بارزانی بڕوای وابوو کە ناکۆکیەکانی شاو سەدام لەوە قووڵتر بتوانن رێك بکەون، لە بەر ئەوە ئەو هەواڵەی بە هێند وەرنەگرت). نەوشیروان مستەفا : لە کەناری دانوبەوە، ل٢٩

433-کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢٥

ئێران بۆ کەمکردنەوەی قەوارەی پێشومێدی[434]، لە بیروەری و لێدوانی ژمارەیەك لە بەشدارانی دامەزراندنەوەی (پ.د.ك) لە چوارچێوەی سەرکردایەتی کاتی ئەو قەناعەتە پشتڕاست دەکەنەوە، کە ژمارەیەك لە نزیکەکانی مستەفا بارزانی لە پێکهاتەی ئەوکاتەی سەرکردایەتی و (م.س) رازی نەبوون، خۆیان بۆ دارشتنەوەی سەر لە نوێی سەرکردایەتی (پ.د.ك) ئامادە کردبێت[435]، لە بەرانبەردا هەوڵەکانی ژمارەیەك لە ئەندامانی باڵی (م.س)ی پێشووش بە جموجۆڵی سیاسی[436]، لەو شرۆڤەیەمان نزیك دەکاتەوە، لەو نێوانەدا جۆرێك لە کارو کاردانەوەی دوو جەمسەری بە دیاردەکەوێ لەبەرانبەر ناکامەکانی شۆڕش و هەوڵدان بۆ جێگرەوەی سەرکردایەتی کردنی تازە.

لەبەرانبەردا رای جیاواز هەیە کە ئەو ئیجتهادە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، پێی وایە بەرپرسیاریەتی تواندنەوەی شۆڕش لە ئەستۆی بارزانی دایەو نەدەبوایە ئەو هەڵوێستە بگرێتەبەر چونکە:

---

٤٣٤- دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٠٢-٢٠٣" دانشجوان پیرو امام، اسناد لانه جاسوسی – شماره (٣١)، کوردستان (٢)، ص٩٧

٤٣٥- لەو دەقەی حەمید گەوهەری هێناویەتی لە سەر زاری بارزانیەوە، کە ئاماژەیە بە خۆئامادەکردن، یان ئەو هەواڵەی لە (اسناد لانەی جاسوسی) لە سەر ناوەڕۆکی کۆبوونەوەی نێوان ئیدریس بارزانی و نوێنەرانی کونسوڵی ئەمریکا لە ئەورزۆدا، لەوێدا ئیدریس بارزانی مەترسی ئەوەی دەرخستووە، کە ئەگەر ئەمریکا فریا نەکەوێت کەسانی دیکە لەبەرانبەر خانەوادەی بارزانی باروودۆخەکە دەقۆزنەوە. ئەوە جۆرێکە لە خۆئامادەکردن و درێژەدان بە شۆڕش. بۆ هەردوو هەواڵ بڕوانە: حەمید گەوهەری: رۆڵی بارزانی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی سەدەی بیستەمی کوردستان، ل٩٦" دانشجوان پیرو امام، اسناد لانه جاسوسی – کوردستان (١)، شماره (٣١)، ص٩٦

٤٣٦- بڕوانە: باسی یەکەمی بەشی سێیەم.

یەکەم: بە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و توانای بەردەست لە پارەو چەك‌و تەقەمەنی دەتوانرا درێژە بە شۆڕش بدرێت، بەهائەدین نوری لە بابەت پشتگیری ناوخۆو دەرەکی دەڵێ: ((ئەگەر سەرکردایەتی پارتی لە دەرەوەی دۆستایەتی ئێران‌و ئەمریکا لە دوای واژۆکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر درێژەی بە شەڕ دابا هەڵوێستی (حشع) عێراق دەگۆڕا، یان لێك دەترازاو بەشی زۆری دەهاتە پاڵ شۆڕشی کورد...))[437]. کە دەکرێ ئەم قەناعەتە لە ژێر هەژموونی ئەو تەنگپێهەڵچنینانەدا بووبێ، کە دوای هەرەسی شۆڕشی کورد بەرەو ڕووی (حشع) بۆوە، ئەمەش ڕەنگدانەوەی توانەوەی شۆڕشی کورد بووە، ئەگینا ئەگەر شۆڕشی کورد درێژەی هەبوایە، پێ نەدەچوو حیزبی بەعس لە درێژەدان بە ڕاگرتنی دڵی سەرکردایەتی (حشع) بەردەوام نەبوایە، بەمەش ئەو پێشبینیەی نوری بە ڕاست دەرنەچوو، بەڵام لە خوێندنەوەی ڕووداوەکانی ئەوکات دەگەینە ئەو ئاکامەی کە سەرکردایەتی بووە، وەی جەماوەری کوردستانی ڕوخاند، ئەگەر بە میکیانیزمی تازە درێژەی بە شۆڕش دابا، پلانی دەرەکی لە باریەك دەچوو، ئەو کارەساتەش نەدەقەوما، کە ئاکامەکانی نوشستی بە دوای خۆیدا هێنا.

دووەم. شێوەی جەنگی پارتیزانی، پێویستی بە چەکی قورس بووە، ئەمە شۆڕشی ئەیلولی ڕاکێشایە ناو پشتبەستنی تەواو بە دەرەوە[438]، بەڵام دەرفەتی گۆڕینی شێوازی تازە بۆ شەڕ لە بەردەستدا مابوو، کە پێویستی کەمتر بەو پاڵپشتیە دەرەکییە هەبێ.

سێیەم: بازنەی پرس‌و ڕاوێژکردن بچوك بووە بۆ وەرگرتنی هەڵوێستێکی لەو جۆرە، ماوەی ئاگربەست بەس بووە هەتا بە دیموکراتیانە لە ڕێگەی کۆنفراسێکی نائاسایی

---

437-- دیداری توێژەر لەگەڵ ناربرار، لە ڕۆژی 18/9/2006 لە سلێمانی.

438- اللجنة التحضيرية: تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص31-32

ئاوتوێ ئەو مەسەلە چارەنووسسازە بکرایە، ئەو ئاماژانەی هەیە لە سەر چۆنیەتی بڕیاردانی نووشستی دونیابینیەکی دیکەیە بەوەی سەرکردەی کاریزما دەتوانێ بڕیاربدات[٤٣٩].

چوارەم: ئەوەی پشتی لە شۆڕش کرد بەرەی رۆژئاوا بووە، دوور نەبوو لە حاڵەتی درێژەدان بە شۆڕش وڵاتانی بەرەی سوشیالیزمی هاوکاری شۆڕش نەکەن هەڵوێستی ئەوان لەو بارەیەوە نەگۆڕابا[٤٤٠]، هەر لەو بارەیەوە باس لە نامەیەکی جەلال تاڵەبانی دەکرێت لە سوریاوە ناردویەتی بۆ بارزانی‌و داوای لێکردووە، ئەگەر شۆڕش خۆی رابگرێ سۆڤیەت یارمەتی شۆڕشی کورد دەدات[٤٤١]، دەکرێ ئەمە بەشێکی راست دەرچوبێ، چونکە سەدام حوسێن سەرەڕای ئەو هەموو هاریکاریەی بۆ لێدانی شۆڕشی کورد لە یەکیەتی سوڤیەتی وەرگرتبوو، بەڵام ئەویش وەکو سەرکردایەتی کورد بێئاگابووە لە رێککەوتنی عێراق‌و ئێران لە جەزائیر[٤٤٢].

پێنجەم: مەترسی بارزانی لەوەی هەردوو دەوڵەت پێکەوە هاوکاری یەکتری دەکەن بۆ لێدانی شۆڕشی کوردستان، رێککەوتنی نهێنی لە جۆرە هەبووە، لە راستیشدا

---

٤٣٩- لەو بارەیەوە مەسعود بارزانی دەنوسێ: (دەتوانم دڵنیایی بدەم، کە ئەگەر بارزانی بەساڵا نەچووبا، نەخۆشی ئەنگی پێنەهاڵ نەچنی با، کە دوایی بەو هۆیەوە مرد، ئەوە درێژەی بەشەڕ دابوو..".. هەتا دەگاتە ئەو شوێنە کە دەنوسێ: "بۆچوونم لەگەڵ بەرگریدا بووە، لەوانەیە ئەمە زیاتر عاتیفەو هەڵچوونی گەنجانەو حەماسەت وای لێکردبم بۆ وەرگێڕانی ئەو بڕیارە، بەڵام لەبەرانبەر ئەو بڕیارەی باوکم دابووی هیچ دەسەڵاتیشم نەبوو، کە دواتر دەرکەوت لە سەر بنەڕەتو حیکمەت داویەتی..). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (البارزاني و الحركە، ج٣/ص٣٤٧" راندال: کوردستان یان، ل٢٤٦)

٤٤٠- دیداری توێژەر لەگەڵ بەهائەدین نوری لە ١٨/٩/٢٠٠٦ لە سلێمانی.

٤٤١-الحرصان: التيارات السياسيه، ص٢١٥-٢١٦

٤٤٢-أيوب بارزاني: الحركه التحرريه الكرديه و صراع القوى، ص٣٤٤

یەکێك لە خاڵە نهێنییەکانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر هاریکاری سەربازیو لۆجستی نێوان هەردوو دەوڵەت بووە، بەڵام قەناعەتی هەندێ لە سیاسیەکانی کورد ئەوە بووە دوای شەش مانگ یان زیاتر ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیە کاڵ دەبێتەوەو پەیوەندی عێراقو ئێران بەو گەرمو گوڕییە نامێنێتەوە[443]، بەڵام ئەو کاڵ بوونەوەیەش درێژەدان بە شۆڕش دروستی دەکرد.

ئەستەمە توێژەر بگاتە ئاکامێکی دروستی زانستیانە لە نێو دوو خوێندنەوەی جیا بۆ دیارخستنی هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد لە بەرانبەر ڕێککەوتننامەکە، پێش ئەوەی ئەنجامگیریەك بەدەست بێت، ئەم چەند خاڵەی وەکو دەستپێك بە پێویست دەبینرێت:

١. پاساوی تواندنەوەی شۆڕشی کورد بە ڕێککەوتننامەی جەزائیرەوە لە سەر ئەو بنەڕەتەی کە خیانەت لە کورد کراوە، لێرەدا بەکارهێنانی (خیانەت)[444] لە جێی خۆیدا نییە چونکە:

ئەلیف: وشەی خیانە بەکاردەهێنرێت بۆ (پ.م) یان بەشداربوانی شۆڕشو ڕاپەڕینێك، کە بچنە پاڵ بەرەی دوژمن، یان بەڵێنێکی ڕوون ئاشکرا بۆ پشتگیری لەلایەنێکەوە هەبووبێ، نەك پەشیمان بوونەوەی دەوڵەتێك لە پاڵپشتی بزاڤێکی

443- حەمید گەرهەری: ڕۆڵی بارزانی لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی سەدەی بیستەمی کوردستان، گۆڤاری گوڵان، دەزگای ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی گوڵان، ژ (٢١٧) ی ١٥ی ئازاری ١٩٩٩، ل١٦

444- لە ئەدەبیاتی دوای هەرەسی ئەو وشەیە هاتووە. بۆ نموونە لە بەیاننامەی (پ.د.ك) سەرکردایەتی کاتی، بە بۆنەی تێپەڕبوونی سالوەگەڕی خیانەتی ڕێککەوتننامەی ٦ی ئازاری. بڕوانە:(الخراسان: التيارات السياسية، ص٦٩٦)، لە بابەت زیاتری بەکارهێنانی وشەی خیانەت. بڕوانە: (بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ك) لە ڕۆژی ١/٦/١٩٧٥). لە پێشەکی بەیاننامەکەدا هاتووە: (کە خیانەتی ڕێککەوتننامەی ٦ی ئازار هات..)، یوسفی: ثورة ایلول، ص٢١٢" بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

شۆڕشگێڕی، کە سوودی کاتی لەو پاڵپشتیە دابوو، هیچ بەڵێنامە یان ڕێککەوتنی نووسراو لە نێوانیاندا نەبووبێت، واقعیەتی ڕێککەوتنامەی جەزائیر گۆڕان بووە بە سەر هاوکێشەی بەرژەوەندیەکانو سەودایەکی سیاسی بووە لە سەر بنەمای سازشی دوو دەوڵەت بۆ یەکتری. لە سەرەتای ناکۆکیەکانەوە تاماشی هەردوو دەوڵەت دیار بوو، شۆڕشی کوردستانیش لەو سەرەتایە سوودمەند بووە، ئێرانو ئەمریکا وەکو (کارتی یاری) سەیری شۆڕشی کوردستانی باشووریان کردووە. بە ڕەسمی هیچ بەڵێنی ئێرانی یان ئەمریکی نەبووە هەتا لێی پەشیمان بووبێتنەوەو ناوی خیانەتی لە سەردابنرێت.

با: ناتوانرێت ئەو هەڵوێستەی سەرکردایەتی کورد نواندویەتی دروست هەڵبسەنگێنرێت، بە بێ خوێندنەوەی هەموو ڕەهەندەکانی پێش ڕاگەیاندنو دوای ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر، ئەو جۆرە هەڵوێست نواندنانە بە ڕەهایی دابەش ناکرێت بە سەر ڕەش یان سپی.

٢. دەکرێ ئەو ئەنجامگیریە بەدەست بێ، کە سەرکردایەتی کورد لە سەر چ بنەڕەتێك هەڵوێستی کۆتایی هێنانی بە شۆڕش گرتەبەر، ڕاستە هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد خۆ بەدەستەوەدان بووە لەبەرانبەر پیلانی جەزائیر، هەر هەڵسەنگاندنێك لەو بارەیەوە بکرێت، دەبێت لە ڕوانگەی تارتوێ کردنی ئەو بیانوانە بێت، کە خرایەڕوو، ئەوەش لە چەند خاڵێکدا پوخت دەکرێنەوە:

یەکەم: سەرکردایەتی کورد بەر لە ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر کەمتەرخەم بووە لە بەرانبەر ئەگەری لەو جۆرە، کەمتەرخەمیو هەڵوێستی دەستەوستانی کورد هەرگیز لە دوای ١٩٧٥/٣/٦وە هەڵناسەنگێنرێت، ئەگەر هەموو ڕەهەندو هەنگاوەکانی لە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ هەتا دەمی ڕێککەوتننامەی جەزائیر پێکەوە نەخوێندرێتەوە، دەستەوستانی لە دوای

راگەیاندنی ئەو ڕێککەوتننامەیە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ هەموو ئەو هەڵانەی پێشتر تێی کەوتبوون، کە نەیانتوانی بێجگە لە خۆ بەدەستەوەدان چی دیکە هەڵبژێرن.

دووەم: ئەو هەڵوێستەی سەرکردایەتی کورد گرتیەبەر بە بڕیارێکی دەستەجەمعی نەبووە[٤٤٥]، لە کاتێکدا سەرکردایەتی بە دەست پارتێکی سیاسی وەکو (پ.د.ك)ەوە بووە، (م.س)و سەرکردایەتیو ئەنجومەنی تەنفیزیو ژمارەیەك ئەندام مەکتەبو وەزیرو ڕاوێژکاری هەبوو، بەڵام هەموویان بەرپرسیاریەتی هەرمیان بە یەکسانی ناکەوێتە سەر شان[٤٤٦]

٤٤٥- سکرتێری م.س دەنووسێت: (زۆربەی لەگەڵ بەرگری دابوون)، (ئیبراهیم ئەحمەد) لە کاتی ئەو بڕیارە سەردانی مستەفا بارزانی کردووە، شاهیدی بۆ هەردوو کوڕەکەی دەدات، کە لەگەڵ بەرگری دابوون. سالح یوسفی لەگەڵ بەرگری دابووە، عەلی سنجاری بە خۆیی و لقی (٥) لەگەڵ بەرگری دابوون، هەموو ئەندامانی پێشووی باڵی (م.س)ی لێك هەڵوەشاوە، لەگەڵ بەرگری دابوون، ژمارەیەکی زۆری بەرپرسی سەربازیو (پ.م)ەکانی بەرەی بادینان لەگەڵ بەرگری دابوون، بەتەنیا بڕیاری سەنگەر چۆڵ کردن لەو حاڵەتە دەکەوێتە ئەستۆی مستەفا بارزانی. بڕوانە: (حبیب محمد کریم: تأریخ الحزب الدیمقراطي الکردستاني، ص١٣٩" محمد حسێن عەزیز: پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەدا، ب. ش، ١٩٩٥، ل٢١." أیوب بارزاني: الحرکة التحرریة الکردیة و صراع القوی، ص٥١٦٠-٥١٨، ٥٤٩" علی سنجاري: القضیة الکردیة، ج١/ص٦٩، ٧٨-٨٠" حەمە نوری تۆفیق: پیاونامە، ل٥٧-٥٨)

٤٤٦- ئاماژەی هەندێ لە نووسەرو توێژەران بۆ دوو جۆر پوخت دەبنەوە، هەیانە ئەو بڕیارە بە هی بڕیاری "م.س" ناودەبەن، بڕوانە: (سەروەر عەبدوڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٥٣" فوئاد کەریم. لە یادی ٢٤ هەمین، ل٢٣، ڕای بەرانبەر هەیە، ئەو بڕیارە لە سەر سەرکردەی کورت دەکەنەوە. بڕوانە: (ڕووداو، کوردستان یان، ل٢٤٧)، مستەفا بارزانیش هەرگیز ئەوەی نەشاردۆتەوە کە خۆی لەو بڕیارە بەر پرسیارە: (.. من وام بەچاك زانی لەوەی پتر نەبمە مایەی ڕشتنی خوێنی گەلی کوردو عێراق..) بڕوانە: کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢٦ یان ((..ڕای بارزانی بۆ ماوەیەك ڕاگرتنی شەڕ بوو، ئەمە باشترین ڕێگە بوو، بۆ ڕزگارکردنی گەلی کورد لە مەترسی لە ناوچوون، لە دوای گفتوگۆکردن لە سەر

هەموو رەهەندەکان لەگەڵ فەرماندە عەسکەرییەکانو کەسایەتییە حیزبیو سیاسییەکان رای هاتە سەر ئەو بڕیارە..) بڕوانە: دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٣٠٢، لە راپۆرتەکەی لیژنەی ئامادەکاری دا هاتووە کە:- (رێبەرایەتی بارزانی هیچ کات رێبەرایەتیەکی دەستەجەمعی نەبووە..)، بڕوانە: مبارزە ملی و مبارزەطبقاتی بە شی یەکەم، ایران – انتشارات اسماعیل شریف زادە، کوردستان ایران١٩٧٨، ص١٧٠-١٧١.

## باسی سێیەم

## کاریگەری ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە سەر هەرەسی شۆڕشی کورد

ئایا ڕێککەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥ کاریگەری یەکلاکەرەوەیە لە زیندە بە چالکردنی شۆڕش، یان هۆکارە ناوخۆییەکان، لەوانەیە بەشێکی هۆکاری نەبوونی توێژینەوەی زانستیانەی بێلایەن لەو بارەیەوە بگەڕێتەوە بۆ دابەشبوونی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان لە دوای نوشستی شۆڕش بۆ دوو بەرەی سەرەکی، کە تێڕوانینی جیایان هەبووە لە سەر هەڵسەنگاندنی ڕێڕەوی شۆڕشی ئەیلول و ئاکامەکانی، بە زەحمەت دەتوانرێت ئەو سەرچاوە واقیعیانە لە ناو لێکدانەوە جیاوازەکان بە دەست بخرێت، کە ئەندازەی دروستی کاریگەری ڕێککەوتننامەی لە سەر نوشستی شۆڕشی کوردی لێوەرگیرێت. لێکدانەوەیەکیان قورسایی تەواو دەخاتە سەر هۆکارە دەولیەکان و تاوان لە سەر سەرکردایەتی کورد کەمدەکاتەوە، لێکدانەوەی دووەم لە سەنگی هۆکارە دەولیەکەکان زۆر کەم دەکاتەوەو ئەو بەرپرسیاریەتیە مێژووییە زیاتر دەخاتە ئەستۆی سەرکردایەتی.

لە ڕۆژی ١٩٧٥/٣/٦ هەتا ڕۆژی ١٩٧٥/٣/١٩ سەرکردایەتی بڕیاری هەرەسی پەسند کرد، لە ماوەی ئەو دوو هەفتەیەدا، بە هۆی پڕوپاگەندەو پەرتەوازەیی

سەرکردایەتی وورەی هێزی پێشمەرگە دابەزی، حکومەت لێبوردنی گشتی بۆ هەموو هێزی پێشمەرگە راگەیاند، لە گەرمەی پەشێوی ناو سەرکردایەتی و کۆبوونەوەی بەردەوام و بێناکامی کۆبوونەوەکان پەشێویەکە زیادی کرد، لە رۆژی ٢٠/٣/١٩٧٥ لە ناکامی کۆبوونەوەی ١٨لە سەر ٣/١٩ بروسکە بۆ هەموو هێزی پێشمەرگە لێدرا خۆیان رادەستی حکومەت بکەنەوە[٤٤٧].

لە ناو ئەو بەڵگەنامەو دیکۆمێنتانەی دەمانگەیەنێتە دانانی رادەیەکی واقیعی بۆ رۆڵی هەردوو هۆکاری ناوخۆیی و هۆکاری دەولی، کە لە رێککەوتننامەی جەزائیر بەرجەستە دەبێت، سەرچاوە بیانیەکان وەکو توێژینەوە یان ریپۆرتاژی رۆژنامەنووسی، سەردانی کوردستانیان کردووە، لە ساغکردنەوەی ئەو بابەتانە واقیعبینترن لە سەرچاوە خۆماڵیەکان. لە سەرەتاوە بە هەڵسەنگاندنێکی رەوشی سیاسی و سەربازی و بوارەکانی دیکە دەگەینە کایە لاوازو بەهێزەکانی شۆرشی ئەیلول و سەرکردایەتیەکەی لە بەرانبەر ئەو بۆچوونەی، کە هۆکاری ناوەکی وەلادەنێت و جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە پیلانێکی دەرەکی شۆرشی کوردستانی لە ئازاری ساڵی ١٩٧٥ لە باریەك برد[٤٤٨]، لە بەرانبەریشدا رایەکی دیکە هەیە، کە رێککەوتننامەی جەزائیر وەکو هۆیەکی

---

٤٤٧- دەقی ئەو بروسکەیەی کە بەناوی بارەگای مستەفا بارزانی و (م.س)ەوە دەرچوو دەڵێ: (شۆرش تووشی پیلانێکی دەولی ترسناك بۆتەوە، بە جۆرێ ئەستەمە درێژە بەشۆرش بدرێ، گەلەکەمان بەرەو رووی کارلکاری و ماڵوێرانی بۆتەوە... بۆیە هەموو پێشمەرگەو هاووڵاتیان ئاگادار بکەنەوە، ئەگەر ئارەزوو دەکەن سوود لە بریاری لێبوردن وەربگرن و بگەرێنەوە بۆ عێراق... بەلام سەبارەت بە کادیرە حیزبی و بەرپرسە سەربازیەکان، ئەوە باشتە بکشێنەوە بۆ سەربازگەکانی پەنابەران لە ئێران، چونکە ئەگەر بگەرێنەوە بۆ عێراق هیچ زەمانەتێکی گیانیان نیە). بروانە: (علي سنجاري: القضية الكردية، ج١/ص٧٧

٤٤٨- پارتی دیموکراتی کوردستان، شەری ناوخۆ چۆن دەستی پێکرد و کێ لێی بەرپرسیارە؟ ب١، لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوەی (پ.د.ك)، هەولێر،١٩٩٧، ل١٣

دەرەکیو فاکتەرێکی بابەتی کاریگەر بوون، بەڵام گەر هۆکارە ناوەکیەکانو فاکتەرە خۆییەکان بۆ ڕوخانو هەرەس لە بار نەبوونایە تووشستی[449] رووی نەدەدا[450]، ئێمە لێرەدا هەردوو بۆچوونو بەڵگەو پاساوەکانیان دەخەینەڕوو لەگەڵ هەر ڕایەکی دیکە لە سەر ئەو بابەتە، دواتر بە بەراوردی هۆکارەکان هەوڵدەدەین هەڵسەنگاندێکی واقیعیانە بخەینە ڕوو.

**گرنگترین ئەو خاڵانەی کە سەرکردایەتیو هێزی پێشمەرگەو پارتی دیموکراتی کوردستانی لاواز کردبوو لە بەرانبەر هۆکارە دەرەکییەکان دەستەوەستان بێت دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەی کورتی بکەینەوە:**

**یەکەم: (پ.د.ك)و بەرپرسیاریەتی بەر لە رێککەوتننامەی جەزائیر.**

لە ساڵی ١٩٦٤ هەتا ساڵی ١٩٧٠و دوای بەیانی ١١ی ئازار (پ.د.ك) نەك هەر ببووە دوو لەت، بەڵکو بە هۆزی ئەو دوو لەتبوونەوە درز کەوتبووە ناو بزاڤی کوردایەتی، ئەوەی شۆڕشی هێشتبۆوە زیاتر جەماوەری کوردستانو (ه.پ)بووە. راستە (پ.د.ك) سەرکردایەتی (پ.د.ك)ی باڵی مستەفا بارزانی توانی ماوەی دوو ساڵ (پ.د.ك) باڵی (م.س) لە کوردستان دەربکات، دوایی بۆ ماوەی چوار ساڵ هەتا

---

٤٤٩- بەشێك لە نووسەرانو سیاسییەکانی کورد بەرانبەر بەو تووشستیەی شۆڕشی کوردستان وشەی (ئاشبەتاڵ)یان بەکارهێناوە، کە لە زمانی کوردی واتە بڵاوەپێکردنو چۆڵکردنی مەیدان. لەوانەیە بگونجێت لەگەڵ واقیعیەتی ڕووداوەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی مەغزایەکی سیاسی هەیە جێگەی لەم توێژینەوەیە نیە.

٤٥٠- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٩٦

بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ سەرکردایەتی توانی باڵی بەرانبەر بخاتە ریزی رژێمی بەعس، بەڵام بە هێزی ئەو بۆشاییەی لە سەرکردایەتی (پ.د.ك) دروست بوو، لە کۆنگرەی (٨)ی ١٩٧٠ کەسانی لاوازو کەم ئەزموون جێگایان گرتەوە"[٤٥١]، وەکو لە رووداوەکان بەدەردەکەوێ (پ.د.ك) پێشڕەوایەتی لە باڵەکەی دیکە بردەوەو شەرەفی رێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بەرکەوت، توانی بەرەی بەرانبەر ناچاری گەڕانەوە بکات، بەڵام لەوەدا زیانی لێکەوت، کە گیانی بە خەمەوە بوون و دڵسۆزی بۆ ئایندەی شۆڕشی کورد بە سەرکردایەتی خۆی لای سەدان کادیرو سەرکردەی ئەو باڵە لاواز کرد، (پ.د.ك) لە ماوەی پێنج ساڵی یەکەمی حەفتاکان، لە ئاستی سەرکردایەتی و بەرپرسیاریەتی کادیرە سیاسی و سەربازیەکان بەو ئەندازەیە سوود لە توانای ئەوانە وەرنەگیرا. قادر عەزیز دەڵێ: ((تێکەڵبوونەوەکە زۆر شکلی بوو ...))[٤٥٢]. ئەمە لە ئاستی سەرکردایەتی و خوێندنەوەی زاتی بۆ ئەو یەکگرتنەوەیە، لە راپۆرتی (لیژنەی ئامادەکاری) (پ.د.ك)دا هاتووە: ((...گەڕانەوەی ئەندامانی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان "م.س پێشوو" بۆ ریزەکانی پارتی و شۆڕش دەرفەتێکیدا بە دووبارە یەکگرتنەوەی حیزب و هەموو گەلی کورد بەو هەواڵە دڵخۆش بوون، بەڵام هەر

---

٤٥١- لە تەمموزی ساڵی ١٩٧٠ (پ.د.ك) کۆنگرەی هەشتەمی بەست، پێشتر باڵی (م.س) کۆنگرەی خۆی بەست و خۆی هەڵوەشاندەوە، بە نیازبوون لە کۆنگرەی هەشت بەشداری بکەن و یەك لە سێی کۆنگرە لەوان پێك بێت. کە را دەرنەچوو، لەبابەت هەردوو کۆنگرە بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٣٩٩" حبيب محمد كريم: صفحات من نضال الشعب الكردي. تاريخ مؤتمرات الحزب، الحزب الديمقراط الكردستاني، د.م، ١٩٩١، ص٢٥-٢٩)

٤٥٢- چاوپێکەوتنی توێژەر لە گەڵ قادر عەزیز، بەرواری ٢٠٠٦/٩/٧ سلێمانی.

له سەرەتاوە بەدیار کەوت سەرکردایەتی بارزانی‌و کەسانی بەرژەوەندپەرست ئەو یەکگرتنەوەیان بە جدی وەرنەگرت...))[٤٥٣].

ئەگەر سەرکردایەتی (پدك) تاوانبار بێت بە کالکردنەوەی هەستی خەمخۆری بۆ شۆڕش لە لایەن سەدان کادیری باڵەکەی دی بووبێتە بەشێك لە هۆکاری ئەو خەمساردیەی وەکو بەشێکی نووسشتی دەخرێتە روو[٤٥٤]، ناکرێ ئەمە بۆچوونێکی دروست بێت، چونکە یەکەمیان: (هپ) لە مەیدانی گیانفیدایی تێك نەشکا، سەرکردایەتی سیاسی ئەو کاتەی کوردستان نە بڕیاری ئاشتیداو نە پلانی شەڕی داڕشتبوو، سەرەڕای ئەوە نکۆڵی ناکرێت لە بوونی سیماکانی گەندەڵی لە ناو هێزی (پم)، دووەمیان: باڵی (مس) لە ژێر فشاری بەرنەجامەکانی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بڕیاری تێکەڵ بوونەوەیان دابوو، بە هۆی لایەنگری حکومەت زۆربەی جەماوەری خۆیان لە دەست دابوو، ئەگینا پێناچێ دیدی خۆیان بۆ سەرکردایەتی گۆڕانی بە سەردا هاتبێ.

کەسایەتی کاریزمای مستەفا بارزانی‌و مێژووی خەباتی ئەو هەر لە سەرەتای سیەکانی سەدەی بیستەمەوە دەست دەستپێکردووە، بەڵام تەمەنی مستەفا بارزانی، کە لە ساڵی ١٩٧٥ حەفتاو دوو ساڵ بووە، بەمەش هەم پیرو هەم نەخۆشی تەنگی پێهەڵچنیبوو بوو، سامی عەبدوڕەحمان، ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەگەر بارزانی گەنجترو خێزانەکەشی هەژارتر بوایە شەڕی رانەدەگرت، ئەویش پێی بە هۆکارێك دەگەڕێنێتەوە بۆ قبوڵکردنی ئەو نووشستیە[٤٥٥]، بەڵام هەر لە ناو بەرپرسانی (مس)ی ئەوکات رای

---

٤٥٣- اللجنة التحضيرية: تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص٢٠

٤٥٤- گەوهەری: رۆڵی بارزانی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی، ل١٦.

٤٥٥- راندال: کوردستان یان، ل٢٤٦

جیا هەیە، کە دەنووسێت: ((هەندێ کەس دەڵێن بارزانی پێ بیوو نەیدەتوانی بەرگری بکات..ئەوە راستە بەڵام کە لەساڵی ١٩٧٤ شەڕی هەڵگیرساندەوە پێ نەبوو، ئایا ئەو بە تەنیا بەرەنگاری دوژمن دەبێتەوە؟..))[٤٤٦]یان ((ئایا دەکرێ چارەنووسی گەلی کورد ببەسترێتەوە بە تاکە کەسێکەوە))، ئەوەش هەموو دەبێتە پشتگیری ئەو بۆچوونەی لە راپۆرتی لیژنەی ئامادەکاری (پ.د.ك)دا هاتووە، کە دەڵێ: ((بەرپرسیاریەتی لەوەی رووی‌دا سەرکردایەتی بووە نەك گەل))[٤٥٧]، کۆبوونەوەی جەماوەری کوردستان لە دەوری کەسایەتی کاریزما، کە پێشتر وەکو رەمزی بەرگری حیسابی بۆ کراوە، ئاسایە ئەو بەرئەنجامەی لێبکەوێتەوە[٤٥٨]

## دووەم: بەرپرسیاریەتی سەرکرایەتی (پ.د.ك) لە ئاستی پێشمەرگەو فەرماندەکان.

پرنسیپی حیزبایەتی پێش هەڵگیرسانەوەی شەڕ لاوازبوو، دوای شەش مانگی یەکەمی شەڕی یەك ساڵە شێوازەی رێکخراوەیی لە ناو جەماوەرو هێزی پێشمەرگە

٤٥٦- اللجنة التحضيرية: تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص٨١

٤٥٧-المصدر نفسه، ص٨١

٤٥٨- سامی عەبدوڕەحمان بە (راندال) دەڵێ: (ئێمە ئەرمان وانە بارزانی بە نیوە خوایەك دەزانی..)، بەهائەدین نووری لە سەر رووداوەکانی ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥و پشتگیری کورد لە شۆڕشی ئەیلول بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانی دەڵێ: (کورد هەمووی لەگەڵ مەلا مستەفا بوون، پێیان وابوو زۆر بەهێزتر دەگەڕێنەوە شارەکانو مەلا مستەفایان بە خوا دەزانی). بڕوانە: (کوردستان یان، ل٢٤٦)، دیدار لەگەڵ بەهائەدین نووری لە رۆژی ژ٢٠٠٦/٩/٨. یوسفی لە بابەت بڕیارەکانی کۆنگرەی هەشتەوە دەنووسێت: (لە دوا دانیشتنی کۆنگرەو لە ناو چەپڵەڕێزانی گەرم ئامادەبوان متمانەو گوێڕایەڵی رەهای خۆیان بۆ سەرکردە مستەفا بارزانی نوێنکردەوە). بڕوانە: (ثورة ايلول المجيدة، ص٦٠-٦١)

هەڵوەشابۆوە، ئەو شپرزە تێکچوونەی ناو (پ‌م)ش دەکەویتە ئەستۆی ئەو فەرماندانەی زوڵمیان کردووەو خەریکی پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆیان و پارە کۆکردنەوە بوون، خراپی ئەوانیش رەنگدانەوەی ناکۆکی و ململانێی نێوان ئەندامانی (م‌س) و سەرکردایەتی بووە لە سەر دابەشکردنی ئەو پۆست و دەسەڵاتانەی لە بەرئەنجامی رێککەوتنی ١١ی ئازار پێیان درابوو[٤٥٩]. لە راپۆرتی لیژنەی ئامادەکاری (پ‌د‌ك)دا هاتووە: ((سەرەڕای ئامادەیی گەلی کورد بۆ پشتیوانی لە شۆڕش و حیزب و قوربانیدان لەو پێناوەدا، بەلام لەگەڵ سەرەتای سالی ١٩٧٤ وردە وردە متمانەیان بەو سەرکردایەتیە لاواز دەبوو، هەروەها سەرکردایەتی حیزب و شۆڕش لەلای خۆیەوە لەو ماوەدا وەکو گەیشتبێتە دەسەڵات و پێویستی بە پشتگیری گەل نەمابێت، زیاتر بڕوای بە توانای مادی بوو لە رێگەی پارمەتی دەرەوە))[٤٦٠]، هەروەها دەنووسێت: ((...زۆری ئەوانەی پشتگیری شۆڕشیان دەکرد لە رووی چۆنایەتی لە سەر بنەڕەتی فیکری نەهاتبوون، ئەمەش زیانی لە بزاڤەکەدا پێش ئەوەی سوودی پێبگەیەنێت))[٤٦١]. لێرەوە دەگەینە دوو ئەنجام یەکەمیان: سەرکردایەتی لە دوای بە دەستهێنانی پشتگیری دەرەوە هێندە بایەخی بە رێکخستنی جەماوەر و هێزی پێشمەرگەی کوردستان نەداوە. دووەمیان: لاوازی و گەندەڵی لە ناو (ه‌پ) بڵاوببوەوە، ئەمەش لە ناکامی بێبایەخی سەرکردایەتی بووە بە توانای خۆماڵی شۆڕش.

٤٥٩- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (حوسێن محەمەد عەزیز، خولانەوە لە ناو بازنەیەکی بۆشدا، دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک لەگەڵ جەرجیس فەتحوڵای پارێزەردا، چ١، سوید، ١٩٩٧، ل٤٧-٥٠)

٤٦٠-هەمان سەرچاوە، ل٤٧-٥٢

٤٦١-هەمان سەرچاوە، ل٤٧-٥١

سەرکردایەتی بۆ کۆنترۆلکردنی ڕیزەکانی شۆڕش، پشتی بە دەزگایەك دەبەست بە ناوی (پاراستن)، لەو بارەیەوە عەلی سنجاری دەنووسێت: ((دەزگای پاراستن ڕۆڵی گەورەی گێڕا لە گەندەڵ کردن و وێرانکردنی بارودۆخی ناوخۆ، زۆربەی ئەندامەکانی ئەو دەزگایەیان بۆ مەرامی خۆیان بەکاریان دەهێنا، ڕاپۆرتی نادروستیان لە سەر بارودۆخی ناوچەکانیان بۆ سەررو دەنووسی و زۆر لە تاوانەکانی خۆیان دەشاردەوە..))[٤٦٢]

لە ماوەی ئاگربەستی ١٩٧٠ بۆ ١٩٧٤ بە زەقی باس لە گەندەڵی دارایی و واسیتەو خزمایەتی و بازرگانی و قاچاغچیەتی و دەوڵەمەندبوونی کاربەدەستان و قونتەراتچیەتی دەکرێ[٤٦٣]، لە لایەکی دیکەوە ڕێکخراوەکانی (پ.د.ك) لە ڕووی سیاسی و بەڕێوەچوونەوە لە بەر یەك هەڵوەشابوونەوەو جڵەوی کاروباری سەربازی لە دەست کەسانی نەشارەزا دابووە، دیاردەی چەك فرۆشتن و دزینی ئازوقەو شتی لەو بابەتە باس دەکرێ[٤٦٤]. مەسعود بارزانی لە ڕاپۆرتی سیاسی و عەسکەری بۆ کۆنگرەی نۆیەمی (پ.د.ك) دەڵێ: ((دەبێ ئیعتراف بکەین کە زۆر بە ئاشکرایی هۆی نەکسەی ١٩٧٥ بە تەنیا پیلانی (جەزائیر) نەبووە، بەڵکو بەرەڵلایی و بێ تەنزیمی ناوخۆمان هۆیەکی دیکەی گرنگ بوو بۆ نەکسە..))[٤٦٥].

---

٤٦٢- علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص١٠٢

٤٦٣- بۆ زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: (حوسێن محمد عزیز: خولانەوە لەناو بازنەیەکی، ل٣٩-٤٢° علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص١٠١)

٤٦٤- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٢٨٦

٤٦٥- ڕاپۆرتی سیاسی و عەسکەری و تەنزیمی سەرۆکی پارتی "مسعود بارزانی" بۆ کۆنگرەی نۆیەمی (پ.د.ك) لە سەرەتای تشرینی دووەم ١٩٧٩. لە کتێبی حبیب محمد کریم: تأریخ الحزب الدیمقراطي الکردستاني، ص٣٧٥

دەربارەی فەرماندە سەربازیەکان کە لە پیاوانی دەرەبەگو ئەخوێندەوارەکان پێکهاتبوو، ئەفسەرو پلەدارو شارەزایانی جەنگو بەرەنگاری بێکار بوون[٤٦٦]، ئەگەر لەو بارەیەوە زیادەڕۆیی کرابێت زۆری لە راستییەوە نزیکە.

هەژار موکریانی لە باسی سەفەری بارزانی لە ١١ی ئازاری ١٩٧٥ بۆ لای شا دەنووسێ: ((.. (نەسیری)[٤٦٧] بە مەلا مستەفاو مەحمود عوسمانی وت: ((من هاتووم شتێکتان پێ رابگەیەنم ئێرانی شاهەنشاهی بە سەدەها دۆلاری یاریدەی شۆڕش داوە، بە چەلەر سەربازی خۆشمان هاتوینە یاریدەتان، ئێوە هیچ بەهرەتان پێوە نەماوە، گەورەکانی لەشکرتان هەموو دزن، هەر خەریکی گیرفانی خۆیانن، چەند جارمان وتووە ........و کێ و کێ دزو خائینن دەریان کەن، بە قسەتان نەکردین، ئێستا لەم شەڕە هەرچی فەرماندەی شۆڕشو فەرماندەی هێزەکانتان لە شارەکانی ئێران رادەبوێرن، کەسیان لە جەبهە نیە، پەنجا گوللە تۆپمان لە دامێنی زۆزك تەقاند سەنگەرمان بە عەرەبان چۆڵ کرد، پێشمەرگە نەچوون سەنگەرەکان داگیر بکەن...))[٤٦٨]، راستە موکریانی لەو ماوەیەدا لە نزیکەوە ئاگاداری رۆژانەی شۆڕش بووە، بەڵام ئەو نە یاوەری بارزانی بووە بۆ لای شاو نە ئەوانەی بەشدار بوون ئەو قسەیان پشتڕاست کردۆتەوە، بەڵام دەکرێ وەکو گوزارشتی نووسەر وەربگیرێ لە سەر شۆڕش، لەلایەکی دیکەوە ئەو قسانەی نیعمەتوڵڵای نەسیری لە سەر زاری موکریانیەوە هۆکاری کشانەوەی هاریکاری ئێرانی نەبووە لە شۆڕشی کورد، چونکە هاریکاریو پشتکردن لە شۆڕش هۆکاری دیکە بووە، نکۆڵی لە دیاردەی گەندەڵی ناکرێ، لەلایەکی دیکەوە لەو ماوەیەدا هیچ

---

٤٦٦- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٣٨٧

٤٦٧- مەبەست لە نەسیری: نیعمت الله النصیری سەرۆکی موخابەراتی ئێرانی (ساواک)ی ئەوکاتەیە. بڕوانە: (الحرصان: التیارات السیاسیە، ص٢٢٦)

٤٦٨- هەژار: چێشتی مجێور، چ١، ب ش، بیروت، ل٥٥٤

ناماژەیەك بە مەشق و خولی هوشیاکردنەوەی پێشمەرگە نییە، هەتا باس لە هەڵوەشانەوەی ڕێکخستن و دیسپلینی حیزبی دەکرێت لە ناو تەشکیلاتی پێشمەرگە[469].
دیارە لە بەرانبەردا بە ئاراستەی تەشکیلەیەکی ناوچەگەری و سیمای دەرەبەگایەتی بەسەر فەرماندەو بەتالیون و هێزەکاندا زاڵ بووە[470]. سەرکردایەتی لەجیاتی ئەوەی پشتگیری لێ بکات بۆ دڵ ڕازیکردنی چەند دەرەبەگێکی بەرپرس لە ریزی پێشمەرگە، دژی وەستایەوە، بەمەش متمانەی شۆڕش لەلایەن جوتیارو ڕەش و ڕووتی کورد هەتا دەهات لاواز تر دەبوو[471]، ئەمەش بە هۆی کاریگەری بیری چەپ ئەو زەمانە لە برەو دابوو، کاریگەری بە سەر ناکۆکی نێوان زۆربەی جەماوەری جوتیاری کوردەوە هەبووە لەبەرانبەر خاوەن زەوی و دەرەبەگایەتی، بەتایبەت کە تەشکیلاتی پێشمەرگەو بەرپرسانیش ڕوخساریکی دەرەبەگانەی هەلگرتبوو.

**سێیەم: شۆڕش لە مەیدانی بەرەنگاری پشتی بە یەك شێواز بەستبوو،** ئەویش شەڕی بەرەیی و سەنگەرگرتن بوو بۆ پاراستنی ناوچەی ئازاد کراو شارەکان چۆڵ کران لە لایەنگرانی شۆڕش، جوتیارانی ناوچەکانی بندەستی حکومەتی عێراقی گوندەکانیان بەجێهێشت،ئابووری کوردستان بەهۆی دانەچاندنی زەویە کشتوکاڵیەکان زیانی گەورەی لێکەوت و درێژەدان بە شۆڕش باری قورستر کرد[472].

---

٤٦٩- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (سەروەر عەبدورەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٢٢، ٣٥)

٤٧٠- تەشکیلاتی هێزی پێشمەرگە لە شۆڕشی ئەیلول بەم شێوەیە بووە: لە دوای مەکتەبی عەسکەری هێز هەبووە، هەر هێزێك لە چەند بەتالیون پێك هاتبوو، ئەویش دابەش دەکرا بە ٣ تا ٤ لق و ئینجا بچوکتر دەبۆوە بۆ پەل و لە پەلەوە دەستە، هەر دەستەیەکیش لە ٩ بۆ ١٢ پێم. پێکهاتووە. بڕوانە: (ئەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٢-١١٣" حەمید ئەفەندی: سەرنجێك لە سەر شۆڕشی ئەیلول، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٥)ی پاییزی ٢٠٠٢، ل١٥١-١٥٤)

٤٧١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (تقيم مسيرة الثورة الكردية، ص٢٨-٣٩)

٤٧٢- ژیرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلێکی، ل٣٢٤

شەڕی بەرەیش هۆکارێکی دیکە بووە لە شکستی شۆڕشەکە، کە نەتوانرا شێوازی شەڕی پارتیزانی بگیرێتەبەرو درێژە بە شۆڕش بدرێت[٤٧٣]

لە ڕووی خەباتی دیبلۆماسیو پشتبەستن بە پشتیوانی دەرەکی سەرکردایەتی شۆڕش قورسایی بە تەنیا خستبووە سەر بەرەی ئەمریکاو ئێران. مەحمود عوسمان ئەمەی بە سێگۆشەیەك وێنا کردووە، کە ئێران ئەوجا ئیسرائیلو ئەمریکا..ئەوانە پێکەوە بەسترا بوون، لە نێوان خۆیاندا لە سەر هەموو شتێك ڕێککەوتبوون، کورد ئەوکات لێکدانەوەیەکی نادروستی هەبووە بۆ سیاسەتی دەولی[٤٧٤]، هەر لەو بارەیەوە لە ڕاپۆرتی لیژنەی ئامادەکاری (پدك)دا هاتووە: ((..بایەخەکانی سەرکردایەتی کورت هەڵهاتبوو لە سەر پەیوەندی کردن بە دەوڵەتانو لایەنە ڕەسمیەکان بە تایبەتیش لایەنی ئیمپریالستیو کۆنەپەرستی بەبێ ئەوەی بایەخ بە ڕای گشتی جیهانیو ڕێکخراوو پارتە پێشکەوتوخوازو نیشتیمانیەکان بدرێ، هەروەها هیچ بایەخی بە پەیوەندی بە بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلانو کۆنگرە دەولیەکان نەدەدا، ئەوە ڕای کرد لە هەموو ئەو لایەنانە دابڕێ...))[٤٧٥]، ئەگەرچی سەرکردایەتی شۆڕش لە هەوڵی ئەوەدا بووە سەرەڕای پەیوەندیو وەرگرتنی یارمەتی لە ئێرانو ئەمریکا پەیوەندی باشی لەگەڵ هەندێ لە وڵاتانی عەرەبیدا هەبێت، بەڵام لە ئاستی ئەو پیلانەدا نەبووە[٤٧٦].

---

٤٧٣- دیدار لەگەڵ بەڕێز قادر عەزیز لە ڕۆژی ٧/٩/ ٢٠٠٦ لە سلێمانی.

٤٧٤- چاوپێکەوتنی کوردستانی نوێ لەگەڵ مەحمود عوسمان، ژمارە (١٥٢٢)ی ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٧

٤٧٥- تقیم مسیرة الثورة الکردیة، ص٦٧

٤٧٦- بۆ زانیاری زیاتر لە سەر کۆی پەیوەندییەکانی شۆڕشی ئەیلول لە ئاستی دەرەوە بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحرکة، ج٣/ص٣٦٣-٣٨٢).

پێداگرتن لە سەر یەك جۆری خەباتو پشتبەست بە دەرەوەو هەوڵ نەدان بۆ ئەلتەرناتیڤ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی تووشی ئەو دەستەوستانیە کرد، کە بێجگە لە خۆ بەدەستەوەدان نەتوانێ چارەسەری دیکە هەڵبژێرێ.

**چوارەم: تێڕوانینو خوێندنەوەی جیای ناو شەقامی کوردستان،** لەوانە ڕەنگدانەوەی ڕەوتو بۆچوونی سیاسیو فیکری جیا، کە هێشتا ئەمریکای بە ئیمپریالیزم دەزانێ، ڕاستە (حشع) لەگەڵ بەرەی دژە شۆڕشی کوردستان دابوو، بەڵام بیری چەپ لە کوردستان لەوە بەرفراوان تر بووە، ڕۆژنامەی (ڕزگاری)و گۆڤاری (نور) بە زمانی کوردیو عەرەبی تێڕوانینی جیاواز بوون لەوەی سەرکردایەتی شۆڕش کاری لە سەر دەکرد، کتێبی جەلال تاڵەبانی بە ناوی (کوردایەتی) کە لە شەستەکان وەکو پرۆگرامی هۆشیاری سیاسی دەخوێندرا، دەنووسێت: ((... مەسئولیەتی یەکەمین لە دابەشکردنی کوردو کوردستان، بە بێبەش هێشتنەوەی گەلی کورد لە هەموو کیانێکی نەتەوایەتی لە ئەستۆی ئیمپریالیزمە. هەر بۆیەشە کوردایەتی ئیمپریالزمی بە دوژمنی هەرە گەورەی خۆی ناسیوە...))[٤٧٧]. هەر سەبارەت بە پیلانی ئیمپریالزم دەنووسێت: ((..لە ڕووی سیاسیو پیلان دانانو تەگبیرکردنیش دژی کوردایەتی درێغیان نەکردووە...))[٤٧٨]. لە بڵاوکراوەیەکی باڵی (م.س)دا هاتووە: ((...هەر کەسێ پەیوەندی لەگەڵ ئیمپریالستیو زایونیو هاوپەیمانیەتی سەنتۆ سێگۆچکەی دوژمن بە گەلی کورد بگرێتە بەر، ناتوانێت دڵسۆز بێت بۆ چارەسەری دیموکراتیانەی کێشەی

---

٤٧٧- جلال تاڵەبانی: کوردایەتی، بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی گەلی کوردستان، ب. ش، ب.م، ل٤٢.

٤٧٨- هەمان سەرچاوە، ل٤٢

کوردو پێداگرێیت لە سەر بە دەستهێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد))[479]. بۆیە لە دوای بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی باڵی (م‌س)ی (پ.د.ك) لە نیسانی ساڵی ١٩٧٠، بەشێکی گرنگی کادیرە بە تواناکانی ئەو باڵە ڕێکخراوێکی تریان لە سەر بیروباوەڕی چەپ دامەزراند بە ناوی (کۆمەڵەی مارکسی لنینی کوردستان)[480]و فەرماندە سەربازیەکانیشیان لە پەراوێزی شۆڕشدا کاری پێشمەرگانەی خۆیان رادەپەڕاند، بەڵام کاریگەری چەپ لە ناویاندا هەر مابوو.

پێنجەم: هەم ساڵی ١٩٧٠ بۆ ساڵی ١٩٧٤ ماوەی ئاگربەست، هەم ماوەی ئەو ساڵەی شەڕی تێدا هەڵگیرسایەوە، لە ڕووی دەرفەتو کەرەستەکانی خۆبەهێزکردنو سوود وەرگرتن لە تواناکان دەرفەتێکی لە بار بووە بۆ سەرکردایەتی (پ.د.ك) هەتا خۆی ئامادە بکات لە هەموو ڕووەکانەوە، بەرەی ناوخۆ بەهێز بکاتو پشتبەستن بە دەرەوە کەم بکاتەوە، لە ئاستی ناوخۆدا زیاتر پشت بەخۆی ببەستێت بەڵام دەرفەت لە دەست چوو لەوبارەوە کاری پێویست ئەنجام نەدرا. سەرکردایەتی سوودی لەو دەرەفەتەی لە بەردەستی دابوو وەرنەگرت[481].

لە بەر نەبوونی سەرژمێری ورد لە سەر ژمارەی هێزی پێشمەرگە بەشی زۆری لەوبارەوە ژمارەی تەخمینی بە زیاتر لە(٥٠) هەزار دادەنێن ئەمە سەرەڕای ژمارەی هێزی پشتگیری کە دانیشتوانی ناوچەکان بە چەکو تەقەمەنی خۆیان پێکیان هێنا بوو، نزیکەی لە (٤٠) هەزار تێدەپەڕی سەرەڕای ئەوانە ژمارەی ئەو ئەفسەرو پلەدارە کوردانەی لە ریزەکانی سوپاو پۆلیس هاتبوونە ریزی شۆڕش ژمارەیان دەگەیشتە

٤٧٩- منشورات جريدة النور، اراء في المسألة الكردية، د.م،١٩٧٠، ص٤٠

٤٨٠- بۆ دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوە بڕوانە: بەشی سێیەم.

٤٨١-جەبار قادر: چەند بابەتێکی، ل٧٩

(٤٧٠) ئەفسەرو پۆلیسی پلەداری کورد[٤٨٢]، هەروەها سەرچاوەکان، ئەو هەموو پارچە چەکەی لەبەردەستی شۆڕش دابووە، کە دوای هەرەسی ئەو چەکانە رادەستی حکومەت کرانەوە[٤٨٣].

شۆڕش خاوەنی سەدان پزیشک‌و پارێزەرو ئەندازیارو مامۆستای زانکۆو مامۆستای ئامادەیی‌و سەرەتایی بووە[٤٨٤]، کە ئەمە سامانێکی گەورە بووە بۆ پاراستنی شۆڕش.

ئەگەر ئەو سەرنجانەی سەرەوە وەکو هۆکاری ناوخۆ وەربگرین لە سەر هەرەسی شۆڕشی ئەیلول پیلانی نێودەوڵەتی بۆ هەرەسی شۆڕش، کە لە رێککەوتننامەی جەزائیر چڕ دەبێتەوە، ئەوکات ئەو پرسیارە بێ وەڵام دەمێنێتەوە، ئەگەر بە هۆی بەرئەنجامەکانی پیلانی ئەو رێککەوتننامەیەوە شۆڕش هەرەسی نەهێنابێت، بۆچی چەند مانگ پێش ١٩٧٥/٣/٦ لە کاتێکی دیکەدا نەبوو؟

گومان ناهێڵێتەوە، کە هەرەس لە ئاکامی رێککەوتننامەی نێوان عێراق‌و ئێرانەوە بووە، بەڵام ئایا بۆچی شۆڕش بە پیلانی هاریکاری نێوان دوژمنەکانی هەرەس دێنێت؟ ئایا ئەو شۆڕشە بنچینەکانی خەباتی رزگاری نیشتیمانی خۆی لە سەر بڕوا بوون بە دوژمنەکانی هەڵچنیبوو؟. ئایا لە دوای راگەیاندنی پیلانی دوژمنەکان لە

٤٨٢- سەرژمێری دروست لە بەردەست دانیە لە باری ژمارەی دروستی (پ‌م)و بەرگری میللی، بەڵام ژمارەکان زۆر لێك دوور نین بۆ نموونە، نەوشیروان مستەفا، ژمارەی (پ. م) بە (٩٠) هەزارو هێزی بەرگری میلی بە (٤٣) هەزار دیاری دەکات، ئەفسەرو پلەدارانی سوپاو پۆلیس بە (٤٧٠) دادەنێت، جلیم تۆفیق‌و مەکدوال، ژمارەی (پ‌م) بە (٥٠) هەزار دادەنێت، بڕوانە: (پەنجەکان، ل١١٣" مەسەلەی کوردو یاسای نێودەوڵەتان، ل٤٠٤" مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٥٣)

٤٨٣-سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٥٥-٥٦

٤٨٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئازاد عوبێد: کاریگەری شۆڕشی ئەیلول، ل٢٤٢- ٢٤٤" ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان‌و، ل٢٨٠-٢٨١" نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١١٢-١١٤).

جەزائیر دەرفەتی درێژەدان بە شۆڕش نەمابووە؟ کامانەن ئەو دەروازە داخراوانەی بەردەم درێژەدان بە شۆڕش؟ لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەوە دەگەینە ئامانجی ئەم باسە، ئەویش گەیشتن بە ئەنجامێکی نزیك لە راستییەوە لە سەر دابەش کردنی دادگەرانەی هۆکارەکانی هەرەس بە سەر هۆکاری ڕێککەوتننامەی جەزائیرو هۆکارەکانی دیکە.

مەحمود عوسمان بەشداری یەکەم وەفدی کوردی بووە لە دوای بڕیاری ئەمریکا بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی کورد، لە ئەمووزی ساڵی ۱۹۷۲ لە جیاتی (هنری کیسنجەر) چاویان بە (ریچارد هێلمز) سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی ( CIA ) کەوتووە، پێی وتبوون ((... ئەو پەیوەندییە لە سەر داوای شا بووە، دەبێت بە نهێنی بمێنێتەوە...))[485]. هەر ئەویش لە راپۆرتەکەیدا دوای هەرەس بەشی زۆری هۆکارەکانی هەرەس دەخاتە ئەستۆی هۆکاری ناوخۆو لەویش دەیخاتە ئەستۆی سەرکردایەتی (پ.د.ك)و روونتر بازنەیەکی بچوکتر. بەم حاڵە دەگەینە دوو ئەنجام یەکەمیان: نهێنی پەیوەندی سەرکردایەتی کوردو ئەمریکا لە بازنەیەکی بچوکدا ماوەتەوە، دووەمیان: پاڵپشتێکی گرەنتی لای ئەمریکیەکان نەبووە لە سەر هاریکاری هەمیشەیی‌و دوور لە کاریگەری ئێرانی، بەمەش متمانە بوون بە بەڵێنەکانی ئەمریکاو بێمتمانەیی بە ئێران بایەخێکی نامێنێت، بەهائەدین نووری ئەوکات ئەندامی سەرکردایەتی (حشع) بووە، کە بەرەیان لەگەڵ حیزبی بەعس هەبووە، وەکو نەیار بەرانبەر سەرکردایەتی (پ.د.ك) پێی وایە ئەگەر شۆڕش لە سەر نەخشەی جەنگی پارتیزانی دابنرایە کاریگەری ڕێککەوتننامەکە پێچەڵ دەبۆوە، هەڵوێستی سۆڤیەت لە بەرانبەر شۆڕشی کوردو حکومەتی بەعس گۆڕانی بەسەردا دەهات[486].

---

۴۸۵- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج۳/ص۳۷۸

۴۸۶- دیدار لەگەڵ نارپراو لە ۱۸/۹/۲۰۰۶، لە سلێمانی.

هەردوو تێڕوانینی تەواو جیاواز لە هۆکارەکانی هەرەسی شۆڕش[٤٨٧]، هەندێ جار نابەتیانەو بەدەر لە واقیعی ئەکادیمی قسە لە سەر ئەو بابەتە دەکرێ[٤٨٨]. لەلایەکی دیکەوە بەشی زۆری وردەکاریەکانی پەیوەست بە پەیوەندی کوردو ئەمریکاو ئێران بە نهێنی ماوەتەوە. هەندێ جار لە لایەن (پ.د.ك) خۆیەوە وەکو هۆکاری ناوخۆ ر ٔن کراوەتەوە، لە یەکەم ژمارەی خەباتی دوای هەرەس، کە لەلایەن سەرکردایەتی کاتیەوە دەرچووە، هاتووە: ((.. لە مانگەکانی یەکەمدا (سەرکردایەتی) پیلانی بەدیلی دانەنابوو، ئەگەر یارمەتی دەرەوەمان لێ ببڕێ چی بکەین...))[٤٨٩]، لە راپۆرتی یەکەم کۆنگرەی سەرکردایەتی کاتی (پ.د.ك) لە ناوەڕاستی ئابی ساڵی ١٩٧٩ پێ لە سەر لاوازی سەرکردایەتیدا دەگرێ بە تایبەت لە ساڵانی پێش ئەو ڕێککەوتننامەیە[٤٩٠]، هەر لە راپۆرتی سەرکردایەتی کاتی (پ.د.ك) لە ئاست پشت بەستنی تەواو بە ئێران لە ساڵی ١٩٧٤ بە هەڵەیەکی ستراتیژی دەخاتەڕوو[٤٩١].

---

٤٨٧-لەو بارەیەوە بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٣٩٦" ئەحمەد سەلام، لە کتێبی: کونگرەی ٩٠ ساڵەی بارزانی نەمر، کوردستان ١٩٩٧، ل١٦١-١٦٩" پارتی دیموکراتی کوردستان: شەڕی ناوخۆ چۆن دەستی پێکرد ١، ل١٢" دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٣٠-٣٢" البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص٣٥٤-٣٥٥" بەیاننامەی راگەیاندنی (سەرکردایەتی کاتی)، لە بەڵگەنامەی ژمارە(١٠)" فەرید ئەسەسەرد، رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٢٠٩٣)ی ٨/٣/٢٠٠،

٤٨٨- لە چاوپێکەوتنێکی دا "عەبدوسەلام بەرواری" بەرپرسی مەکتەبی دیراسات و توێژینەوەی (پ.د.ك) لە ئێوارەی ٦/٣/٢٠٠٧، تایبەت بەو یادە وتی: (ئەگەر شۆڕشی چەکداری بەردەوام بوایە سعودیە، ئوردن، تورکیا، عێراق، ئێران، سوریان هەموویان لێ یان دەداین)، ئەمەش پاساوێکی نەکردەی بەرنەفامەکانە.

٤٨٩- رۆژنامەی خەبات، ژمارە (١) لە ساڵی ١٩٧٦

٤٩٠- پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێبازی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد، راپۆرتی سیاسی سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان، پەسندکراوی کۆنفراسی (١١- ١٥) ئابی ١٩٧٦، ل٢٨

٤٩١- هەمان سەرچاوە، ل٥٦

له ناكامی تاو وتویژ كردنی ئه‌و سه‌رچاوانه‌ی له‌ به‌رده‌ستدان‌و ئه‌وه‌ی خرانه‌ڕوو ده‌گه‌ینه‌ ئه‌و ناكامه‌ی خواره‌وه‌:

یه‌كه‌م: ڕێككه‌وتننامه‌ی جه‌زائیر كاریگه‌ری زۆر گه‌وره‌ی هه‌بووه‌ له‌ سه‌ر هه‌رەسی شۆڕشی كورد، كاتێك ده‌توانرێ درك به‌و قه‌ناعه‌ته‌ بكه‌ین، له‌ پێناسه‌یه‌كی تیوری نار فه‌رهه‌نگی سیاسی له‌ سه‌ر شۆڕش‌و پرنسیپی حیزبایه‌تی دوور بكه‌وینه‌وه‌ بۆ واقیعی سه‌ركردایه‌تیكردنی شۆڕش، نه‌ك كاریگه‌ری سه‌ركه‌وتنه‌كانی شۆڕش له‌ چوارچێوه‌یه‌ك دابڕێنرێن وه‌كو ده‌مانه‌وێ، ئه‌وكات كاریگه‌ره‌یه‌ نارخۆكان زه‌ق ده‌بنه‌وه‌. هه‌تا نه‌گه‌ڕێینه‌وه‌ بۆ ئه‌ندازه‌ی كاریگه‌ری ئێران‌و ئه‌مریكاو ته‌نانه‌ت ئیسرائیلیش له‌ سه‌ر سه‌ركردایه‌تی شۆڕشه‌كه‌ له‌ ڕووی پشتیوانیكردن به‌ چه‌كی قورس‌و تۆپی دژه‌ تانك‌و دژه‌ ئاسمانی‌و هاریكاری به‌ پاره‌و چه‌ك‌و حه‌واندنه‌وه‌ی ئاواره‌كان‌و دابینكردنی شوێنی حه‌وانه‌ی ماڵ‌و خێزانی (پ‌م)و ڕێگه‌دان به‌ هاتنی ده‌یان ڕۆژنامه‌نووس بۆ به‌ره‌كانی شه‌ڕو ئاماده‌كردنی ڕاپۆرت له‌ سه‌ر باروودۆخی كوردستان، چه‌ندان جۆری دیكه‌ی پشتیوانی كردن. پێوانه‌ی دروستمان ده‌ست ناكه‌وێ له‌ به‌رانبه‌ر كاریگه‌ری نه‌مانی ئه‌و پشتیوانیه‌ به‌ هۆی ڕێككه‌وتننامه‌ی جه‌زائیره‌وه‌، عه‌بدوڕه‌حمانی قاسملو تایبه‌ت به‌ هۆكاری ده‌ره‌كی له‌ سه‌ر هه‌رەسی شۆڕش ئه‌یلول ده‌نووسێ: ((...ئاشتی هه‌میشه‌ به‌ ده‌ست ئه‌وانه‌وه‌یه‌، كه‌ بالاده‌ستی شه‌ڕیان له‌ ده‌ستدایه‌، وه‌ختێك شا ده‌بێته‌ لایه‌نی ئه‌سڵی شه‌ڕ وا چاوه‌ڕوان ده‌كرێ بالاده‌ستی ئاشتی بكه‌وێته‌ ده‌ست ئه‌و...))[492]. یه‌كێك له‌ ئه‌ندامانی ئه‌وكاته‌ی سه‌ركردایه‌تی (پ‌د‌ك) به‌ ڕوونی ئه‌وه‌ ده‌رده‌خا كه‌ ((.. له‌

492- عه‌بدوڕه‌حمان قاسملو، عه‌بدوڵڵای حه‌سه‌ن زاده‌: كورته‌ مێژووی حیزبی دیموكراتی كوردستانی، ل275

بەردەوام بوونی شەڕ بە تەواوی پشت بەستوا بوو بە هاریکاری دەرەکی، کە ئەو پاڵپشتە دەرەکییە ئەما خێرا هەرەسی هێنا))[493]. ئێران‌و ئەمریکا رۆڵیان لە سەر بەهێزکردنی شۆڕشی ئەیلول کەم ئەبووە، بۆیە ناکرێ ئەو رۆڵەی لە هەرەس لێ وەربگرتتەوە.

دووەم: بە وەرگرتنی ماوەی ٣/٦ بۆ ٢٠/٣/ ١٩٧٥ ناگەینە سەرنەنجامێکی تەواو، چونکە چواردە رۆژ ژانی لە بارچوونی شۆڕش بوو، هەڵقەیەکی پێکەوە گرێدراوە لەگەڵ زنجیرە رووداوەکانی پێش خۆی، بە تایبەت لە ساڵی ١٩٧٣ بە دواوە، کە سەرکردایەتی شۆڕش رازی بوو قورسایەکی بخاتە سەر هاریکاری دەرەکی‌و ئامانجەکانی لەگەڵ ئامانجەکانی ئەمریکاو شای ئێران تێکەڵ بکات. کاتێک ئەو پاڵپشتیە نەماو سەرکردایەتی پێشتر حیسابی بۆ ئەگەری رێککەوتنێکی لەو جۆرە نەکردووە، وەکو جۆناتان ئاماژەی پێ دەدات: ((مستەفا بارزانی ئەوکات باجی لێکدانەوە کورتبینیەکانی خۆی دەدات))[494].

سێیەم: دەیان شۆڕش‌و راپەڕین لە مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کوردی هەردوو سەدەی نۆزدەو بیست بەو شێوە لە ناوچوون، شێخ عوبێدوڵڵا (١٨٨١ز) ، کۆماری کوردستان (١٩٤٦-١٩٤٧ز)، سەرکردایەتیەکەیان نەیانتوانیوە یان لە بیری ئەوەدا نەبوون بە نیوە هەرەس رازی بن، سروشتی ئەو شۆڕش‌و راپەڕینانەی لە دەوری کەسایەتی کاریزما ئەنجام دراوە هاوشێوە بووە، مستەفا بارزانی پێش ئەوەی سەرۆکی (پ د ك) بێت لە جەولەی دیکەدا رۆڵی لە سەرکردایەتی بزاڤی کوردایەتیدا هەبووە، لە ساڵانی (١٩٣٣) و (١٩٤٣ بۆ ١٩٤٥)و لە کۆماری کوردستان (١٩٤٦-١٩٤٧) رۆڵی کاریگەری گێڕاوە، هەموو ئەوانە لە راپەڕینی جەماوەری‌و شۆڕشی چەکداری

٤٩٣-علی سنجاری: الحركة التحررية الكردية، ص١٠١

٤٩٤-کوردستان یان، ل٢٢٤

یەکسەر بۆ هەرەس، شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودو قازی موحەمەد، کە هێمای ئازادی رزگاریخوازی گەلی کوردستانن ئاکامی ئازادە کەیان لە ئازادییەکی جەماوەری بەرفراوانەوە بۆ هەرەس و تواندنەوەی شۆڕش بووە.

خاڵی لێکچوو لە نێوان شۆڕشی ئەیلول و نمونەی پێش خۆی ئەوە بووە، ئەیلول دوا شۆڕش بووە، کە روخساری پێش خۆی ون نەکردبێت، بەڵام هەرەسی ئەوان بە تاوانێکی گەورە حیسابی بۆ نەکراوە لە مێژووی ئازادی کوردی، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکاریەی دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول بە سەر ئازادی کوردایەتیدا هاتوو، هەروەها سەرکردەکانی بە شێک لەو شۆڕشانە لەگەڵ هەرەسی شۆڕشەکەیان سەرکردەکەیان چووە بەر سێدارە، دوای هەرەس بووە هێمای خۆبەختکردن، دیدی دوای شۆڕش نابینا بووە لەبەرانبەر هەڵەکانی سەرکردایەتی کردنی ئەو شۆڕشانە، ئەگەر مستەفا بارزانی لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرکردایەتیەکەی لە ئاکامی هەرەس گیانیان ببوایە قوربانی، لە ساڵانی دواتر هەموو ئەو بەرپرسیاریەتیەی دەکەوتە سەر شانیان لە هەرەسی شۆڕش ون دەبوو.

شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لە سەدەی پێشووتر نزیک بە ژمارەی جەنگاوەرەکانی شۆڕشی ئەیلول (پ م)ی هەبووە، لە دوای نووشستی هێنانی لە بەرانبەر قاجاریەکان بە ژمارەیەکی زۆر کەمی جەنگاوەرەوە گەڕایەوە ئەهری شوێنی حەوانەوەی خۆیی و لەوێدا خۆیدا بە دەست دەوڵەتی عوسمانی[٤٩٥]، بەڵام ناوی وەکو کەمتەرخەم ناهێنرێ، پشتبەستنی قازی موحەمەد بەدەرەوەو کاریگەری رێککەوتنی ئێرانی و سۆڤیەتی وەکو هۆکاری سەرەکی لە کەوتنی کۆمار بەرچاوە بەڵام قازی بەو ئەندازەیە نەکەوتۆتە بەردەم بەرپرسیاریەتی.

---

٤٩٥- بڕوانە: (عثمان علي: دراسة في حركة الكردية، ص٧٤)

چوارەم: ناوچەی ئازادکراو لە ماوەی یەك دوو مانگی یەکەمی شەڕ سێ لە سەر چواری دانیشتوانی کوردستانی باشووری لە سنووری لە خانەقینەوە بۆ زاخۆ کۆکردەوە، شۆڕش کەوتە هەڵەی زۆر زەقەوە بەوەی نزیکەی نیو ملیۆن جەماوەری شارەکانی کوردستانی هێنایە سنوورەکان، کە نەکرایە بارسەنگ بۆ شەڕی بەرەیی، زانکۆی سلێمانیو هەردوو پەیمانگای مامۆستایانی هەولێرو دهۆکیشی بە هەموو مامۆستاو کارمەندو قوتابییەکانەوە گواستەوە بۆ ناوچەی ئازادکراو[496]، حکومەتی عێراق هەتا باری سەرشانی شۆڕش قورس بێت رێگر نەبوو لە چۆلکردنی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیو حکومەتی ئێرانیش هەتا لەو پەناهەندانە لە ئایندە وەکو بارمتە وەربگرێت دەرفەتەکەی قۆستەوە بۆیە ئەمەش بە یەکێك لە هۆکارە ناوخۆییەکانی هەرەس دەژمێردرێت[497]. هەیە دەڵێ: لە سەرەتاوە ئامانجی سەرکردایەتی کورد ئەوە بووە وەکو بەنگلادێش بە رەوکردنی جەماوەر ئەمری واقیع دروست بکات[498]. بەڵام ئامانجی

---

٤٩٦- لە ١٩٧٥/٣/٣١ لە رێگەی ئیزگەی شۆڕشەوە ئەم ئاگاداریە خوێندراوەتەوە: (هەموو برین پێچو موچە خۆرەکانی نەخۆشخانەکان بە هەموو کەلو پەلە پزشکیەکانیانەوە بەرەو بارەگای سەرکردایەتی بڕۆن، تا شوێنی کارکردنو جێگای دانانی نەخۆشخانەکانی شۆڕشیان بۆ دیاری بکرێت).
هەموو قوتابیانی قوتابخانە پیشەییەکانو خوێندکارانی زانکۆی سلێمانیو دکتۆرو مامۆستایانی کۆلیجەکانی زانکۆی سلێمانی بە کەلوپەلەکانی پێویستی خوێندنەوە بگەنە قەڵادزە.
دانیشتوانی شارەکان هەر کەسێ بیەوێ خۆی لە دەستی رژێم رزگار بکات دەتوانێت روو بکاتە مەڵبەندەکانی هەڵەبجە، قەڵادزە، گەڵاڵە، حاجی ئۆمەران، وەرتێ، ناوچەی بارزان، شۆڕش دەسەڵاتی دابینکردنی شوێنی حەوانەی بۆ هەموان هەیە. بڕوانە: (ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٧)
٤٩٧- ژێراوە چاپیارەو تەوانی تر: گەلێکی، ل٣١٨
٤٩٨- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١١٥" دیداری قادر عەزیز لە رۆژی ٢٠٠٦/٩/٧، لە سلێمانی.

حکومەت ئەوە بووە باری سەرشانی شۆڕش قورس بێت، ئامانجی ئێرانیش ئەوە بووە پەناهەندەکان وەکو کارت بەرانبەر سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بەکار بهێنێ.

پێنجەم: بە خوێندنەوەی ناوەڕۆکو مەرجە ئاشکراو نهێنییەکانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر گومان ناهێڵێتەوە لە سەر جدیەتی شای ئێران لە هاریکاری حکومەتی بەعس بۆ لە ناوبردنی شۆڕش. ئەو ئیمتیازاتەی لە شەتولعەرەب بە ئێران دراوە[499]، لەگەڵ هەموو ئەو بەڵێنانەی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دراوە لەلایەن عێراقەوە لەبەرانبەر نەك پشتکردن بەڵکو هاریکاری بۆ لە ناوبردنی شۆڕشی کورد، ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیە بە مانەوەی شۆڕشی کورد پوچەڵ دەبێتەوە، ئەمەش بەرئەنجامی ئەو خۆڕادەستکردنی شۆڕش بووە بە ستراتیژیەتی بەرژەوەندییەکانی ئێرانو ئەمریکا پێش ١٩٧٥/٣/٦. تازە لە دەرفەتێکی بە فێرۆدراو لەو ماوە کورتە قەرەبوو ناکرێتەوە.

ئەگەر لە سەر دوو خاڵ قسە دەکرێت کە سەرکردایەتی ئەوکات دەیتوانی بیکات ئەوانیش: یەکەمیان: سەرکردایەتی (پدك) خۆی هەڵنەوەشاندایەوە، لە شارەکانی کوردستانو دەرەوەی کوردستان درێژەی بە خەباتی سیاسیو حیزبی خۆی بدابایە، دووەمیان: رازی بوایە لە سەر مانەوەی کەمتر لە هەزار (پم) لە شاخەکان بۆ درێژەدان بە خەباتی پارتیزانیو راگرتنی ئەنگەری ورەی جەماوەری کوردستان بۆ دەرفەتێکی لەبارتر، ئەوەش زیاتر بە خەیاڵی ساڵانی دوای هەرەس دادەنرێ، چونکە ئەو

---

٤٩٩- عیسا پەژمان، گەورە بەرپرسی ساواك دوای گەڕانەوەی لە گەشتێکی بۆ ئەورووپا شای بینیوەو نیگەرانیو رقو توڕەیی کوردانی بە ئاکامی ڕێککەوتننامەی جەزائیر پێ راگەیاندووە، ئەویش وتویەتی: (دەیانویست لە بەر ئەوان سوودو بەرژەوەندی وڵاتم بفەوتێنم زۆر پێ، ئەمە چ فکرەیەکی ئەحمەقانەیە). بڕوانە: (عیسی پەژمان: نهێنی یەکانی بەستنی، ل٩٧)

هەنگارانە لەگەڵ سروشتی سەرکردایەتیو زۆربەی فەرماندە سەربازیەکانی ئەوکات نایاتەوە[500]

شەشەم: ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە ئایا ئەگەر بە ڕێگەی سازش بۆ ڕژێمی حکومەتی عێراق پشتیوانی ئێرانی مسۆگەر نەکردایە بە ڕاستی دەڕوخا؟ هەموو ئەو پێشینانەی عێراقی ناچار کرد بۆ ئەو سازشە گەورەیە ئەوە بەدیاردەخەن، ئەگەر حکومەتی عێراق لەو پەڕی مەترسیدا نەبوایە لە سەر ئایندەی دەسەڵاتی خۆی ئەو سازشەی نەدەکرد، کە کردیشی بە جۆرێ ڕێککەوتنەکەی مۆرکرد شۆڕشی کوردی لە کۆڵ بێتەوە، سەدام حوسێن لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە وتارێکی بەو بۆنەیەوە بە ڕوونی ئەو لاوازیو گەیشتنە بنبەستەی سوپایەکەی باس کردووە[501]

---

٥٠٠-گوایە جەلال تاڵەبانی لە بەیروتەوە نامەی بۆ بارزانی ناردووە، کە ئەگەر درێژە بە شۆڕش بدات سوریاو لیبیاو سۆڤیەت یارمەتی شۆڕش دەکەن. بڕوانە: (الخرصان: التيارات السياسية في كردستان العراق، ص٣١٥-٣١٦) شێوازی ئەو یارمەتیە ڕوون نیە بەڵام دەگوترێت ئەو سێ وڵاتە بەرژەوەندیان لەگەڵ درێژەپێدانی شۆڕش بوویێت.

٥٠١- بۆ زانیاری بڕوانە: (گرێنتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٢٤١-٢٤٢" دەقی وتارەکەی سەدام حوسێن لە بەڵگەنامەی ژمارە (١٤))

## باسی چوارەم:

## چارەنوسی هێزی (پ‌م)و پەناهەندەو کەرەستەکانی دیکە دوای بڕیاری هەرەس

لە پێش ٦ رۆژ لە بڕیاری سەرکردایەتی بۆ هەرەس لە ١٤ی ئازار بروسکەی حکومەتی عێراقی گەیشتبوە هەموو یەکەکانی سوپا بۆ ئاگربەست لەگەڵ (پ‌م)، هەتا سود لە دەرفەتی لێبوردن وەربگرن‌و بگەڕێنەوە[٥٠٢].

سەرکردایەتی شۆڕش‌و کادیرەکانی (پ‌د‌ك)، دامەزراوەکانی حیزبی‌و جەماوەری کوردستان بە گشتی، ئەو (پ‌م)انەی لە سەنگەری بەرگری شەڕیان دەکرد، ئەو دیپلۆماسیکارانەی پشتگیریان بۆ شۆڕش مسۆگەر دەکرد، ئەو سەدان هەزار ئاوارەی بە فەرمانی سەرکردایەتی یان لە ترسی گیانی خۆیان لە شوێنی خۆیان ئاوارە بوون، لە کەرەستەکانی بەردەست لە چەك تەقەمەنی هەتا دەگاتە هۆیەکانی راگەیاندن‌و کەرەستەی بارەگاکان‌و پارەی دارایی شۆڕش‌و کەرەستەی فرۆشتگاکان فەوتا، بەو مانایەی کەوتنەوە بندەستی حکومەت یان فەوتان یان دزران.

---

٥٠٢- جمال الغيطاني: حراس البوابة الشرقية، بيروت، د س، ص١١٩

جۆری ئەو هاریکاریەی لە دەرەوە دەستی دەکەوت یان لەو پاڵپشتە مەعنەریەی لێی دەکرا، ئەو کارناسانیەی دەستی کەوتبوو، بەشێکی تری سەرمایەی بنەڕەتی شۆڕش بووە، لەگەڵ ئەو کەرەستەو ڕەگەزو توانا خۆماڵیەی شۆڕش بەرهەمی هێنا بوون لە دەستچوون.

سەرکردایەتی (پ.د.ك)و شۆڕش هەریەك سەرکردایەتی بووە، کە بەرئەنجامی کۆنگرەی هەشت بووە، بەشداران گومانیان لە سەر لاوازی ستافی ئەوکاتەی سەرکردایەتی دروست هەبووە[503]، بێجگە لە مستەفا بارزانی وەکو سەرۆکی (پ.د.ك)، (٢٢) ئەندام[504] سەرکردایەتیو لە ناویاندا (٨)ی (م.س.)بووە[505]، بەر لە دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ئازاری ساڵی ١٩٧٤ز ئەندامێکی (م.س)ی بە ناوی (عەزیز عەقراوی) لەگەڵ هاشم عەقراویو عەبدولوەهاب ئەترۆشی ئەندامانی سەرکردایەتی چوونە پاڵ حکومەتی عێراق، هەر بە هەمان ناوی (پ.د.ك) حیزبێکیان بۆ دروست کرد[506]، هەروەها چوونە ناو ئەو بەرەیەی پێشتر (حشع)و حیزبی بەعس دروستیان

---

٥٠٣- جرجیس فتح الله، زیارة للماضي القریب، ص٥٢* علي سنجاري: الحركة التحررية، ص٦٣

٥٠٤- ئەندامانی سەرکردایەتی بریتی بوون لە: ئیدریس بارزانی، مەسعود بارزانی، مەحمود عوسمان، نوری شاویس، حەبیب محمد کریم: علی عەبدوڵڵا، عەزیز عەقراوی، دارا تۆفیق، یەدوڵڵا کەریم، علی سنجاری، اسماعیل مەلا عەزیز، فاخیر میرگەسووری، فارس باوە، رەشید سندی، شکیب عقراوی، عبدالوهاب الاتروشی، عبدول سۆزان، صدیق ئەفندی، زکیە اسماعیل. بڕوانە: (یوسفي: ثورة ایلول، ص٦١-٦٢)

٥٠٥- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (حبیب محمد کریم: صفحات من نضال الشعب الكردي...، ص١١١-١١٧* ص٥٩-٦٣* الخرصان: التیارات السیاسیة في كردستان العراق، ص١٨٦-١٨٩* یوسفي: ثورة ایول)

٥٠٦- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٣٦٦

کردبوو[٥٠٧]. ئەندامێکی تری سەرکردایەتیش بە ناوی فاخیر مێرگەسووری بە تاوانی پەیوەندی کردن بە حکومەتی عێراقەوە سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری کوشتنی دا، ئەوانی دیکە هەموویان لە مەیدانی سەرکردایەتیکردندا مابوونەوە.

دوا کۆبوونەوەی (م.س)و سەرکردایەتی بۆ بڕیاردان بووە لە هەروەها، دوای ئەوە هەندێکیان خۆیان رادەستی حکومەت کردەوە[٥٠٩]، عەلی سنجاری ئەندامی ئەوکاتەی سەرکردایەتی دەنووسێت: (( ١٣ ئەندامی (م.س)و سەرکردایەتی دەرچووی کۆنگرەی هەشت پەیوەندیان بە حکومەتی عێراقەوە کرد[٥١٠])).

---

٥٠٧- لەگەڵ دەستپێکردنەوەی شەڕ هەریەك لە "عەزیز عەقراوی‌و هاشم عەقراوی" بە هاوکاری حیزبی بەعس کەوتنە چالاکی لە ژێر ناوی "پ.د.ك". بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الخراصان: التيارات السياسية في كردستان العراق، ص٢١٢" رۆژنامەی (التآخي)، ژمارە (١٥٨٣) ی ١٢ ئازاری ١٩٧٤، ژمارە (١٥٨٩) ی ١ی نیسانی ١٩٧٤)

٥٠٨-فاخیر مێرگەسووری ئەندامی سەرکردایەتی لەگەڵ باوك‌و براکانی پێش هەرەسی شۆڕش دەست بەسەر کران‌و دواتر بێ دادگایی کردنی ئاشکراو راگەیاندنی تاوانبارییەتیان کوژران، مسعود بارزانی بەپەیوەندی نهێنی بەحکومەتی عێراقەوە تاوانباری دەکات، لەبەرانبەردا خوێندنەوەی دیکە بۆ ئەو رووداوە دەکرێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٢٩١-٢٩٢" و: زوارر ئیبراهیم، چەند بەشێك لە تراژیدیای تاوانێکی لە بیر کراو، بەش١٩٩٧" شەپۆل فاخیر مێرگەسووری: زمانی تاوان هاتە قسە، سلێمانی ١٩٩٧، ل٥٢-١١٥)

٥٠٩- ئەوانەی خۆیاندا بەدەست حکومەتی عێراقەوە: (فارس باوا، عەبدول وەهاب ئەتروشی، سدیق ئەمین: عەبدول سۆران، عەلی هەژار، دارا توفیق، حەبیب محمد کریم، ساڵح یوسفی). بڕوانە: (الخرصان: التيارات السياسية، ص٢٣٦" ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان‌و، ل٣٩٩)

٥١٠-علي سنجاري، الحركة التحررية الكردية، ص٦٣.

حکومەتی عێراقی لە ١٣ی ئازار بۆ ١ی نیسانی ئەو ساڵە شەڕی ڕاگرت[٥١١]، فەرمانی ئاگربەستی حکومەتی لە ١٤ی ئازار بروسکە گەیشتە هەموو یەکەکانی سوپا. لێبووردنێکی گشتی ڕاگەیەنرا بۆ هەموو ئەوانەی بەشداری شۆڕشیان کردبوو بە مەدەنی و سەربازیەوە[٥١٢]، سەدام حوسێن لە نیسانی ئەو ساڵە سەردانی تارانی کرد، لە نامانجە دیارەکانی بەشداریکردن بووە لە شاڵاوی پڕوپاگەندە لە ناو ئاوارەکان هەتا بگەڕێنەوە بۆ عێراق، نامەیەکی بە شێوەی پەیام لەو بارەیەوە بڵاوکردەوە[٥١٣]، لەوێدا مافی گەڕانەوەی بۆ سەر کارو وەزیفە بە هەموواندا و بەر لێبووردنی گشتی خستن، لێبووردنەکە تەنیا چوار کەسی نەدەگرتەوە، ئەوانیش مستەفا بارزانی و کوڕەکانی (ئیدریس بارزانی و مەسعود بارزانی) و شێخ موحەممەد خالدی برازای[٥١٤].

مستەفا بارزانی پێنج ڕۆژ دوای بڕیاری کۆتاییهێنان بە شۆڕش بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی حاجی ئۆمەرانەوە سنووری لە ٢٥ی ئازار خاکی کوردستانی عێراقی بەجێهێشت[٥١٥]. لە دوای گەیشتنی بۆ شاری (نەغەدە) لە ئێران لە کۆبوونەوەی فراواندا قسەی بۆ ئاوارەکان کرد لە سەر بێ ئومێدنەبوون و لە سەر ئەوەی بە سەر میللەتی کورددا هاتووە[٥١٦]. دواتر حکومەتی ئێران خۆیی و هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵەکەی و سەد کەس لە نزیکەکانی لە گەڕەکێکی شاری کەرەجی نزیک تاران

---

٥١١- مەکدواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٠٥

٥١٢- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٨)، کە نامەکە بەرواری ٣/٤/١٩٧٥ی بە سەرەوەیە.

٥١٣- بەڵگەنامەی ژمارە (٨)

٥١٤- نامەی ئاوبراو لە بەڵگەنامەی ژمارە (٨).

٥١٥- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص٣٩٧° کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٢٧، دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٣٠٣-٣٠٤° ئوناد کەریم: لەیادی ٢٤ هەمین، ل٢٥

٥١٦- البارزاني: البارزاني و الحركة، ص٣٩٩

نیشتەجێ کردن[٥١٧]، دەکرێ لە دوای هەرەس و پەرتەوازەبوونی هەموو بەشدارانی شۆڕش و جەماوەرە بنکە فراوانەکەی، ئەوانە بە زۆرترین ئەندام و بەرپرسی لێکهەڵوەشاوە دابنێین، کە لە دەوری مستەفا بارزانی کۆبوونەتەوە، پاشان دوو لێکدانەوە بۆ ئەو هەنگاوەی شای ئێران بکەین. یەکەمیان ڕێستویەتی هیچ نەبێت دڵی مستەفا بارزانی بەو هەنگاوە رابگرێ، دووەمیان، لە ئایندە نەهێڵێت بزاڤی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی عێراق بە بێ ڕوخسەتی ئەو زیندوو بێتەوە.

لە ماوەی لێبوردنی گشتی زیاتر لە (٥٠) هەزار (پ م)ی رەسمی و ( ٤٠٠ ) هێزی بەرگری کە لە جەماوەری خاوەن چەکی کوردستان پێك هاتبوو چەکیان دانا، رووبەری (٤٠٠٠٠)کم ناوچەی ئازادکراو بە دەست هێزی (پ م)ی کوردستانەوە بووە، لە سەرەتاوە بروسکەی سەرکردایەتی دوو خاڵی لە بەردەم هێزی (پ م) دانابوون، کە دەبوو یەکێکیان هەڵبژێرن، یەکەمیان، تەسلیم بە عێراق بینەوە یان بکشێنەوە بۆ ئێران، کە سەرکردایەتی دووەمیانی پێ چاکتر بووە[٥١٨]، بەلام پێ ناچێت ئەو پێ چاکبوونەی بەرەو ئێران بڕیاری کۆدەنگی سەرکردایەتی لە سەر بووبێت[٥١٩]، چونکە ساڵح یوسفی ئەندامی (م س)ی (پ د ك) هەر لە دوای بڕیاری ٣/١٩ خۆی رادەستی

---

٥١٧- ئەنوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٦

٥١٨- الخرصان: التیارات السیاسیة، ص٢٣٢-٢٣٣

٥١٩-- گەرچی ئەو گوزارشتە لەو بروسکەیەدا بەکار هاتووە، کە دەڵێ: (..بەلام بۆ کادیرە حیزبیەکان و بەرپرسانی عەسکەری را باشترە بکشێنەوە بۆ سەربازگەی پەنابەران لە ئێران..). بڕوانە: علی سنجاري: القضیة الکردیة و حزب البعث العربي ج١/ ص٧٧، بەلام ئەندامانی (م. س) و سەرکردایەتی (پ د ك) لە دوای ١٩ی ئازار جارێکی دیکە کۆنەبونەتەوە هەتا رێنومایی دابەزێنن، رێی تێناچێت لە دوا کۆبوونەوەی (م س) بڕیاری وا درابێت، خۆ کادیرە سەربازیەکانی شۆڕش لە ئەندامانی (م س) و سەرکردایەتی مەترسیدارتر نەبوون لە لای حکومەتی عێراقی.

حکومەتی عێراقی کردوە، حەبیب محمد کریم دەنووسێت: (بارزانی هەموومانی ئازادکرد لە نێوان مانەوە یان گەڕانەوە بۆ عێراق.)[٥٢٠]، چۆلکردنی سەنگەرو بارەگاکان لەلای (پ.م) تاڵترین ناکامی هەرەسی شۆڕش بووە، بە نرخترین سەرمایەی شۆڕش پێشمەرگەکانی بووە، پۆل پۆل تەسلیم بوونەوە، هەندێکیان ئاوارەی ئێران بوون، کۆچێرا ئەوکات لە نزیکەوە لەگەڵ ڕووداوەکانی هەرەس ژیاوە، ئەوها باسی کردووە: ((لە سەرانسەری دۆڵی چۆماندا، هەر هەموان رابەری خۆیان بە خیانەتکار دەزانی، لەم دوا ڕۆژانەی مانگی سێدا... ئەگەر ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی یان "م.س"ی حیزب یان یەکێك لە کوڕانی بارزانی زاتی بکردایە لە ڕێگەی حاجی ئۆمەران و چۆماندا بە دیار بکەوتایە، دەم و دەست دەکوژرا...))[٥٢١]، دەکرێ وەکو ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەوانی سەیر بکرێ و زیادڕۆیی تێدا بێ، بەڵام هەندێکی دەکرێ لە ڕاستییەوە نزیك بێ.

لێبووردنی گشتی هەتا ١ی نیسان بەردەوام بوو، هەردوو دەوڵەت لە هاندانی ئاوارەکان لە پروپاگەندەو فشار بۆ گەڕانەوە درێغیان نەکرد[٥٢٢]، بۆ ئەو مەبەستەش عێراق لیژنەیەکی پێکهێنابوو هەتا نەخشەی هاریەش دانێن بۆ گەڕانەوەی ئاوارەکان[٥٢٣]

---

٥٢٠- بڕوانە: (تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص١٦٠)

٥٢١- کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا، ل٢٤٧.

٥٢٢- سەدام حوسێن لە کۆتایی نیسانی ١٩٧٥ سەردانی تارانی کرد، بە ناوی خۆیەوە نامەی ئاراستەی ئاوارەکان کرد. بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٨).

٥٢٣-- لەو بارەیەوە لە سەر ئاستی بەرز حکومەتی عێراق وەفدی نارد بۆ ئێران هەتا قەناعەت بە ئاوارەکان بکات بگەڕێنەوە، کە پێك هاتبوون لە (نعيم حداد) ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕش بە یارمەتی

ئاوارەبوون لەو رۆژە یەك جۆر نەبووە، یەکەمیان ئەوانەن لە شوێنی خۆیان بە هۆی شەڕەوە ئاوارە بوون، بەڵام لە سنووری کوردستان نەچوونەتە دەرەوە، دووەمیان ئاوارەی ئێران بوون و دوای لێبوردنی گشتی گەڕاونەتەوە عێراق، سێیەمیان، ئاوارەی ئێران بووەو لەوێ ماوەتەوە، چوارەمیان، ئەوانەن لە ئێرانەوە چوون بۆ وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریکا. زۆرترینیان ئەوانەبوون دوای هەرەسهێنانەوەی باردۆخەکە بە بێئومێدی گەڕانەوە عێراق، ماوەی لێبوردن لە کۆتایی ئازاری ١٩٧٥ەوە درێژکرایەوە بۆ حوزەیرانی ئەو ساڵە[٥٢٤]، ئەمەش بۆ دەرفەت رەخساندنی زیاتر، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٦ دوای لێبوردنی گشتی ژمارەیەك لە ئاوارە گەڕانەوە، چونکە بە نهێنی لێبوردن دوای ساڵێکیش مابوو.

ئاوارەبوون ئاکامێکی دیکەی ناخۆشی هەرەسی شۆڕش بوو، بەشێکی دیکەی کارەساتی مرۆیی لەو ئاوارەییە بە سەر کورددا هات، لە رووی دەروونی و تەندروستی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەوە ئاکامێکی خراپی لێکەوتەوە، ئەوانەی ئاوارەی سنوور ببوون لە ئێران لە بن خێوەتگا دەژیان یان لە سەر سنوورەکان بوون، بەرئەنجامە جیاجیاکانی ئەو کارەساتە هەتا ئێستاش میللەتی کورد لێی دەربازنەبووە، ئەوەی زیاتر جێی نیگەرانییە ئەو بێدەنگییەی رای گشتی دونیابووە، لە پێشەوەیان ویلایەتە

---

(خالید عبدالله عثمان) سکرتێری لیژنەی باڵای کاروباری باکوور نەقیب (وفیق السامرائی) نوێنەری بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سەربازی. بڕوانە: (الحرصان: التيارات السياسية في كردستان العراق..، ص٢٣٥)

٥٢٤- بە هۆی زۆری ئاوارەو (پەم)، بە بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ماوەی لێبوردن بۆ دووەم جار درێژکرایەوە، کە هاتووە: ایاسای لێبوردن بۆ کوردەکان بە پێشمەرگەو مەدەنییەوە ئەوانەی یاسای لێبوردن دەیانگرتەوە لە ١/٥/١٩٧٥ لە چوارچێوەی ئەو ماوەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ دیاری کردووە بە ژمارە (٤٦٥) درێژکرایەوە بۆ ٢/٦/١٩٧٥ز). الوقائع العراقية عدد (٢٤٧٤) ٣/٦/١٩٧٥ز.

یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە ئاگاداری تەواوی باروودۆخی خراپی ئاوارەکان بووە، بەلام بێدەنگی هەڵبژاردووە. ڕاپۆرتەکەی (پایک) ئەو ئاکامە بە روونی بە دیار دەخا، کە بەشێکی تاوانەکەی دەکەوێتە ئەستۆی ئەمریکا، وەکو دەنووسێت: ((... وادیار بوو ویلایەتە یەکگرتووەکانیش هەمان سیاسەتی هاوپەیمانەکەمانی پیادە کرد، لە یەکلاییکردنەوە لەگەڵ حکومەت، دەرفەتی نەدان بەلای کەمەوە کەمە خودموختارییەك بدرێ و چی دیکە خوێن نەڕژێ، بەلام هاوکارانمان ئەو ڕێگەیان هەڵبژارد، کە شەڕ وەستا، هەزاران کەس پێکراو "٢٠٠" هەزار پەناهەندەی لێکەوتەوە))[٥٢٥]، گەرچی ژمارەی ئاوارە زۆر لەوە زیاتر بووە، لە شوێنی دیکەی ڕاپۆرتەکە هاتووە: ((... بەلام لەوە گاڵتەجاڕتر ویلایەتە یەکگرتووەکان و دەوڵەتی هاوپەیمان هیچ هەڵوەستەیان نەکرد، سەرەڕای ئەو بانگەوازە ڕاستەوخۆیانەی سەرۆکی پاخیبووان و ڕێکگەی (C.I.A) لە ناوچەکە بۆ سەرۆك نیکسۆن و کیسنجەر، بەلام ویلایەتە یەکگرتووەکان هەموو هاریکاریەکی مرۆییان بۆ هەزاران پەناهەندە ڕەتکردەوە، کە بە هۆی پچڕانی پاڵپشتی لە ناکاوی سەربازییەوە ئاوارە بوون))[٥٢٦].

لە ڕاپۆرتی قونسوڵگەری ئەمریکا لە خوڕەمشەهر، کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ناردووە، ئەوەی تێدا ڕوونکراوەتەوە، کە کوردەکان دەترسن ئێران فشاریان بخاتە سەر لە گەڕانەوە بۆ عێراق، لە وەلامی ئەو ڕاپۆرتەدا هاتووە، کە ئەمریکا دەست لە کاروباری ناوخۆی ئێران وەرنادات[٥٢٧]، وا بەدەردەکەوێ

---

٥٢٥- بڕوانە: بەلگەنامەی ژمارە (٦)

٥٢٦-هەمان سەرچاوە.

٥٢٧- دانشجوان پیرو امام، اسناد لانە جاسوسی – ژ (٦)، کوردستان (٢). شمارە (٣٢)، شمارە (٣١)، کردستان (١)، ص٩٨- ٩٩، ژ(٥)، کوردستان (٢). شمارە (٣٢)، ص٩٩

بە تەنگەوە نەهاتنی ئەمریکا لە سەر ئەو گرفتانەی تووشی ئاوارە کوردەکان بووە بەشێکی بە هۆی قەناعەتی ئێرانەوە بووبێت، چونکە دواتر سەرۆکی )CIA( لێی قەدەغەکرا چی دیکە پەیوەندی بە بارەگای سەرکردایەتی کوردەوە بکات[528]، لە راستیدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەگەر بۆ کەمکردنەوەی مەینەتیەکانی کورد بە هەر جۆرێک بە تەنیاو دوور لە رەهەندەکانی دیکەی رێککەوتننامەی جەزائیر بە تەنگ ئاوارەکانی کوردەوە بهاتبایە، ئەوە لەگەڵ ئامانجی ئەو رێککەوتننامەیە تێکدەگیا، ئەوەی لەبەرانبەر ئاوارەکانی عێراق‌و ئێران ئەنجامیانەدا بەشێک بووە لە بەرجەستەکردنی ئەو رێککەوتننامەیە، ئەوکات لە بەرژەوەندی ئەمریکادا نەبووە ئەو هاوسەنگیە تازەیە، کە خۆی دەستی تێیدا هەبووە تێك بدات.

پێدەنگی ولاتانی ئەوکاتەی ئاکۆك لەگەڵ ئەمریکا وەکو یەکیەتی سۆڤیەت‌و ولاتانی سوشیالیزمی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە، کە قەناعەتیان وابووە شۆرشی کوردستان چارەنووسی خۆی بە ئەمریکاو شای ئێران بەستۆتەوە، بەمەش باجی هەڵوێستی خۆیداوە، ئەوان لە بەرەی شەری دژی شۆرشی کوردستان هاریکاری حکومەتی عێراق بوون، دەرچوونی عێراق لە شەر بەو جۆرەی رووبدا رای ئەوانیشی لە سەر بووە[529]، بەلام وەکو باس کرا سەدام لەو رێککەوتنە پرس‌و راوێژی بە سۆڤیەت نەکردبوو[530]، ئەوەی لێی دەخوێندرێتەوە لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبووە دژی ئەو رێککەوتننامەیە بوەستنەوە.

---

٥٢٨- گۆنتەر دیشنەر: کورد گەلێکی، ل٣٤٢

٥٢٩- بروانە: بەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیە.

٥٣٠- ایوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية و صراع اللقوى، ص٣٤٤

دوای هەرەس بە هۆی لێبووردنی گشتیەوە زۆرترینی ئاوارە ئەوانە بوون گەڕانەوە عێراق، ناونووسکراو ناونیشانیان لێوەرگیرا بۆ دەرفەتێکی دیکە لەو شوێنەی لێی دادەنیشتن دوای داواکرانەوەو دوورخرانەوە بۆ ناوەڕاستو باشووری عێراق، لەوێ بە سەر شارو شارۆچکەو گوندەکان بە پێی ئارەزووی حکومەت دابەشکران[531]. هەموو ئەوانەی گەڕانەوە ڕەوانەی خواروو ناوەڕاستی عێراق نەکران، بەڵام لە زیانەکانی ئاوارەیی بێ بەش نەبوون، ئەو ساڵە لە کارو کاسبی دابڕانو لە دڵەراوکەدا دەژیان، بە هۆی پڕوپاگەندەی حکومەت، کە دڵنیانەبوون لەوەی تاکام حکومەت چیان لێ بە سەردێنێت.

سەرژمێری تەواو لە بەردەستدا نییە لە سەر ژمارەی ئاوارە بووەکان، ئامارەکان لێك جیاوازن، ڕانداڵ بە (١٢٠٠٠٠بۆ ٣٠٠٠٠٠ ) دەزانێت[532]، الحرصان کەمی دەکاتەوە بۆ (٩٥٠٠٠)، کە دوای هەوڵو کۆششی دەسەڵاتدارانی عێراقو ئێرانی(٦٠٠٠٠) گەڕانەوە بۆ عێراق(١٠٧٠٠٠) لە ئێران مانەوە[533]، بارزانی لەو نامەیەی لە بەرواری ٩ی شوباتی ١٩٧٧ بۆ (جیمی کارتەر)ی ناردووە، ژمارەی ئاوارەی کورد بۆ ئێران، تەنیا ژنو منداڵو پیرو پەککەوتەی بە (٢٥٠٠٠٠) داناوە[534]، کەچی مەکدواڵ ژمارەی ئاوارەی ناو ئێران بە ٢١٠٠٠٠کەس دیاری دەکات، کە لە ناویاندا (٤٠٠٠٠) گەڕاوەنەتەوە بۆ عێراق[535]. بە پێی تەخمینی ئەوانەی لەو بابەتە دواون ڕای

---

٥٣١- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا، ل٤٥١" ماریون ویتر سلوجت، العراق الحديث من الثورة، ص٢٦٤)

٥٣٢- کوردستان یان، ل٢٤٨

٥٣٣- التيارات السياسيه، ص٢٣٥

٥٣٤- بەڵگەنامەی ژمارە (١١)

٥٣٥- مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٥٩

جیاواز زۆرە، لە راپۆرتی پایکدا هاتووە: ((..زیاتر لە (٢٠٠) هەزار کەس هەڵاتن بۆ ناو خاکی هاوپەیمانەکەمان، بەلام نە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو نە هاوپەیمانەکەمان هاریکاری پێویستی مرۆیی پێشکەشی ئەوانە نەکرد، بگرە هاوپەیمانەکەمان بڕیاریدا زیاتر لە (٤٠) هەزار لەوانە بە زۆر رەوانەی عێراق کرانەوە..))[٥٣٦]، بەلام پێدەچێ ئەوانەی لە ئێران ماونەتەوە لەو ژمارەیە زیاتر بووبن، پێدەچێ (مەکدواڵ)یش ئاماری راپۆرتی (پایک)ی دووبارە کردبێتەوە، لەو بارەیەوە رۆژنامەکانی ئەوکاتەی عێراق بە راشکاوی ریپۆرتاژیان لە سەر گەڕانەوەی ئاوارەکان بڵاوەکردەوە[٥٣٧]، بەرپرسانی عێراقی لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئەو ژمارەیە کەم بکەنەوە، کە بۆ باشووری عێراق دووریان خستۆتەوە، (میدل ئیست ووچ) لە سەر زاری لێپرسراوێکی عێراقیەوە دەگێڕێتەوە کە (٥٠٠٠٠) کوردیان دوای رێککەوتننامەی جەزائیر بۆ خوارووی عێراق راگواستووە[٥٣٨].

بە پێی راپۆرتی هەواڵگری عێراقی ئەو شەپۆلە ئاوارە کوردانەی عێراق هەتا ساڵی ١٩٧٩ روویان لە وڵاتانی ئەورووپی و ئەمریکی کردووە گەیشتۆتە (٣٥٠٠٠) کەس[٥٣٩]، بە راستیش دوای نسکۆ شەپۆلی پەنابەری سیاسی بۆ ئەورووپاو ئەمریکا دەستی پێکرد[٥٤٠]، بەلام ئەو ژمارەیەش زۆرە، کە چوونەتە هەندەران، ئەو ئامارانەش کە لە سەرەوە ئاماژەی پێدرا کۆمەڵێک تێبینی هەڵدەگرن لەوانە:

---

٥٣٦- بەڵگەنامەی ژمارە (٦).

٥٣٧- بڕوانە: هەڵتەنامەی هارکاری، ژمارە (٢٦١) ٤/٤/١٩٧٥.

٥٣٨- جینۆساید لە عێراق و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و: سامەندی موفتی زادە، چاپخانەی خاك، چ١، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٠١

٥٣٩- الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٢٣٦

٥٤٠- نەوشیروان مستەفا ئەمین: لە کەناری دانوبەوە، ل٥٧

یەکەم: ژمارەی ئەوانەی لە شوێنی خۆیان هەڵکەنراون زۆر لەوە زیاترە، چونکە لە ماوەی شەڕی یەك ساڵە سەرکردایەتی هەموو هەوڵێکی راگەیاندنو رێکخراوەیی خۆی تەرخان کردبوو بۆ ئەوەی خەڵك شارەکانی ژێردەسەڵاتی حکومەت بەجێبهێڵنو روو بکەنە ناوچە ئازاد کراوەکان، کادیرەکانی شۆڕش بۆ ئەو مەبەستە لە هاندانی خەڵك درێغیان نەکردووە، حکومەتیش بە بەردەوامی ئەو شارو شارۆچکانەو ئاوەدانیانەی کەوتبوونە ژێردەسەڵاتی (پ.م) بە فرۆکە بۆردومانی دەکرد. قوتابخانەکانو فەرمانگە حکومەیەکان هەموو داخران، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ژمارەی ئەو ئاوارانەی لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی لە رۆژانی دوای نسکۆ ئاودیوی ئێران بوون، بە پێی ئامارەکان ژمارەی ئەو کوردانەی گەڕانەوە بۆ عێراق لەگەڵ ئەوانەی نەگەڕانەوە یان ئاوارەی وڵاتانی ئەورووپی بوون زۆر زیاتر دەبن.

بێجگە لە پێشمەرگەکان هەتا ئازاری ١٩٧٥ کۆدەنگییەك هەیە لە سەر نیو ملیۆن ئاوارەبوو[541]، بەلای هەندێك ئەو ژمارەیەش کەمتر بێت[542]، شای ئێران بە تەواوی پێی خۆش بوو زۆرترین خەڵکی کوردستان ئاوارەی ناو خاکی ئەو بن هەتا وەکو بارمتە بۆ سەپاندنی زۆرترین مەرج بە سەر شۆڕشو بارزانیدا بیانهێڵێتەوە[543]، ئەو نیو ملیۆنە زیاتر روخساری گوتاری سیاسی وەرگرتووە، بەڵام ئەگەر وەکو تەخمین وەری بگرین دوور

---

541- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٩" خۆشناو: مەسەلەی کوردو، ل٢٧٩" گونتەر دێشنەر: کورد گەلێکی، ل٣٢٨" مراد حەکیم موحەممەد: سیاسەتی راگواستنی کورد لە کوردستانی عێراق، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، ژ٤٥، ساڵی ١٢، شوباتی ٢٠٠٥. ل٢١

542-بڕوانە: ئورد ئالستوم، لیس لنا من الاصدقاء غیر الجبال، ص٣٠" الحرصان: التیارات السیاسیة، ل٢٣٥

543- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٧٩.

نییە نزیك بەو ژمارەیە بێت، لە لایەکی دیکەوە حکومەتی عێراقی ڕێگری نەنواندووە لە بەجێهێشتنی کورد لە ماڵو شوێنی خۆی. لەگەڵ ئەو هەموو ساختەکاریەی حکومەت بۆ کەمکردنەوە ژمارەی کورد لە عێراق بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ گەیشتبووە ( ١٨٩١٨٨٧) کەس، کە دەیکردە ١٥./ی دانیشتوونی عێراق، بێجگە لە کوردی فەیلی کە بە جیا نووسراوە[٥٤٤]، هەروەها نانووسکردنی زۆربەی یەزیدیو شەبەكو کاکەییو دەیان هۆزی دیکەی کورد بە عەرەب، بە پێی هەندێ تەخمینی بەدەر لەو سەرژمێریە ژمارەی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ گەیشتۆتە دوو ملیۆن بۆ دوو ملیۆنو نیو کەس[٥٤٥]، بەو پێیە دەبێت ژمارەی ئاوارە بوو لە سەر شوێنی خۆی لە ماوەی شەڕی یەك ساڵە لە نیو ملیۆن زیاتر بووبێت، لە ژمارەیە نزیکەی یەك لە سەر سێی ئاوارە بووە، مەرجیش نییە هەموو ئاوارەکان ئاودیوی سنووری ئێران بووبن، هەروەها کۆچکردن بۆ ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش وەکو هەڵوێستی نەتەوەییو نیشتیمانی سەیرکراوە.

دووەم: بە هۆی باری ناسکی کوردستانو گەورەیی کارەساتەکە، کەمتر نووسەرانو سیاسیانی نزیك بە ڕووداوەکەکان قسەیان لە سەر ئاماری پەناهەندەو ئاوارەکان کردووە، زیاتر ئەو ژمارانەی هەن هی ڕۆژنامەنووسو چاودێرە ئەورووپاییەکانن، کە ئەوکات بە هۆی کاری ڕۆژنامەنووسی سەردانی کوردستانو ئێرانیان کردبوو، هی ئەوانیش زیاتر ڕوخساری ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەوانی یان وتاری سیاسی پێوەدیارە، ئەوەی زیاتر سەرژمێری دروستی لە لادەست دەکەوێت حکومەتی بەعسو ڕژێمی شای ئێرانە،

---

٥٤٤-نەیسەڵ دەباغ: کوردو کەمە نەتەوایەتیەکان لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧، هەولێر، ١٩٩٩ ب٢/ ل٧٩-٨١

٥٤٥- مارتین ڤان برونسن: ئاغاو شێخو دەوڵەت، ل٣٧

ئەوانیش نەیانویستووە ژمارەی دروست لەو بارەیەوە بدەن، یان هەندێك لـە ئاوارەكـان ناویان لە هیچ جێگایەك تۆمار نەكراوە. ئەو ژمارەیە زۆر لەوە زیاتر بووە، كە رەوانـەی باشووری عێـراق كـراون، یـان ئـەو گونـدو ئاوەدانیانـەی راسـتەوخۆ دوای هـەرەس وێرانكرانو خەڵكەكەیان راگواستن[٥٤٦].

ئەوانەی گەڕانەوە بۆ عێـراق لـە خـواروو ناوەڕاسـتی عێـراق یـان لـە كوردسـتان چاودێری توندی دامو دەزگاكانی ئەمنو موخابەراتیان خرابووە سەر، لە كـاتی گومـان لێكردن بانگ دەكرانو لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەكـرا، لـە واقیعێكـی كۆمەڵایـەتیو سیاسیو ئابووری سەختدا دەژیان، لەگەڵ ئاوو هەوایەك كـە لەگەڵیـدا رانـەهاتبوون، منداڵەكانیان لە خوێندن بێ بەش بوون یان ناچار بـوون بچـنە قوتابخانـەی عـەرەبیو گرفتی زمانو جیاوازی كەلتووریان بۆ دروست بووبوو.

سـاڵێك پێش هەرەس بە هۆی شەڕەوە جوتیارو كاسبكاری كورد لـە سـەر كێڵگـەو باخو بێستانی خۆی دابڕابوو، سەرەڕای سەختی ژیان دوای هەرەس حكومـەت بـە پێـی یاسای بە سەربازگرتن بەشێك لە لاوەكانی بانگكردنە سەربازی.

ئەوانەش لە ئێران مانەوە بە بارێكی سەختدا ژیانیـان بە سەر دەبرد، بەشی زۆریـان لە ناوچە سنووریەكانو كوردستانی رۆژهەڵات دوورخرانـەوە، هـەتا راپـەڕینی گـەلانی ئێران دژی رژێمی شا بە فریا كەوت نەیهێشت ئەو سەغڵەتیە درێژە بكێشـێت[٥٤٧]، بـە پێی رێككەوتننامەی جەزائیر هەموو كاروچالاكیەكی سیاسی لـە ئاوارەكـان قەدەغـە كرابوو، لە كاتێكدا ئەوانە لە بەر نـەبوونی ئـازادیو لـە سـایەی زوڵمـی حكومـەتی بـەعس وڵاتـی خۆیـان بەجێهێشـتبوو. هـەتا ئێـران دەرفـەتی نـەدەدا رێكخـراوە

---

٥٤٦- بڕوانە: باسی سێیەمی ئەم بەشە.

٥٤٧- یوسفی: ثورة ایلول، ص٢٢٥-٢٢١

نێودەوڵەتییەکانی وەکو خاچی سووری نێودەوڵەتی سەرژمێریان بکاتو یاسای پەنابەریەتی بیانگرێتەوە، نەیدەویست ڕێکخراوی UN ناونووسیان بکاتو وەکو پەناهەندە بە ڕەسمی بیناسی[٥٤٨]، لە ناوەوەی ئێران لە ئۆردوگا نیشتەجێی کردنو مافی پەنابەریش پێنەدان[٥٤٩]، وەکو بەدەردەکەوێ مەبەستی ئەوە بووە هەر کاتێك ویستی سەردای لەگەڵ عێراق پێ بکات سەرنەکێشێ بۆ ئاساندنی کێشەی کورد لە ئاستی نێودەوڵەتی، هەروەها بۆ ئەوەی بووە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان ئەوانو بزاڤی سیاسیو چەکداری چاوەڕوانکراوی کوردستانی عێراقدا نەمێنێتەوە.

بەشێکی دیکەی ئاوارەی کورد بە تایبەت لە بەرپرسو کادیرە سیاسییەکان چوون بۆ وڵاتانی ئەوروپیو ئەمریکا، لێرەوە یەکەم شەپۆلی پەناهەندەی کوردی بووە بەو ژمارە زۆرییە روو لە هەندەران بکەن[٥٥٠]، بەڵام دووبارە سەرژمێری تەولو لەو بارەیەوە نییە.

جۆرێکی تر لە ئاوارە بوون، کە کەمتر باسیان لێوەکراوە، لە ڕێگەی چۆلکردنی ئەو ناوچانەی شەڕی تێدا بووە یان گوندنشینانی نزیك بە جادە گشتییەکان، کە سوپای عێراقی دەستی بە سەر ڕادەگەیشتو ببووە شەڕگە، بۆ ناوچەیەکی ئارامتر گواستبوویانەوە، ئەوانەش بە هۆی دووركەتنەوەیان لە وەرزی زستان لە شوێنی حەوانەوەی خۆیان زیانیان لێکەوتووە.

---

٥٤٨- خۆشناو: مەسەلەی کورد، ل٢٧٩،

٥٤٩- مراد حەکیم مرحەمەد: سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لە، ل٢١

٥٥٠-ئەنوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٥٧

لەگەڵ ئەوەدا بەشێکی زۆری پەناهەندەکان ناچار بە گەڕانەوە بوون بۆ ژێردەسەڵاتی رژێم، بەڵام ئەو بەڵێنانە جێبەجێ نەکران، کە پێیان درابوو[551]، تەنانەت هیچی لە رق و کینەی حکومەت نەگۆڕی بەرانبەر ئەوانەی پشتگیری شۆڕشیان کردبوو. راستە ئاوارە گەڕاوەکان و هەموو کورد بە گشتی لە ژێرکاریگەری دەروونی هەرەسی شۆڕش و نیگەرانی دابوون بەرانبەر سەرکردەکانی شۆڕش، بەڵام حکومەت هەتا بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتی خۆشی بێت لە دوای کارەساتی هەرەس دڵنەوایی کوردانی نەکرد، بەشێکی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە کاربەدەستانی عێراقی لە ژێرکاریگەری دەروونی سازشکردنداببوون بۆ ئێران، هۆکاری ئەو سازشەیان لە چاوی کورد دەزانی، بەمەش نەیانتوانی سۆزی کورد بەلای خۆیاندا رابکێشن، کۆچێرا لەو بارەیەوە دەنووسێت: ((...کاربەدەستانی عێراقی پیانویستبایە لە سیاسەتی خۆیان کارامەبن و رابردوویان فەرامۆش بکردایە و رێگەی ئەو پەنابەرانەیان بدابایە، کە بڕیاریانداپوو بۆ وڵاتیان بگەڕێنەوە، جێگەی شایستەی خۆیان لە کۆمەڵ وەربگرنەوە، لەوە بوو بیانتوانیبایە ئەوپەڕی سوود لەو خەڵکە وەربگرن، کە داموو دەزگای شۆڕشیان بە تەواوی لە بەرچاو کەوتبوو، زۆربەی ئەو کوردە عێراقیانە دەستیان لە ئۆتۆنۆمی شت بوو، دووچاری نائومێدی ببوون، دەکرا بە ئاسانی بهێنرێنە مەیدانی هاوکاری کردن لەگەڵ کاربەدەستانی عێراقدا...))[552]، ئەمەی کۆچێرا دەیڵێ راستە کە دەسەڵاتدارانی عێراق لەو ماوەیەدا دڵنەوایی کوردیان نەکرد، بەڵام گیروگرفت و خواستی میللەتی کورد بە تەنیا دڵدانەوە نەبووە، ئەمەی نووسەر زیاتر لە روانگەی رۆژنامەوانیەوە نووسراوە.

---

551- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (8)

552- کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا، ل251

له رووی دەروونییەوە هەرەس کاریگەری خراپی لە سەر ورەی شۆڕشگێڕیەتی جەماوەری کوردستان بە جێهێشت، هەروەها هەرەس لە بەرچاوی شەقامی کوردی نموونەیەکی قێزەونی دروست کرد لە فێڵ و پیلانی نێودەوڵەتی و بێ پشتیوانی کورد لە ناوەندە دەولیەکان[553]. پاشان نسکۆی شۆڕش لە سەنگ و قورسایی کێشەی کوردی کەمکردەوە، لە کێشەی گەلێکی ستەمدیدەوە، لە ئاستی دەرەوە وەکو کێشەیەکی گرێدراو و گرێگرتەیی ئێران و ئەمریکای ناساند[554]، لە بەرانبەریشدا گیانی خەبات و تێکۆشانی لە ناو بزوتنەوەی کورد لاواز کرد[555]، حبیب محمد کریم لەوبارەیەوە دەنووسێت: ((ئەو کارەساتە تراژیدیایە بارێکی دەروونی ترسناکی یەکسانی لای هاوڵاتی و پێشمەرگە دروست کرد، بە هۆی خیانەت و غەدرو بە فیڕۆچوونی سەروەت و سامان و ئاسایش، زۆربەی خەڵکی بڕوای بە هیچ نەمابوو...))[556].

بەعس بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی لە دوای هەرەس بەردەوام و بە ئاشکرا کەوتبووە جموجۆڵ بۆ بە بەعسیکردنی کورد، تۆڕی سیخوڕی و دەزگانی هەواڵگری بە ناو خەڵکدا بڵاوکردبۆوە[557]. لەو رێگەیەوە دەیویست بە تەواوی کۆنترۆڵی هەموو بزاڤێکی دژ بە حکومەت بکات.

ئەو کاریگەرە خراپانە تەنیا کورت هەڵنەهاتبوو لە سەر کوردستانی باشوور، بەڵکو کاریگەری لە سەر کوردستانی رۆژهەڵاتیش زۆربووە، روخانی شۆڕش و

---

٥٥٣- راندال: کوردستان یان کلۆلی نەتەوەیەك، ل٢١٦

٥٥٤- سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٥٩

٥٥٥- کۆچێرا: بزوتنەوەی سەربەخۆیی، ل٣٥

٥٥٦- بڕوانە: (تأریخ الحزب الدیمقراطي الکردستاني، ص١٤٠)

٥٥٧- سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٦٩، فاتیح رەسوڵ: بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ، ل٢٥٤-٢٥٥

دوورخستنەوەی پەناهەندە کوردەکان لە ناوچەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتەوە بۆ ناوچە دوورەکانی کوردانی کوردستانی ئێرانیشی نائومێدو نیگەران کرد، لەو خانەوادانەی لەگەڵ (پ.م)ی حدکا ئاوارەی شارەکانی کوردستانی عێراق ببوون، لە دوای رێککەوتننامەی جەزائیرو هەرەسی شۆرشی کورد بۆ رومادی رۆژئاوای عێراق لە کوردستان دوورخرانەوە[558]. حکومەتی عێراقی (حدکا)شی ترساند، کە دەستی نەوانیش ببڕێت[559]، نیگەرانی کوردان لەبەرانبەر شار پەیوەندی نێوان کورد و حیزبی تودەی بەرهەڵستکاری ناحەز بە شا لە دوا پیلانی جەزائیر، رژێمی شا گەیشتە رادەیەك ساواك راسپێرێت بۆ دیراسەکردن و گۆڕینەوەی ئاڵوگۆڕی زانیاری لە سەر کۆمەڵە کوردییەکان[560]، بەڵام هەوڵەکانی شا لە کپکردنەوەی نیگەرانی بەو لاوە بۆ هیچ مەبەستێکی دیکە نەبوو، کە لەو مەبەستەش سەرنەکەوت.

لایەنێکی دیکەی زیانەکانی هەرەس تەفروتونا بوونی کەرەستەی جەنگ و تەقەمەنی بوو، لە رۆژی یەکەمی دوای راگەیاندنی رێککەوتننامەکە، هەروەك مەکدواڵ دەنووسێت: ((چەند سەعات دوای رێککەوتن، هێزەکانی ئێران گەڕانەوە ناو ئۆردوگاکانی خۆیان و پارمەتیەکانی مەلا مستەفا راگیرا، هێزەکانی عێراقی لە دۆڵی چۆمان هاتنە پێشەوە، حاجی ئۆمەران کەوتە بەر هەڕەشە، عێراق بە پێی رێککەوتننامەیەك لەگەڵ ئێران کردبووی لە ١٣/ ٣/ ١٩٧٥ شەڕی راگرت))[561]،

---

٥٥٨- دیدار بەرێز جەلیل گادانی، ٦/١/ ٢٠٠٧ز، لە شاری کۆیە.

٥٥٩- هوشمەند عەلی مەحمود: عەبدولرەحمان قاسملو ژیان و رۆڵی سیاسی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورددا ١٩٣٠-١٩٨٩، نامەی بلاونەکراوەی زانکۆ، بەشی مێژوو، کۆلیژی پەروەردە، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٦، ل١٢٨-١٢٩.

٥٦٠- عیسی پەژمان: نهێنی یەکانی بەستنی، ل١١٢-١١٤

٥٦١- مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٥٥

دوای بڕیاری هەرەس لەو چەکە سوك و نیمچە قورس و قورسانەش لەگەڵ تەقەمەنی، کە لە بەر دەستی (هـپ) دابوو، زۆربەی رادەستی عێراق کرانەوە یان خراپ کرا، ئەگەر بەشێکی کەمی شاردرابێتەوە[٥٦٢]، ئەوەش بە هۆی ئەو بێ ئومێدیەی لە ناو خەڵك بڵاو ببۆوە لەگەڵ ئەو هەڕەشەو ئەو بڕە پارەی دەیدا لەبەرانبەر رادەستکردنەوەی چەك و تەقەمەنی، زۆر کەمی لێشاردرایەوە، هەڕەشەی حکومەت بە لە سێدارەکان، بەرانبەر هەر کەسێك چەکی پێ بگیرێت، ترسی لە ناو خەڵکدا بڵاوکردەوە بە جۆرێ خەڵك گومانیان لە یەکتری هەبێت[٥٦٣]، بۆیە لەو چەکانەی بەردەست شۆڕش حکومەتی عێراقی پشکی شێری بەرکەوت[٥٦٤]

---

٥٦٢- حبیب محمد کریم: تأریخ الحزب الدیمقراطي الکردستاني، ص٠ ١٤٠-١٤١.

٥٦٣- حکومەت لە دوا قۆناغی درێژکردنەوەی لێبوردنی گشتی بانگەوازێکی بڵاوکردەوە، هەڕەشەی لە سێدارەدانی کردوە لەو کەسانەی چەکیان شاردۆتەوە، کە دەڵێ: (بەناوی خوای گەورەو میهرەبان، روونکردنەوە بۆ نەوەکانی گەلی کوردمان لە باکوری خۆشەویست، بیرتان دەخەینەوە کە سزای لە سێدارەدان بۆ هەموو ئەو کەسانە دەبێت، کە بەچەکەوە دەگیرێن، بۆیە دەرفەت لە بەردەم ئەو کەسانە دەهێنینەوە هەتا پەشیمان ببنەوە، بگەڕێنەوە ریزی نیشتیمانی، حکومەتی نیشتیمانی چاوی لێتانەو فەرمووی چەکەکانتان بۆ دەکاتەوە، ئەگەر نا بە هۆی خیانەت کردن لە گەلی عێراق بە عەرەب و کوردەوە چارەنووس مردن و لە سێدارەدانە. لیژنەی لێبوردن لە گەڕاوەکان. بڕوانە: (سەروەر عەبدوڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٢٣١)

٥٦٤-سەدام حوسێن دوای هەرەسی شۆڕشی کوردستان لە سەر زاری خۆیەوە دانی ناوە بەکۆکردنەوەی (١٥٢) هەزار پارچە چەکی جۆراو جۆری لە کوردستان. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئەنوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٩٧ بەڵگەنامەی ژمارە (١٤).

کەلوپەلی فرۆشگاو کەرەستەکانی دیکەی بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ماوەی ١٣ی ئازار بۆ ٢٦ی ئازار شوێن بزرکراو ساغ کرایەوە[٥٦٥]. رادیۆی شۆڕش لە ڕۆژی ٢١ی ئازارو لە یەکەم ڕۆژی نەورۆز بێ هیچ لێداونێك لە کارکەوت[٥٦٦]، بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق سوودی لێوەرنەگرێ تەقێنرایەوە[٥٦٧]. هەتا وێستگەکانی لاسلکی لە ڕۆژی ٢٢ی ئازار بە تەواوی لە کارکەوت[٥٦٨]، کە ئەمەش لە ١٩ی ئازار بە دواوە نیشانەیەکی دیکەی هەڵوەشانەوەی تەواوی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان بوو[٥٦٩].

سەبارەت بە پاشماوەی پارەو داهاتی شۆڕش بە هۆی نەبوونی شەفافیەتی دارایی لە خەرجیو داهات، زانیاری ورد دەست ناکەوێت، هەندێ لە بەرپرسانی جوڵانەوەکە ناراستەوخۆ ئەوە نیشان دەدەن، کە بەشێك لە داهاتی شۆڕش مابوو، لەوێدا مەسعود بارزانی دەنووسێ: (("سێ" ملیۆن دینارو "یەك" ملیۆن دۆلار لە دارایی شۆڕش مابوو، زۆری ئەو پارەیە بۆ خەرجی نیشتەجێبوونی پەناهەندەکانی ئێرانو ئەوەی دیکە

---

٥٦٥-شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٢ەوە ئەو فرۆشگایەی دامەزراندبوو. بڕوانە: (پارتی دیموکراتی کردستان، کمیتە تدارکاتی، انتشارات اسماعیل شریف زادە، کوردستا ایران١٩٧٨، ل٢١٤" نەوشیروان مستەفا : لە کەناری دانوبەوە، ل٣١)

٥٦٦- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٣٩٦

٥٦٧-ئەزیدی: أحداث عصرتها، ص٣٠٢.

٥٦٨- علی سنجاري: القضية الكردية.ج١/ص٧٨-٧٩.

٥٦٩- لە بەرنامەیەکی تەلەفزیونی تایبەت بە یادی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە تیڤیی ٦/٣/٢٠٠٧ی کەناڵی زاگرۆس، عەبدوسەلام بەرواری بەرپرسی مەکتەبی دیراساتو توێژینەوەی (پ.د.ك) وتی: (سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول وای بە چاك زانی ئەو چەك و کەرەستە مادیانەی شۆڕش هەڵگرێت بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی چەکداری لە شۆڕشی گوڵان...).

بۆ چالاكیەكانی دەرەوەو كڕینی چەك بۆ شۆڕشی گوڵان[٥٧٠] خەرج كرا))[٥٧١].، لەو بارەوە لە راپۆرتی (لیژنەی ئامادەكاری)دا هاتووە، كە لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٠ بۆ ١٩٧٥ سەركردایەتی شۆڕش (٤٨) ملیۆن دینارو (١٥٩) ملیۆن دۆلاری میزانیە بووە، جگە لە داهاتی فرۆشگاكانی شۆڕش، ئەو پارەیە چەك‌و تەقەمەنی پێ نەكراوە، ئەوەی خەرج كراوە بۆ یارمەتی (پ‌م)و خەرجی بارەگاكان بووە، بە پێی ئەو راپۆرتە یەك لە سەر سێ واتە ١٦ ملیۆن دینار ماوەتەوە، كە دەیكردە (٥٠) ملیۆن دۆلاری ئەمریكی، كەوتۆتە دەست خانەوادەی بارزانی[٥٧٢]، كە دواتر (سەركردایەتی كاتی)یان دامەزراند، عەلی سنجاری لەو بارەیەوە دەنووسێت : ((١٦١ ملیۆن دۆلار هاریكاری ئەمریكی بووە، ئێران میزانیەكی هەشت ملیۆن دۆلاری مانگانەی بۆ شۆڕشی كورد تەرخان كردبوو، لەمە سەرەڕای دابینكردنی چەك‌و ئەرزاقی بارەگاكان‌و كەرەستەی پزیشكی[٥٧٣]، لە لایەكی ترەوە (شریف وانلی) پێی وایە ئەو كاتەی مستەفا بارزانی كوردستانی بەجێهێشتووە، (٧٠) ملیۆن دۆلاری شۆڕشی پێ بووە[٥٧٤]. (الحرصان) لە مەحمود عوسمانەوە دەگێڕێتەوەو دەنووسێت: ((لە ئێران‌و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاو ئیسرائیل "٤٨"ملیۆن دیناری عێراقیمان بەدەست دەگەیشت، لەو

٥٧٠- بەو بەشەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لە سەر دەستی سەكردایەتی كاتی (پ‌د‌ك) دەوترا (شۆڕشی گوڵان)، ئەو بەشەی كە (ی‌ن‌ك) سەركردایەتی دەكرد پێی دەوترا (شۆڕشی نوێ).

٥٧١- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص ٣٩٦

٥٧٢- الحزب الديمقراطي الكردستاني ـ اللجنة التحضيرية، تقيم مسيرة، ص٢٢٣-٢٢٤، زاراوەی بنەماڵە وەكو شوناسێكی كۆمەڵایەتی هەتا ئێستاش لە كۆمەڵگای كوردستان بەكاردەهێنرێ بۆ خانەوادەیەكی دیاری كراو، بەڵام لێرەدا مەبەستی نووسەر سەركردایەتی كاتیە.

٥٧٣- علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٨٠

٥٧٤- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٢٤،

پارەیەکی زۆر بوو، ژمارەی جەنگاوەرەکانمان دەگەیشتە "٦٠" هەزارو "٤٠" هەزاری یەدەك، هەرچونێك لێکی بدەینەوە لە سێ بەشدا بەشێکی لای سەرکردایەتی مابۆوە، کە دەیکردە "٦٠" هەزار دۆلاری ئەمریکی، ئەو بەشە لای سەرکردایەتی مابۆوە))[٥٧٥].

هەر لە سەر زاری مەحمود عوسمانەوە دەگێڕنەوە: ((بارزانی راستەوخۆ لە دوای نووشستی شۆڕشملیۆنێك دیناری لە ئێران وەرگرتووە))[٥٧٦].

ناتوانین لە بابەت ئەو پارەیەی لە بودجەی سەرکردایەتیدا مابۆوە بگەینە ئەنجامی ورد، چونکە ژمارەی تەواو لە بەردەست دانییە لە سەر داهاتی شۆڕش‌و سەرچاوەکانی، ئینجا خەرجی‌و ئەو بوارانەی پارەی تێدا خەرج کراوە، پێدەچێ داهات‌و خەرجی پرنسیپێکیان نەبووبێت بەلای کەمەوە ئەندامانی (م‌س) لێی ئاگادارین، ئەو ژمارانەش هەیە، تەخمینەو جیاوازی تێدایە، لە بەرپرسیاریەتی دارایی شۆڕش ئاماژە بە (شێخ محەمەد هەرسین) دەکرێت، لە کۆنگرەی هەشتەوە بووێتە بەرپرسی دارایی، لە ساڵی ١٩٧٩ لە رووداوێکی نادیاردا ون کراوە[٥٧٧]، سەرەڕای ئەوە ئاماژە هەیە بەوەی لە سنوورێکی بچوك نەبێ رێگە نەدراوە داهات‌و خەرجیەکانی شۆڕش بۆ ئەوانی دیکە ئاشکرا نەبووە، ئەو جیاوازیەش لە سەرداهاتی شۆڕش‌و ئەو پارەیەی ماوە ئەنجامی ئەو ناشەفافیەتەیە کە هەبووە[٥٧٨].

---

٥٧٥- المصدر نفسه، ص٢٢٣-٢٢٤

٥٧٦- المصدر نفسه، ص٢٣٦

٥٧٧- المصدر نفسه، ص٢٥٤

٥٧٨- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (أيوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية و صراع القوى، ص٥٢٠-٥٢٢)

لە رووی سەرچاوەی دارایی باس لە ویلایەتە یەکگرتووەکانو ئێرانو شانشینی سعودیە دەکرێت[٥٧٩]، یان ئێرانو ئیسرائیل[٥٨٠]، بە دڵنیاییەوە شۆڕش داهاتی فرۆشگار گومرگی شۆڕشو کۆمەکی ئەندامان هەبووە، کە کادیرەکانیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شۆڕش کۆیان دەکردەوە، ئەو بابەتە جگە لەوەی ساغ نەبۆتەوە دوای بڕیاری نسکۆ شۆڕش چەندە پارە مابوو، هەندێك لەو پارەیە لە لایەن (سەرکردایەتی کاتی)یەوە خەرج کراوە.

حکومەتی عێراقی دوای هەرەس بە بۆنەی ئەو سەرکەوتنەوە ئاهەنگی گێراوە، لەو بارەیەوە یوسفی دەنووسێت:((حکومەت بەو بۆنەوە مانۆڕێکی سەربازی گەورەی ڕێکخست، لەو مانۆڕەدا سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراقی زیانی ١٦٤٠ کوژراوو ٧٩٠٣ برینداری ڕاگەیاند،کە لە ماوەی مارسی ١٩٧٤ بۆ مارسی ١٩٧٥ لە سوپای عێراقی کەوتووە، لە ناویاندا ٦٦ ئەفسەر کوژراوەو ٣٨٨ ئەفسەر بریندار بووە))[٥٨١]، لە کاتێدا ئەگەر ئەو ئامارەش ڕاست بێت، حکومەت سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، سەدام حوسێن لە وتارێکدا، کە بە بۆنەی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠دا سەرەڕای خستنەڕووی هەمان ئاماری کوژراو بریندار، باسی لاوازی ئەو ساتە وەختە دەردەکێشێ[٥٨٢]، لە کاتێکدا شەڕی کوردستان بە هۆزی گوتاری

---

٥٧٩-البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ ص٢٩٥

٥٨٠- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٣٣-٢٣٤

٥٨١- یوسفی: ثورة ايلول، ص٨٦

٥٨٢- سەدام حوسێن لەو وتارەدا دەڵێ: (لە ڕاستی دا ئەوەی چەکی شەڕمان نهێنی بووە هەتا دوژمنان ئەو نهێنیە نەزانن‌و لە پیلانو دوژمنایەتی بەکاری نەهێنن، بەتیا چەند کەسێك لە سەرکردایەتی دەمانزانی، ئەمەش بۆ ئەوەی هێزەکانمان کە بە ئازایەتی‌و شەرەفمەندی دەجەنگان ورە بەرنەدەن...). بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (١٤).

چـڕی شــۆڤێنیەتی بــەعس بــەرەی شۆڕشــی کــورد دەســتکردی دوژمنانــە، دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیر دەرفەتی زیاتری بۆ ڕەخساو بەڵگەی زیاتری کەوتە دەست ئەو شاڵاوە چڕتر بە گوێی شەقامی عێراقیدا بدات، ئەو زیانە گیانیانەش کـە لـە سـوپای عێراقی کەوت لە ماوەی شەڕی یەك ساڵە سوودی لێـوەرگرت بـۆ جۆشـدانی هەسـتی ناسیونالستی عەرەبی، هەروەها ئەو زیانە گیانیانەیـە لـە مـاوەی ئـازاری ١٩٧٤ بـۆ ئازاری ١٩٧٥ لە شۆڕشی کورد کەوتووە گەیشتۆتە ١٥٢٥ کوژراوو ٢٣٦٠ برینـدار لە هێزی (پ‌م)و لە خەڵکی ئاسایی ١٤٩٣ کوژراوو ١٩٥٢ بریندار هەبووە[٥٨٣].

لە زیانەکانی حکومـەتەوە دەگەینە تەخمینێك لە سـەر زیانە گیانیـەکانی کورد لــە ماوەی شۆڕشی کوردستان کـە دەبێـت ژمـارەی برینـدارو کـوژراو لـە ڕێـزی (پ‌م.)و هاوڵاتیاندا لە (١٠٠٠٠) کەمتر نەبێت، گەرچی بەو ئاکامەی شـۆڕش پێـی گەیشـت ناتوانرێ ئاماری دروست لە سـەر هەمـوو شەهیدانی شۆڕش دەست بخرێ، لـە کاتێکـدا زیانەکانی حکومەت لەو ساڵەی پێش ڕێککەوتننامەی جـەزائیر شـەڕ بـەردەوام بـووە، پێشمەرگەو هاوڵاتی ئاسایی وەکو یەك کەوتوونەتە بەر شاڵاوی تۆپبـارانو بۆردومـانی حکومـەتی عێراقی.

---

٥٨٣- حبیب محمد کریم: تأریخ الحزب الدیمقراطی الکردستانی، ص١٤٢

# بەشی سێیەم

## کوردو شۆڕشەکەی لە بەردەم ئاکامەکانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر
## هەتا هەڵوەشانەوەی ئەو ڕێککەوتننامەیە

### باسی یەکەم

دامەزراندن و چالاکبوونەوەی پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکان و سەرهەڵدانەوەی جوڵانەوەی چەکداری لە کوردستان

### باسی دووەم:

ڕاگواستن و وێرانکردنی گوندو شارەدێیەکان.

### باسی سێیەم:

گۆڕانی ڕژێمی دەسەڵات لە ئێران و بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردو هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر

## باسی یەکەم

## دامەزراندن‌و چالاکبوونەوەی پارت‌و ڕێکخراوە سیاسیەکان‌و سەرهەڵدانەوەی جوڵانەوەی چەکداری لە کوردستان.

حکومەتی عێراقی لەوەدا سەرکەوت کۆتایی بە شۆڕش هێنا، بەڵام نەیتوانی زیاتر لە ساڵێك مەیدانی بەرەنگاری سیاسی‌و چەکداری لە کوردستان بنبڕ بکات، لەو بارەیەوە کازم حەبیب دەنووسێت: ((لەوەو پێش حکومەت توانیبووی خۆی لە سەرکردایەتی مێژوویی بزاڤی کوردی مەلا مستەفای بارزانی رزگار بکات، بەڵام دەستەوەستان بووە خۆی لە دەست گەلی کوردو دوایی بزاڤە رزگاریخوازیەکەی قوتار بکات، دووبارە لە ساڵی ١٩٧٦ بە ماوەیەکی کەم بەرگری چەکداری لە کوردستانی عێراق دەستی پێکردەوە))[٥٨٤].

هۆکارە بابەتییە ناوخۆییەکان بۆ درێژەدان بۆ خەباتی سیاسی‌و چەکداری کۆتایی نەهات، بەڵکو کۆسپەکان بەرتەسك بوونەتەوە، هۆکارە دەولیەکان بە هۆی هاوکاری عێراقی‌و ئێرانی پاڵپشتی جارانیان نەما، چاودێری توند خرایە سەر سنوورەکان، گیانی پێشمەرگایەتی بە هۆی توانەوەی شۆڕشی گەورەی ئەیلول‌و لە دەستدانی توانا مرۆیی‌و

٥٨٤- لمحات من نضال حركة التحرر الوطني، ص٥١١

مادیەکانیەوە لاواز بوو[584]، ئەوانەی گەڕانەوە بۆ عێراق لە ڕووی جموجۆڵی سیاسی خرابوونە ژێر چاودێریەوە، هەرکەسێك لە ناو ئێران ئاشکرا بێت، کارو چالاکی سیاسی ئەنجام دەدا رادەستی عێراق دەکرایەوە[586]

بزاڤی سیاسی‌و فەرهەنگی لە کوردستان لە دوای بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە لە دەوری پارت‌و کۆمەڵە کوردییەکان خۆیان رێکخست، سەرەڕای مانەوەی رۆڵی کارای شێخانی تەریقەت‌و سەرۆك هۆزەکان لە جۆشدانی جەماوەر، پارتی دیموکراتی کوردستان لە دامەزراندنیەوە لە ١٦ای ئابی ساڵی ١٩٤٦ز هەتا ساڵی ١٩٧١ لەگەڵ پارتی کومۆنیستی عێراق، ویستوویانە ئەو رچەیە بشکێنن.

لە١٩٧٠هەتا ئازاری ١٩٧٥ جگە لە چەند لایەنێکی سیاسی بچوکی وەکو کاژیك[587] و (حشع- القیادە المرکزیە)[588] و کۆمەڵەی مارکسی لنینی کوردستان[589]،

---

٥٨٥- سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٥٦

٥٨٦- بڕوانە: مادەی یەکەم‌و پێنجەم لە پرۆتۆکۆڵی پەیوەست بە ئاسایشی سنوور لە بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

٥٨٧- کاژیك: کورتکراوەی (کۆمەڵەی ئازادی‌و ژیانەوەو یەکیەتی کورد)ە لە ١٩٥٩/٤/٤ وەك ئاراستەیەکی نەتەوەیی رادیکاڵی دامەزراوە، لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول کاژیك ئەو کاریگەریەی نەما، لە هاوینی ساڵی ١٩٧٤ کارەکانی خۆی بەرەسمی راگرت، بەڵام وەکو ئاراستەیەك نەتەوەیی ناو بزاڤی رۆشنبیری‌و هوشیاری کوردایەتی مایەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الخراسان: التیارات السیاسیة، ص٢٨٦-٢٨٧* کامیل ژیر: کوردایەتی‌و سەربەخۆیی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی ٢٠٠٢، ل٥٣-٥٩* کاوە ئەمین: ناسیونالزمی کوردی، خەبات بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی، هەولێر ٢٠٠٦، ل٤٢-٥٧* چاوپێکەوتنی گۆڤاری بابان لەگەڵ کامیل ژیر، ژمارە (٣) تەموزی ٢٠٠٧، ل٢٨-٣٣)

٥٨٨- حیزبی شیوعی عێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٧ بوو بە دوو لەت، باڵە سەرەکیەکەی لە تەموزی ساڵی ١٩٧١ چووە ناو (بەرە) لەگەڵ بەعس، باڵە بچووکەکەیان بە ناوی (القیادة المرکزیة) لەگەڵ شۆڕشی

(پ.د.ك) بێ پێشبڕكێ جڵەوی سەركردایەتی خەباتی بزاڤی سیاسیو چەكداری لە دەست دابووە، لە ئازاری ساڵی ١٩٧١ بۆ ئازاری ساڵی ١٩٧٥ هەستیارترین ساڵانی تەمەنی شۆڕشی كورد بووە.

سیستمی خەباتی سیاسیو چەكداری لە كۆتایی هاتنی نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەم شێوازێكی تازەی وەرگرت، ئەویش جۆشدانی جەماوەری شۆڕشگێڕ بۆ خەباتی ڕزگاری نیشتیمانی لە كەناڵی ڕێكخستنی حیزبایەتیەوە، كۆتایی شۆڕشی ئەیلول زیاتر بە سەردەمی وەرچەرخانی نێوان شێوازی كۆنو تازە دەبینرێ.

وەكو بەدەردەكەوێ سەرەڕای هۆكارە زاتیەكان لە بەردەوامی زوڵمی ڕژێمی بەعسو ناماڵی كورد بۆ بەدیهێنانی خواستەكانی لە كوردستانی عێراق، هۆكاری خودیش ڕۆڵی هەبووە لە پێشبڕكێ بۆ جێگرەوەی سەركردایەتی كردنەوەی جوڵانەوەی شۆڕشی

---

كوردستان مانەوە، ژمارەیەك لە بارەگاو چەكداریان هەبوو، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الحرصان: صفحات من تاریخ، ص١٣٢-١٢٠)

٥٨٩- كۆمەڵەی ماركسی لینینی: لە دوای هەڵوەشانەوەی باڵی (م.س) ژمارەیەك لە كادیرە چەپەكانی ئەو باڵە ڕێكخراوێكیان بەو ناوەوە دامەزراند، بە نهێنی لە شارەكانی كوردستان كاریان دەكرد، لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە بەهاری ساڵی ١٩٧٤، زۆربەیان چوونە ڕیزی شۆڕشو بە نهێنی كاریان دەكرد، لەگەڵ ڕاگەیاندنی هەرەس كەوتنە گفتوگۆ بۆ درێژەدان بە شۆڕش، بەڵام ئەوانیش خۆیان رادەستی حكومەتی عێراق كردەوە، بڕوانە: (الحرصان: صفحات من تأریخ العراق، ص٣٢٦-٣٢٤" سەروەر عەبدولڕەحمان: یەكیەتی نیشتیمانی كوردستان، ل٨٤-٩٥" شۆڕش حاجی رسول: الاتفال الكرد و الدولة العراق، ت/مجموعة من المترجمین، سلیمانیة، ٢٠٠٥، ص٣٤).

کورد[490]. مستەفا بارزانیو کوڕەکانیو لایەنگرانیان کەوتنە خۆو جەلال تاڵەبانیو هاوڕێیانی لەلایەکی دیکەوە یەکیەتی نیشتیمانی دامەزراند[491].

لە شاری ورمێ راستەوخۆ دوای نووشستی شۆڕش ژمارەیەك لە کادیرە سەربازیو سیاسیەکان کۆبوونەوە بۆ تاوتوێکردنی درێژەدان بە خەبات، تاکام گەیشتنە ئەوەی رێکخراوێکی سیاسی بە ناوی (بزوتنەوەی سۆشیالستی کوردستان) دابمەزرێنن[492]، حکومەت بەڵێنی پێدابوون ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق رێگەیان پێدەدا کاری سیاسی بکەنو دەرفەتی رەخساویان بۆ دابین دەکات لە دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان رۆڵی خۆیان بگێڕن، بەڵام کە گەڕانەوە هەموویانی دوورخستەوە بۆ باشوورو خوارووی عێراقو لە ژێر چاودێری دەزگاکانی بەعس لە سەر ئیشوکاری سیی دایمەزراندن[493].

٤٩٠-ئێنتیمار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٦٨

٤٩١- تریب: صفحات من تأریخ العراق، ص٢٨٤

٤٩٢- ئەوانە لە دوای گەڕانەوەیان بۆ عێراق، لە بەڵێنەکانی حیزبی بەعس بێئومێدبوون، ئینجا چوونەوەو لەوێدا (سالح یوسفی)یشیان لەگەڵ کەوت. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٤٨٥-٤٨٦" سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٩٦-١٠٢" حەمە نوری تۆفیق: یادنامە، ل٤٩-٦٥" فاتیح رسول: بنچینەی مێژووی بیۆکەی چەپ، ل٣٥٦)

٤٩٣- تێکەڵاوبوونێك هەیە لە بەشداربوانی کۆبوونەوەی ورمێ بۆ قسەکردن لە سەر دامەزراندنی (بزوتنەوەی سۆسیالستی کوردستان)، دواتر لە بەغدا گۆڕانکاری بە سەردا هاتو بیوبوچوونو کاراکتەری تازی بەدواداهات، لێرەوە ئەوەی جێی پرسیارە بەیاننامەی دامەزراندن بە مێژووی ١٩٧٦ دەرچووە، بۆیە پێدەچێ هیچ بەیاننامەو میکانیزمی کارکردن لە کۆبوونەوەی ورمێ دەرنەچووبێ. بڕوانە: (حەمە نوری تۆفیق: یادنامە، ل٥٩" سەروەر عەبدولڕەحمان، یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٩٨.

کارو چالاکی سیاسی لە ژێردەسەڵاتی حکومەتی بەعس نەك لەوانە قەدەغە کرا، کە لە شاخ گەڕابوونەوەو بەشداری شۆڕشیان کردبوو، بەڵکو حکومەت کەوتە بەرتەسك کردنەوەی کاروچالاکی ئەو پارتانەی پێشتر لە بەرەی بەعس دابوون، لە پێشەوەیاندا (حشع)[٥٩٤]، کە لێیان قەدەغە بووە پەیوەندی بەوانەوە بکەن، کە دوای هەرەس خۆیان رادەستی حکومەت دەکردەوە، تەنیا بۆ حیزبی بەعس هەبوو پەیوەندیان پێوە بکات[٥٩٥]. لە ژێرچاودێری بەعس لە کەش و هەوایەکی پڕ لە پێداهەڵدان بە دەستکەوتەکانی کۆدەتای ١٧و ٣٠ تەمووز لە ساڵی ١٩٧٦ (حشع)[٥٩٦] و (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)[٥٩٧] کۆنگرەی خۆیان بەست.

حکومەت لە ڕێگەی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمیەوە نیشانی خەڵکی دەدا، ئەوەی کورد داوای دەکات بەعس بە زیادەوە پێی داوە، یان نیشانی بدات بەیاننامەی ١١ی ئازار قەناعەتی خۆرسکی بەعس بووە، بۆ ئەو مەبەستە (تەها محێ دین مەعروف)[٥٩٨]ی کرد

٥٩٤- ئەلیوت هیسا: خوێندنەوەی بەعس، ل٦٤-٦٦" فاتیح رسول: لە ناو کاروانێکی دوورو درێژدا، ل٢٢٥-٢٢٧

٥٩٥- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل٢٢

٥٩٦- لە ژێر دروشمی (لە پێناو تۆکمەکردنەوەی شۆڕش و پتەوکردنی بەرەی نیشتیمانی و نەتەوەیی پێشکەوتووخواز)دا لە ڕۆژانی ٤ بۆ ٦ی ئابی ١٩٧٦ (حشع) لە بەغدا کۆنگرەی خۆی بەست. بڕوانە: (وثائق للمؤتمر الوطني الثالث للحزب الشيوعي العراقي، بغداد، ١٩٧٦، من اجل توطيد و تعميق المسيرة الثورة و توجه نحو الاشتراكية، بغداد، ١٩٧٦" طريق الشعب، عدد (٨٠٢) في ٩/ ايار/١٩٧٦)

٥٩٧- لە بەغدا لە ژێر چاودێری (حسن العامري) ئەندامی قیادەی هەرێمایەتی حیزبی بەعس "پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان" لە سەرەتای شوباتی ١٩٧٦ کۆنگرەی خۆی بەست، هەموو ڕاپۆرتو ئەدەبیاتی کۆنگرە تەرخان کرابوو بۆ پێداهەڵگوتنی دەستکەوتەکانی کۆدەتای ١٧-٣٠ تەمووزی ١٩٦٨. بڕوانە: (ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٣٠٢)ی ٦/٢/١٩٧٦)

٥٩٨- تریب: صفحات من تأريخ العراق، ص٢٨٥

بە جێگری سەرۆکی کۆمار، کە رۆڵی لە بزاڤی شۆڕشی کوردستاندا نەمابوو[٥٩٩]، هاشم ئاکرەیی کردە سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان، ئامانج لە دانانی هەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو راپەڕاندن زیاتر بۆ راگەیاندنو کردەیەکی رووکەشانە بوو، دوو ئەنجومەنی بێ دەسەڵاتو لە کەسانی ملکەچی (حیزبی بەعس)ی پێکی هێنابوو، زۆربەی دەسەڵاتە گرنگەکانی ئەو سێ پارێزگایەی ناوی ئۆتۆنۆمی لێ نابوون راستەوخۆ بەستبۆوە بە وەزارەتەکانی بەغداوە[٦٠٠]، ئەو دوو ئەنجومەنە لەوە نەدەچوو بۆ نەتەوەیەکی جیا لە عێراقدا دامەزرابن[٦٠١].

٥٩٩- تەها محێ دین مەعروف: لە ساڵی ١٩٢٤ لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، دەرچووی کۆلێژی یاسایە، لە یەکەم کۆنفرانسی (پ‌د‌ك) ساڵی ١٩٤٦ بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە، لە دوو لەت بوونی (پ‌د‌ك) سەر بەباڵی (م. س) بووە، لە دوای کودەتای بەعسیەکان لە ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨ بە نوێنەرایەتی ئەو باڵە کراوەتە وەزیری ئیشغالو نیشتەجێکردن، لە ساڵی ١٩٧٤ کرایە جێگری سەرۆك کۆمار. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٤٥-٦٠" عبدالستار طاهر شریف: الجمعیات والنظمات والاحزاب الکردیة، بغداد١٩٨٩، ص١١٤، ١٥٥)

٦٠٠- بۆ دەسەڵاتو پێکهاتەی هەردوو ئەنجومەن بڕوانە: (قانون الحکم الذاتي). لە کتێبی: الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٦٦٠-٦٦٨

٦٠١- بۆ نموونە لەو دەقەی حکومەتی مەرکەزی بۆ سوێندخواردنی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانانی دانابوو، بەڵگەیە لە سەر نەبوونی تایبەتمەندیەتی نەتەوەیی، کە بەم شێوەیە بووە:- (اقسم بالله العظیم، بشرفي و بمعتقدي، ان احافظ علی النظام الجمهوریة وان التزم مخلصا بمبادئه و دستوره و قوانینه، ولن اعمل جاهدا علی سلامة الجمهوریة العراقیة و وحدة أراضیها.) ئەم دەقەش بە بڕیاری (المجلس القیادة الثورة) بە زمانی عەرەبی دانرا بوو. بڕوانە: (الوقائع العراقیة عدد ٢٤٧٤، ٢/٦/١٩٧٥ز)

له دوای نسکۆی شۆڕشی کوردی (پدك) لەبەریەك هەڵوەشابۆوە[٦٠٢]، لە نیسانی ساڵی ١٩٧٥ لە سەر دەستی ژمارەیەك لە ئەندامانی (م‌س)و کادیرە لاوە نزیکەکانی پێشتری دەزگای پاراستنی (پدك) بە ناوی (سەرکردایەتی کاتی) دامەزرایەوە[٦٠٣]

ئەوەی مەسعود بارزانی ئاماژەی پێدەکات هەر لەدوای ئەوەی مستەفا بارزانی باوکی کوردستانی عێراقی بەجێهێشتووە، بەر لەوەی دوور بخرێنەوە بۆ (کەرەج) لە شاری (نەغەدە) روخسەتی دووبارە رێکخستنەوەی سەرکردایەتی (پدك) لێوەرگرتووە، دەنووسێت: ((داوام لە باوکم کرد رووخسەتم بدات بۆ دووبارە دەسپێکردنەوەی تێکۆشانو رێکخستنەوەی تەشکیلاتی حیزبیو سەربازی لە سەر بنەماو چەمکی گۆڕانکاریو بارودۆخی تازەو ئەزموونو بەهرەی رابردوو، ئەویش هەرزوو رازی بوو، بە حەماسەتەوە تەخویلی کردم، بە دڵخۆشیەوە داوای سەرکەوتنی بۆ کردم، منیش دەقیقەیەکم بە فیڕۆ نەدا، لەگەڵ گەڕانەوە خێرا بە بایەخەوە دەستم کردەوە بە کارکردن بە تایبەت لە نار کادیرە لاوەکان...))[٦٠٤]

ئیدریس بارزانی دوای نسکۆ لەلای کونسوڵخانەی ئەمریکیەکان لە تەورێز ئەو مەترسیەی راگەیاندووە، کە ئەگەر ئەمریکا بۆ فشار خستنە سەر ئێران لە بەرژەوەندی ئاوارەکان کارێك نەکەن مەترسی هەیە کەسانی دیکە دژی بنەماڵەی بارزانی بارودۆخەکە بقۆزنەوە[٦٠٥]، هەر لەو پێوەدانگەوە موحسین دزەیی لە دیزکی

٦٠٢- مەکدواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٦٦٣" شورش حاجی: الانفال الکرد، ص٢٤

٦٠٣- الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٢٤٥-٢٤٦

٦٠٤- البارزاني والحركة، ج٣/ ص٣٩٩

٦٠٥-- بە پێی ئەو راپۆرتەی قونسوڵخانەی ئەمریکا لە تەورێز کە بۆ باڵوێزخانەی خۆیان لە تاران لە ٢٠/٤/١٩٧٥ز ناردویەتی، لەویشەوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە واشنتن، لە سەر زاری ئیدریس بارزانی نوێنەری مستەفا بارزانی وتراوە، کە ئیدریس بارزانی لە ٨/٤/١٩٧٥ لە شاری نەغەدە کونسوڵی

۱۹۷٥/۳/۲۰ باس لە فەرمانی سەرووی خۆی دەکات بە شاردنەوەی چەك، دەڵێ: ((لە سەرکردایەتی زۆر بە نهێنی هەندێ چەکمان لەو شوێنانە شاردەوە کەس پێی نەزانێت...))[٦٠٦]

ئەم گوزارشتە ڕوونتر بەدیاردەکەوێ، کە هەندێك لە ئێران سەرقاڵی دامەزراندنەوەی (پ.د.ك) بوون، ئەمەش بە هۆی هەڵگرتنی چەك و تەقەمەنی لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو پارەیەی لە دارایی شۆڕشدا مابوو، ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەمانی پرنسیپی حیزبی و بەرنەفامی هەوڵدان بووە بۆ گۆڕینی (پ.د.ك) بۆ شێوازێکی دیکەی سەرکردایەتی کردن، هەر لەوبارەیەوە مەسعود بارزانی دەنووسێت: ((دیارە بە پێی ئەو بارودۆخە سەختەی ئەوکات، کارەکان لە ئێران بە نهێنی بۆ ڕێکخستنەوەی ئەو (پ.م) ئەنجام دەدرا، ئەمەش بە پێی ڕێککەوتنی عێراق و ئێران کارێکی تەواو قەدەغە بوو، ژمارەیەك ئەندامی (پ.د.ك) لە سەر ئەساسی ئەو ڕێککەوتنە و بە تاوانی ئەنجامدانی کاروچالاکی رادەستی عێراق کرانەوە، ئەویش کوشتنی...))[٦٠٧]، زیاتر ئەندامانی سەرکردایەتی کاتی روویان لە ئەورووپا و سوریا کرد، هەتا لەوێوە بتوانن کارەکانی ناوخۆ ڕێنومایی بکەن، لەگەڵ هەوڵدان بۆ ئامادەکردن و ناردنی مەفرەزەی (پ.م) بۆ ناوچە سنوورییەکانی عێراق- ئێران و عێراق- تورکیا[٦٠٨]

---

ئەمریکای دیوە، دەڕیڤشتووە: (...بەرهەڵستی کۆتایی هاتووە، خەڵك ڕەیبەرایەتی بارزانیان خۆش ناوێ، لەوانەیە هەرکەسێ بیەوێ دژی خانەوادەی بارزانی هەڵەکە بقۆزێتەوە...) بڕوانە: (دانشجولن پیرو امام، اسناد لانە جاسوسی – کوردستان، شمارە ۳۱، کردستان (۱)، ص٩٦)

٦٠٦- دزەیی: أحداث عاصرتها، ص٢٠٢

٦٠٧- البارزاني و الحركة، ج٣/ص٤٠٠

٦٠٨- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٤٨؛ البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/٤٠٠

لە سەرەتاوە مستەفا بارزانی لە ئێران لە ژێرچاودێری توندی دەزگای هەواڵگری (ساواك)دا بووە، لەگەڵ بەدیارکەوتنی تەواوی نیشانەکانی نەخۆشی شێرپەنجە، لە ژێر چاودێریی و مەرجی ساواك و ئیدارەی ئەمریکی دەرفەتیان پێدا بچێت بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی[609]. مەسعود بارزانی لەگەڵ چوو، بەڵام مستەفا بارزانی لەوێ هەوڵیدا دەنگی بگاتە بەرپرسانی ئەمریکی، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، لە ئەمریکا جموجۆڵی سیاسی ئەو لە چاودێری حکومەتی ئێرانی و هەواڵگری ئەمریکا دابووە[610]. ئەم چاودێریەش لە چوارچێوەی پابەندی هەردولادا بووە بە رێککەوتن لەگەڵ عێراق، کە هەتا ئەوکات پەیوەندی ئێوان بۆ فشارخستنە سەر بزاڤی نەتەوایەتی کورد لە عێراق هاوڕابووە.

تەنیا پێنج لە ئەندامانی (م.س)ی پێشوو لە دامەزراندنەوەی (سەرکردایەتی کاتی) بەشدار بوون[611]. سەرچاوەکان دامەزراندنی یەکەم کۆبوونەوەی دەگەڕێننەوە بۆ مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٥، کە ئەوکات بە نهێنی لە ئێران پێك هات بوو، بەڵام

---

٦٠٩-- البارزاني: البارزاني و الحركة، ج٣/ص٤٠١-٤٠٤" د. فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، ل٣٩٥

٦١٠- البارزاني: البارزاني والحركة، ج٣/ ص٤٠١-٤٠٣" الخراصان: التيارات السياسية، ص٢٢٧-٢٢٨

٦١١- ئەوانیش: (ئیدریس بارزانی و مەسعود بارزانی و سامی عەبدولڕەحمان: عەلی عەبدوڵلا، نوری شاویش) بوون، لە دامەزراندنی سەرکردایەتی کاتی هەردوو برا ئیدریس بارزانی و مەسعود بارزانی پشکی شێریان بەرکەوتبوو، لەگەڵ ئەوەدا کە ناگەینە یەکدەنگی تەواو لە سەر ناوی ئەندامانی سەرکردایەتی کاتی، بەڵام بەگشتی ئەم ناوانە زیاتر لە سەرچاوەکان دا ناویان هاتووە: جەوهەر نامیق، عارف تەیفور، کەریم سەنجاری، موحەممەد رەزا، ئازاد خەفاف، ئازاد بەرواری، غازی زیباری، وریا سەعاتچی، فازیل جەلال، عەبدولڕەحمان بینداری، کەمال کەرکوکی، شێرکۆی شێخ عەلی). بڕوانە: (الخرصان: التيارات السياسية، ص٢٢٤" فاتیح رسول: بنچینەی مێژووی بیلاکەی چەپ، ل٣٥٦" کرمانج گوندی: سی ساڵ خەبات و، ل٦٨" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٩٥)

یەکەم بەیاننامەی دامەزراندنی سەرکردایەتی کاتی لە ١٩٧٥/١٢/١٠ بلاوکراوەتەوە[٦١٢]، لە کاتێکدا سەرکردایەتی کاتی بەشی بنەڕەتی سەرکردایەتیەکەی لە ئێران بووە، کەچی ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەو بەیاننامەیە هێرشی زۆر کراوەتە سەر ئێران[٦١٣]

لە نیسانی ساڵی ١٩٧٦ یەکەم کۆنفراسی (پ.د.ك) سەرکردایەتی کاتی لە بەرلینی رۆژئاوا لە ئەڵمانیا بەسترا[٦١٤]. لەوێدا بە بەرچاو روونتر (سەرکردایەتی کاتی)یان دیاریکردو راپۆرتی سیاسی کۆنفراسیان بە دەنگی هەموان پەسندکرد[٦١٥]، لە ٩ی شوباتی ١٩٧٧ مستەفا بارزانی نامەیەکی بۆ سەرۆکی ئەمریکا (جیمی کارتر) نارد، لەوێدا واقیعی کوردستانو ئاکامەکانی رێککەوتننامەی جەزائیری روون کردبۆوە[٦١٦]، بەلام نامەیەکە بێ وەلام مایەوە.

(پ.د.ك) بە درێژایی سالانی ١٩٧٥ تا ساڵی ١٩٧٩ هەتا مستەفا بارزانی لە ژیاندا مابوو لە بیری دانانی سەرۆك دا نەبوو، سامی عەبدوڕەحمان وەکو سکرتێری سەرکردایەتی کاتی دانرابوو[٦١٧]، لە دوای روخانی رژێمی شا لە شوباتی ساڵی ١٩٧٩

---

٦١٢-بڕوانە: بەیاننامەی ناوبراو لە بەلگەنامەی ژمارە (١٠).

٦١٣- لەوێدا دەربڕینی وەکو: (الشاهانشاهي الخياني الرجعي في ايران.. الرجعية الايرانية_الحكم العميل في ايران..) بڕوانە: بەلگەنامەی ژمارە (١٠).

٦١٤- یوسفی: ثورة ایلول، ص٢٢٤. (الخرصان) باسی لەو حالە نەکردووە، بەلام دەلێ: لە مانگی ئاب ئەو کۆنفرانسە بەستراوە. بڕوانە: (التيارات السياسية، ص٢٣٤)

٦١٥- لەو کۆنفرانسە راپۆرتی سیاسی بە ناوی (گریق الحرکە التحرریە الکردیە) کە وەکو راپۆرتێکی سیاسیو رەخنە لە خۆگرتنو بەخۆداچوونەوەیە پەسند کراوە. بڕوانە: (یوسفی: ثورة ایلول، ص٢٢٤)

٦١٦- بەلگەنامەی ژمارە (١١)

٦١٧- سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص١٥٣

لە سەر زەمینەی کۆنگرەکانی پێشوو، کۆنگرەی نوێیەمی خۆی بەست، لەوێدا، سەرۆکی تازەی بۆ (پ د ك) دیاری کرد، دوای ئەوە ناکۆکی کەوتە ریزەکانی سەرکردایەتی، زۆربەی ئەوانەی کاتی خۆی لە دامەزراندنەوەی سەرکردایەتی کاتی دابوون، لە پێشەوەیان سامی عەبدوڕەحمان لە (پ د ك) کشانەوە[٦١٨]

(ی ن ك) لە ١٩٧٥/٦/١ لە دیمەشقی پایتەختی سوریا بە رەسمی دامەزراو بەیاننامەی دامەزراندنی دەرکرد[٦١٩]، دەستەی دامەزرێنەرانی ئەو ڕێکخراوە تازەیە پێشتر بە شێوازی جیا جیا لە شۆڕشی ئەیلول و لە ریزەکانی (پ د ك) کاریان کرد بوو[٦٢٠]، لە بەیاننامەی دامەزراندنی (ی ن ك)دا، کاریگەری سیاسی و دەروونی نسکۆی ئازاری ١٩٧٥و رەخنەگرتنی ئاراستەوخۆی لە سەرکردایەتی (پ د ك) پێوە دیارە، لەوێدا هاوکاری هەرەسی شۆڕشی کورد دابەش کردووە بۆ پیلانی شای ئێران و رژێمی عێراق و ئیمپریالزم و زایونی و کۆنەپەرستی، لەگەڵ سەرکردایەتی (پ د ك)، کە بە سەرکردایەتیەکی خێڵەکی و بۆرژوای دەستەوەستان بووی لە ئاست ئەو بەرپرسیاریەتیەی پێش ساڵی ١٩٧٥ کەوتبووە ئەستۆی دانابوو[٦٢١]

بەیاننامەی دامەزراندنی (ی ن ك) لە ئاستی جۆشدانی جەماوەری کاریگەری بیری چەپ و کاردانەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر وەکو پیلانێکی نێودەوڵەتی بە زەقی پێوە

---

٦١٨- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٥٨" کرمانج گوندی: سی ساڵ خەبات، ل١٠٩.

٦١٩- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٤٤" بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

٦٢٠- ئەندامانی دستەی دامەزرێنەر: (جەلال تاڵەبانی، د.کەمال فوئاد، فوئاد مەعسوم، عومەر شێخ موس، عادل موراد، عەبدولڕەزاق میرزا عەزیز) بوون. بڕوانە: (سەروەر عەبدولرەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل٧٠-٨٢" الحرصان: التيارات السياسية، ص٢١٨" فاتیح رسول: بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ، ل٢٥٧

٦٢١- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

دیاره[٦٢٢]. له ئاستی دەرەوەدا دوژمنکاری ئیمپریالزم‌و دژستایەتی وڵاتانی عەرەبی‌و هاوسۆزی بۆ کێشەی فەلەستین تێدا بەرجەستە بووە[٦٢٣]، ناتوانین ئەو بەیاننامەیە بە دوور وەربگرین لە ئەو کاریگەریە ناوخۆیی‌و دەرەکیانەی کە ئەو رێکخراوەی تێدا لە دایك بووە، خۆی بە دۆستی وڵاتانی سوشیالیزمی دەزانی، دیارە عێراق‌و ئێرانیش لە بەرەی هاوپەیمانی سەرمایەداری‌و دیکتاتۆری داناوە[٦٢٤]

له سەر ئاستی دەرەوە پەیوەندییەکانی (ی.ن.ك) لەگەڵ سوریاو لیبیا بووە، لەگەڵ ئەو دەوڵەتە عەرەبی‌و ناعەرەبیانە نەبووە، کە بەشداربوون لە پیلانی جەزائیر، لە واقیعدا هەتا روخانی رژێمی شا لە شوباتی ساڵی ١٩٧٩و تێکچوونی هاوکێشەکان هیچ پەیوەندیەکیان لەگەڵ ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەتدا نەبووە، لەوانەیە خوێندنەوەی دیکەشی بۆ بکرێت، کە ئەو دەوڵەتانە بەرژەوەندیان لەگەڵ ناوبژیوانی عێراق‌و ئێران بووە[٦٢٥]، مەبەستیان نەبووبێت لەگەڵ (ی.ن.ك)و هیچ باڵێکی ناو بزاڤی نەتەوایەتی کورد پەیوەندی دابمەزرێنن.

له نێوخۆدا (ی.ن.ك) وەکو شێوە بەرەیەك وابوو، بەڵام ئەو شێوە بەرەییەی لە رێنای کردبوو هەتا کۆتایی ئابو سەرەتای ئەیلولی ساڵی ١٩٧٧ لە واقیعدا بە رەسمی پێك نەهات[٦٢٦]

---

٦٢٢- بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

٦٢٣- بەڵگەنامەی ژمارە (٩).

٦٢٤- بەیاننامەی دامەزراندن لە بەڵگەنامەی ژمارە (٩)

٦٢٥- بۆ پەیوەندییەکانی (ی.ن.ك) بە دەرەوە بڕوانە: سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ل١٨٥-١٩٣

٦٢٦- ژمارەیەك لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر لە سەرەتای ئەیلولی ١٩٧٧ لە برادۆستی سەر بەپارێزگای هەولێر بۆ یەکەم جار لەگەڵ باڵەکانی کۆبوونەوە، لە میانی پێکهێنانی تەشکیلاتی

لە سوریا پێش دامەزراندنی (ی.ن.ك) ژمارەیەك پارتو ڕێکخراوی بچوکی دیکەی عێراقی لە چوارچێوەی بەرەیەك بە ناوی گردبوونەوەی نیشتیمانی عێراقی (التجمع الوطني العراقي) خۆیان ڕێکخستبوو[627]، لە پێش ڕێککەوتننامەی جەزائیرەوە پەیوەندی نێوان عێراقو سوریا تێکچووبوو، ئەمەش هۆکارێك بوو هەتا ئەو وڵاتە ببێتە شوێنی خەباتی سیاسی بەرهەڵستکارانی عێراقو کوردستانی دژ بە حکومەتی بەعس.

نسکۆی شۆڕشی کوردو هەڵوەشانەوەی (پ.د.ك) بەوەندە نەوەستا، کە (ی.ن.ك)و (پ.د.ك سەرکردایەتی کاتی)، پارتو دەستەو گروپی دیکە هاتە مەیدان، مەحمود عوسمان لەگەڵ هاوڕێکانی دەستەیەکیان پێك هێنا بە ناوی (پ.د.ك - لیژنەی

سەرکردایەتی) بێجگە لەو دوو ڕێکخراوە، (خەتی گشتی)یشی بۆ زیاد بوو، لەوێدا سەرکردایەتیو (م.س)و تەشکیلاتی سیاسیو عەسکەریان لە نێوان هەر سێ ڕێکخراو دابەش کرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل172)

627- گردبوونەوەی نیشتیمانی عێراقی (التجمع الوطني العراقي): لە سوریا لە ساڵی 1973 لە لایەن ژمارەیەك پارتو ڕێکخراوە عێراقی دامەزرابوو وەکو (حزب البعث العربي الاشتراكي- قيادة القطر العراقي، حشع - القيادة المركزية، الحركة العربية الاشتراكية، الحزب الاشتراكي، مؤتمر القوميـين) بە هاوکاریو پاڵپشتی سوریا پێك هاتبوو، زیاتر ئاراستەیان چەپو عەرەبی ناسیونالستی بووە، دروشمیان ڕوخانی ڕژێمی بەعس بووە لە عێراق، لە سەر ئەرزی واقیع چالاکی سیاسیو ڕێکخراوەیی بەرچاویان نەبوو. (ی.ن.ك) لە شوباتی 1976 لەو بەرەیە بووە ئەندام، هەڵوێستیان بەرانبەر کێشەی کورد ڕۆشن نەبوو، تەنانەت لە بەیاننامەی ئەو گردبوونەوەیە بە بۆنەی بەئەندامبوونی (ی.ن.ك) لە 11/2/1976 باس لە مافی کورد نەکراوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (سەروەر عەبدوڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل177-178" الحرصان: التيارات السياسية، ص725" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل65-66".

ئامادەکاری)[628]، گەرچی لە ناوەڕاستی ساڵی ۱۹۷۷ەوە لە پاڵ سەرکردایەتی (ی.ن.ك) گەڕانەوە کوردستانو بارەگایان دانا و بەشداری ناخۆشیەکانی سەرەتای شۆڕشی چەکداری کوردستانی دوای نسکۆ بوون، بەڵام جەماوەرو (پ.م)یان لێکۆنەبۆوە[629]. لە پاڵ کاروچالاکی سیاسیو پێشمەرگایەتی ئەو هەنگاوەی لیژنەی ئامادەکاری پێی بناسرێتەوە ئەو ئامیلکەیە بووە، کە شۆڕشی ئەیلول هەتا هەرەس دەخەنە بەر رەخنە، گەرچی زیاتر رەخساری راپۆرتێکی مەیدانی لە خۆگرتووە، زۆر لایەنی شاراوەی شۆڕشی ئەیلولی شی کردۆتەوە.

لە ۱۱ی ئەیلولی ساڵی ۱۹۷۵ لە شاری کەرکوك ( پارتی سۆسیالستی کورد "پاسۆك") دامەزرا[630]، دەرێژەپێدەری بیروباوەڕی (پارتی ژیانەوەو ئازادیو یەکیەتی کورد -کاژیك) دادەنرێ[631]، پاسۆك پارتێکی نەتەوەیی رادیکاڵی بووە، قەناعەتی بە خەبات هەبووە لە پێناو ئازادیو یەکگرتنەوەو سەربەخۆیی کوردستانو بە دیهاتنی مافی چارەنووس بۆ گەلی کورد لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا[632]

---

۶۲۸- بێجگە لە مەحوە پێك هاتبوو لە "عەدنان موفتیو قادر جەباریو شەمسەدین موفتی". بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل۱۰۲)

۶۲۹- بڕوانە: (الحزب الدیمقراطي الكردستاني. اللجنة التحضیریة، تقیم مسیرة الثورة الكردیة)" مبارزه ملی و مبارزەطبقاتي ب۱، ایران – انتشارات اسماعیل شریف زاده، ص۱۵۵-۲۵۵" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل۹۷)

۶۳۰- کارە ئەمین: ناسیونالزمی کوردی، ل۶۰" کرمانج گوندی: سی۲ ساڵ خەباتو وڵاتێکی وێران، سوید۱۹۹۰، ل۷٤

۶۳۱-کامیل ژیر، کوردایەتیو سەربەخۆیی، ل۶۰

۶۳۲- بۆ زانیاری زیاتر لە سەر بیروباوەڕی پاسۆك بڕوانە: (کارە ئەمین: ناسیونالزمی کوردی، ل۶۱-۶۳)

(پاسۆك) پێش ئەوەی وەكو هێزێكی چەكداریو سیاسی بناسرێ وەكو رەوتی ناسیونالستی رادیكاڵی ناسرابوو، ئازاد مستەفا[٦٣٣] ئەندامی دامەزرێنەرو سەرۆكی پاسۆك بوو، سەركردایەتی خوێندەوارو بیریاری بە توانایان لێكۆڵەبۆوە، ئەوانی پێشوو كە (كاژیك)یان دامەزراندبوو بەشداری دامەزراندنەوەو جۆشدانی پاسۆكیان نەكرد. پاسۆك لە بزاڤی چەكداری شۆڕشی كوردستان، بە هێزێكی بچوك مایەوە، داواكاری پێكهێنانی بەرەیەكی كوردستانیان خستە بەردەم لایەنە سیاسیەكانو بە گرەنتی سەركەوتنیان دەزانی، پاسۆك لە سەرەتاوە هەوڵیدا بۆ دابینكردنی تەبایی لە ناو پارتو لایەنەكانی كوردستانو لەو بارەیەوە دەیویست خۆی بێلایەن راگرێت، بەڵام تا سەر نەیتوانی لەو بێ لایەنیە بپارێزێت[٦٣٤]

(حشع) لە ناو بەرەی نیشتیمانیدا مایەوە، بە بۆنەی هەرەسی شۆڕشی كوردو پیلانی جەزائیر پیرۆزبایی لە حكومەتی بەعس كرد[٦٣٥]، گوایە ئەوە سەركەوتنی بەرەی سۆشیالیزمو پێشكەوتنە بە سەر ئیمپریالزمو كۆنەپەرستی، وای دەبینی بەعس

---

٦٣٣- ئازاد مستەفا: لە ساڵی ١٩٤٨ لە بارزان لە دایك بووە، لە ١/٩/ ١٩٧٥ لەگەڵ هاوڕێكانی لە كەركوك (پارتی سۆشیالستی كورد – پاسۆك)یان دامەزراند. لە ساڵی ١٩٧٧ لە لایەن حكومەتی عێراقەوە بەدیل گیراوەو لە لێبوردنە گشتیەكەی ساڵی ١٩٧٩ ئازاد كراوە، گەڕاوەتەوە ناو حیزبەكەی لە شاخ، لە ساڵی ١٩٨٧، لە ساڵی ١٩٨٩ كۆچی دوایی كردوە. بڕوانە: (كارە ئەمین: ناسیونالزمی كوردی، ل٦٠)

٦٣٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (المرصان: التیارات السیاسیة، ص٢٨٦-٢٨٨" كاوە ئەمین: ناسیونالیزمی كوردی، ل٦٠-٦٣).

٦٣٥-جەمال نەبەز: ئیدۆلۆژیای هوردە بورژوای ماركسی كورد، ل٤٩" كرمانج گوندی: سی ساڵ خەباتی، ل٨٢-٨٣" سەروتاری رۆژنامەی (الطریق الشعب) لە ژێر ناونیشانی: (الحزب الشیوعي العراقي یدین التمرد المسلح الیمیني الرجعي المنهار في كردستان..)، ژمارەی رۆژی ٢٧/٤/١٩٧٥.

یەکلادەبێتەوە بۆ پڕۆژەی ئاوەدانی و قۆلکردنەوەی سۆشیالیزم و هاوبەشی کاراتری (حشع) لە ناو دامەزراوە حکومەیەکاندا[٦٣٦]، لە بلاوکراوەکانی خۆیدا وەکو بلاوکراوەکانی سەر بە حیزبی بەعس بڕیارەکانی لیبووردنی بۆ خۆ رادەستکردنەوەی (پ م) گەڕانەوە بۆ ڕیزی حکومەت بلاودەکردەوە[٦٣٧]، لەگەڵ هەموو ئەو شاڵاوانەی دەکرانە سەر سەرکردایەتی کورد و پێدا هەڵدان بە دەستکەوتەکانی بەعس بەشداربوون[٦٣٨] بەلام بە پێچەوانەوە بەعس بە لە خۆیایی بوونەوە کەوتە تەنگ پێهەڵچنین بە شیوعیەکان، بە شەرعیەتی شۆڕشگێڕی بالادەستی تاک حیزبی و (حزب القائد)ی بۆ خۆی پتەو دەکرد، سەدام حوسێن جێگری سەرۆک کۆماری عێراق لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا لە ١٨ی تەموزی ١٩٧٨ز بە روونی بیانوو زەمینەی بۆ دیکتاتۆریەتی بەعس هێناوەتەوە، کە زیاتر مەبەستی بالادەستی بووە لە ناو (بەرە)، ئەوکات (حشع) دووەم حیزبی بنکە فراوانی ناو (بەرە) بووە[٦٣٩]. بە مانی دۆستایەتی و

---

٦٣٦-بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (کریم احمد داود، المسيرة الثورية للبلاد وعملية انجاز وتطوير الحكم الذاتي، صحيفة (الفكر الجديد)، ژمارە ١٦٩ی ٦/١٢/١٩٧٥" کرمانج گوندی: ناسیونالزمی کوردی، ل٨٢-٨٣)

٦٣٧- بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە: طريق الشعب، ژمارەکانی (٤٥٦ ل ٢٠/٣/١٩٧٥)و (٥١٥ل ٢٠/٥/١٩٧٥)

٦٣٨- بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە: (طريق الشعب) ژمارەکانی(٤٥٩، ٢٣/٣/١٩٧٥) (٤٦١، ٢٥/٣/١٩٧٥) (٤٦٢، ٢٧/٣/١٩٧٥)

٦٣٩-لەوێدا سەدام حوسێن دەڵێ: (ڕاستی یەکەم ئەوەیە شۆڕشی گەورەی تەموز لە ١٧ و ٣٠ی تەموزی ١٩٦٨ بەتەنیا "حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی" ئەنجامی دا، بە هاوبەشی هیچ لایەنێکی عەرەبی و بیانی نەبووە، حیزبی بەعس سەرکردایەتی کردووە... هەتا لە ساڵی ١٩٧٣ لە سەر ئەو بنەمایە ڕۆیشتووە، ئینجا بەرە دامەزراوە، حیزبێکی شۆڕشگێڕی وەکو بەعس بە تەنیا شۆڕشی کردووە..بە تەنیا بەرەنگاری مەترسیەکان بۆتەوە، بە تەنیا بەرەنگاری ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە بۆتەوە...، بۆیە تێڕوانینی حیزب

هاریکاری حکومەتی عێراق لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت بەلای (حشع)یەوە هێندە گرنگ بوو، هاریکاری‌و سازشێکی لای شیوعیەکان بۆ حکومەتی بەعس ڕەوا کردبوو[٦٤٠]. ڕێکخراوە پیشەیی‌و سەندیکاکانی خوێندکاران‌و مامۆستایان‌و کرێکارانی هەڵوەشاندەوە لەگەڵ هی بەعس تێکەڵ بە یەکتری کردن[٦٤١]. (حشع) لێی قەدەغە کرابوو ڕێکخراوی پیشەیی تایبەت بە خۆی هەبێت، (بەرە) دەسەڵاتی ئەمار کۆبوونەوەی ڕوکەشانەی بۆ مابۆوە، دەسەڵاتی کردەیی لە حکومەت‌و (بەرە) لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ەوە کۆنترۆڵکرابوو[٦٤٢]. لە ئەندامانی (حشع) قەدەغە کرا ڕەخنە لە دامودەزگاکانی حکومەت بگرن، ئەندامانی (حشع) لە ئەنجومەنی یاسادانانی ئۆتۆنۆمیە ڕوکەشەکەی بەعس لە سەر ڕەخنەگرتن دەرکران[٦٤٣] بێجگە لە حیزبی بەعس قەدەغە بووە لە ناو سوپاو دامەزراوەکانی ناوخۆ ڕێکخستن هەبێت[٦٤٤]، بە تاوانی ئەنجامدانی کاری ڕێکخستن لە ناو سوپادا حکومەت بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ (حشع) بکات، (٣١) شیوعی لە سێدارەدا[٦٤٥]. لە ساڵانی ١٩٧٥ بۆ ١٩٧٩ز بە تاوانی شیوعی بوون سەدان ئەندامی زیندانیکردن‌و کاروچالاکی ئەوانی

---

ئەوە بووە دەبێت ڕۆڵی سەرکردایەتی کردنیش بە تەنیا بۆ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بێت....)
بڕوانە: (نص الكامل لوقائع للمؤتمر الصحفي، ص٩-١٠)

٦٤٠- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل٢٢

٦٤١- ئەلیوت عیسا: خوێندنەوەی بەعس، ل٦٠

٦٤٢- ئەلیوت عیسا: خوێندنەوەی بەعس، ل٦٩° الحرصان: التيارات السياسية، ص١٦٢

٦٤٣- فاتیح ڕسول: لە ناو کاروانێکی دوورو درێژدا، ل٢٢٧

٦٤٤- ئەلیوت عیسا: خوێندنەوەی بەعس، ل٦٦° تريب: صفحات من تأريخ العراق، ص٢٩٠

٦٤٥- بهاءالدين نوري: مذكرات، ص٣٤٩° ڕاپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، حوزەیرانی ١٩٨٢، دار الثقافة و النشر الكردية، سلسلة الكتب السياسية المترجمة (٧٤)، ل٩٥

خستبووە ژێر چاودێریەوە[٦٤٦]، زیاتر ئەندامانی (م.س)ی کە زۆرینەی عەرەبەکان بوون لەلایەن ئەندامانی هەرێمی کوردستانی ئەو حیزبەوە تاوانبارکراون لە سەر ئەو سازشە[٦٤٧]

بەهائەدین نوری لە بابەت هەڵوێستی (حشع) دەڵێ: ((لە هەرەسی بزاڤی کوردیەوە دوو تێڕوانین لە ناو حیزب گەڵاڵە بوو: یەکەمیان، ئەگۆ تاکامی هەرەسی کلکایەتی "بەکرێگیراو" بووە، وەکو گوزارشتیان لێدەکرد، سەرکەوتنی مێژوویە بۆ دەسەڵاتی نیشتیمانی و پێشکەوتووخوازیو سوشیالیزمی. دووەمیان، ئەوە تێڕوانینە زاڵەی ناو زۆربەی بەرپرسانو کادیرانی هەرێمی کوردستانی حیزب ئەوە بووە، کە هەرەسی بزاڤی چەکداری کورد فراوان دەبێت بۆ هەرەسی جوڵانەوەی شیوعیەتو هەموو جوڵانەوەی نیشتیمانی))[٦٤٨]. هەر لەو بارەیەوە نوری دەڵێ: ((لە ئەمڕۆژی ساڵی ١٩٧١ سەرکردایەتی (حشع) یەك دەنگ نەبووە لە بەشداری کردن لە بەرە))[٦٤٩]

هەموو لەدەبیاتی ئەو سەردەمەی (حشع) وەکو دووەم حیزبی ناو بەرە لە دوای بەعس جەختکردن بووە لە سەر هاوپەیمانیەتی لەگەڵ بەعسو تاوانبارکردنی بزاڤی کوردستان بە نەتەوەپەرستیو دەرەبەگایەتیو بەکرێگیراوی ئیمپریالزم، لە بەرانبەردا

---

٦٤٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (بهاءالدین نوري: مذکرات، ص٣٤٨-٣٥٠)

٦٤٧- لەو بارەیەوە بڕوانە: (فاتیح رسول: لە ناو کاروانێکی، ل٢٢٥" دیداری بەهائەدین نوری، لە ٢٠٠٦/٩/١٨، لە سلێمانی)

٦٤٨- مذکرات، ص٣٢٧

٦٤٩- بهائەدین نوری دەڵێ: (لە کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی دوای هێنانو بردنو سووربوونی داکۆکیکاران "بە جیاوازی یەك دەنگ" سەرکردایەتی حیزبی شیوعی چووە ناو بەرە). دیداری ناوبراو لە رۆژی ٢٠٠٦/٩/١٨، سلێمانی.

ڕێگای دروست هاریکاری بەعس و شۆڕشی ١٧ی تەمووزی پێشکەوتووخواز بەرەو سۆشیالزم[٦٥٠]، بۆ هەڵوێست بوون بەرانبەر سیاسەتی ڕاگواستن و سەرکوتکردنی کوردستان[٦٥١]

(حشع) لە سەر متمانە بوون بە هاوپەیمانیەتی بەعس و یەکیەتی سۆڤیەتیدا زیانی لێکەوت، لە کوردستان لە حیزبێکی بنکە فراوانەوە بچوك بۆوە، لە بەرانبەر ئەو ناڕەحەتیەی (حشع) بەدەست حیزبی بەعسەوە چێشتی یەکیەتی سۆڤیەت هیچ فشارێکی نەخستە سەر عێراق[٦٥٢]. لەکاتێکدا یەکێك لەو ڕەخنە توندانەی بەعس لە دوای هەڵوەشانەوەی بەرە لەگەڵ (حشع) لێی دەگرت، وەرگرتنی ڕێنمایی (حشع) بوو لە یەکیەتی سۆڤیەت.[٦٥٣] ئەمە سەرەڕای تاوانبارکردنی (حشع) بە هاوسۆزنەبوون لەگەڵ مەسەلە عەرەبیەکان بە تایبەت مەسەلەی فەلەستین، مەترسی پەرەسەندنی کێشەی ئایدۆلۆژی لە عێراق و بایەخنەدانی (حشع) بە یەکیەتی عەرەبی و چەندان تاوانی دیکە[٦٥٤]

(حیزبی بەعس) قەناعەتی بە هاوبەشی نەبوو لە دەسەڵاتدا، هاوپەیمانیەتی لەگەڵ (حشع) لە سەر ئەو مەبەستە نەبوو، کە (حشع) لێی تێدەگەیشت، لەوکاتەی

---

٦٥٠- عزيز محمد، تحولات نوعية عميقة في الميادين السياسية و الاقتصادية و الاجتماعية، مجلة، الثقافة الجديدة، عدد(٨٦) تشرين أول ١٩٧٦" مهدي حافظ، حزب البعث العربي الاشتراكي يقود تغيرا ثوريا في الحياة السياسية و الاجتماعية في البلاد، مجلة الثقافة الجديدة، عدد (٥٨)، ايلول ١٩٧٦.

٦٥١- ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تەبعیس، سلێمانی ١٩٩٩، ل٩٨-٩٩

٦٥٢- نەوشیروان مستەفا : پەلەپەکان، ل٢٩-٣٠

٦٥٣- ئەلیوت عیسا: خوێندنەوەی بەعس، ل٦٦" ڕاپۆرتی ناوەندی نوێیەم کۆنگرەی هەرتمانە، ل٨٠-٩٥.

٦٥٤- ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیس، ل٩٨-٩٩" ڕاپۆرتی ناوەندی نوێیەم کۆنگرەی هەرتمانە، ل٨٠-٩٥

پێویستی به هاوپەیمانیەتی(حشع) نەما، لە هاوپەیمانیەتی سۆڤیەتیش خۆی گران کرد[655]، چونکە هاوپەیمانیەتی لەگەڵ (حشع)ی بەرەنجامی هاوپەیمانی (عیراقی – سۆڤیەتی) بووە.

دەزگاکانی ساواکی ئێرانی لە بەتاوانی خۆڕێکخستنەوە ژمارەیەك لە چالاکوانی (پ.د.ك) گرت، (ی.ن.ك)یش بە لە دەستدانی ژمارەیەك ئەندامی سەرکردایەتی (کۆمەڵەی مارکسی لنینی کوردستان) کە هیوای زۆری لە سەر هەڵچنیبوو، لەوکاتەی ڕێگەی سنووری ئێرانیان گرتبووەبەر بۆ ئەوەی پەیوەندی بە دەرەوە بکەن، ئێران پێی زانین و هەموویانی گرت و رادەستی حکومەتی عیراقی کردنەوە، ئەویش لە ۱۹۷٦/۱۱/۲۱ ژمارەیەك لەئەوانی لە سێدارەدا، ڕێکخستنەکانی ئەو ڕێکخراوە کەوتنە بەر شاڵاوی گرتن و زیانی کوشندەیان بەرکەوت[656]

(پ.د.ك) بەشێکی کاری سیاسی خۆی گواستەوە ئەورووپا بۆ دروستکردنی شۆڕشی چەکداری پشتی بە ناوارەکانی ئێران دەبەست، هەتا ڕوخانی شا کاری سیاسی لە ئێران ئەستەم بوو، یوسفی لەو بارەوە دەنووسێ: ((ماوەی مایسی ۱۹۷٦ هەتا سەرکەوتنی گەلانی ئێران لە ۱۹۷۹ قورسترین و مەترسیدارترین و تاڵترین ماوەی تەمەنی شۆڕش بووە))[657]، لە چاو ئەو چالاکیانەی (پ.د.ك) هەیبوو لە ناو ئێران بە تایبەت لە دوای دروستکردنەوەی مەفرەزی چەکدار، جۆرێك لە چاوپۆشینی ئێران هەستی پێدەکرێت، لەوانەیە بەشێکی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە ئێران نەیویستووە بە تەواوی بزاڤی چەکداری لە کوردستانی عیراق لە دەست ئێران دەربچێت، لەبەرانبەردا

---

٦٥٥-ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە ۳۱۲، ۱۵/٤/۱۹۷٦

٦٥٦- بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا : لە کەناری دانوبەوە، ل٤٨، ۱۲۷)

٦٥٧- یوسفی: ثورة ایلول، ص۲۲٥

(ی.ن.ك) زیاتر ئاراستەی چەپی هەبووە[٦٥٨]، دەشێت ئێران ویستبێتی فشاری بخاتە سەر هەتا ریزەكانی جولانەوەی كوردستان پەرت بێت[٦٥٩].

(ی.ن.ك) لە لایەن لیبیاوە پشتیوانی لێكراوە، هاوكاری بۆ ناردووە[٦٦٠]، سووریاش هاوكاری مادی و لۆجستی (ی.ن.ك)ی كردووە، شوێنی دامەزراندن و خۆرێكخستن و چالاكی راگەیاندن و سیاسی ئەو رێكخراوە بووە، لەگەڵ دروستكردنەوەی مەفرەزەی چەكدار بۆ ناو كوردستان، چونكە ئەوكات ناكۆكی سیاسی و گرفتی ئاوی فوراتی هەبووە لەگەڵ عێراق[٦٦١]. یەكلاییبوونەوەی عێراق بۆ بەرەبەرەكانی سووریا یەكێك بووە لە هۆكارەكانی بە كۆتایی هێنانی ناكۆكی لەگەڵ ئێران، لەو حاڵەتەش حكومەتی سووریا دریغی نەكردووە لە هاوكاری هێزە ئۆپۆزسیونەكانی دیكەی دژ بە حكومەتی عێراقی.

(ی.ن.ك) لە یەكەم بەیاننامەی خۆیدا لە ئەدەبیاتی دواتر زۆر جەختی كردۆتە سەر پەیوەستكردنی كێشەی كورد لەگەڵ كێشەی عەرەبی و داكۆكیكار لە مافی گەلی فەلەستین، هێرشكردنە سەر ئەمریكاو ئیسرائیل و شا، لەگەڵ ئاسایشی كەنداو و نیشاندانی عێراق لەوەی دژی خواستی گەلی عەرەبیە[٦٦٢]. ئەمە لە كاتێكدا هەموو ئەو حیزبە بچوكانەی سووریاو وڵاتانی عەرەبی دژی عێراق كە لە گردبوونەوەی نیشتیمانی عێراقی خۆیان رێكخستبوو لەلایەن سووریاوە پشتیوانیان لێدەكرا، لە كاتی

٦٥٨- ئەوشیروان مستەفا: لە كەناری دانوبەوە، ل٩٤

٦٥٩-هەمان سەرچاوە، ل١٨٩-١٩٠

٦٦٠- هەمان سەرچاوە، ل٧٥

٦٦١- بۆ زیاتر زانیاری لە سەر پەیوەندییەكانی (ی.ن.ك) بڕوانە: (سەروەر عەبدورەحمان: یەكێتی نیشتیمانی كوردستان، ل١٨٥-١٨٩)

٦٦٢- بڕوانە: بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ك) لە بەڵگەنامەی ژمارە (٩)

به ئەندام بوونی (ی.ن.ك)یش هەڵوێستی روونیان لە مەڕ کێشەی کورد لە عێراق نەبووەو حکومەت کۆدەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ز بە حکومەتی نیشتیمانی ناسیوە[٦٦٣]

سەرکردایەتی کاتی (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) لەوەدا هاوبەش بوون، کە هەردووکیان پەیوەندیان لەگەڵ حکومەتی سوریا باش بووە، لە رێگەی سوریاوە توانیویانە پەیوەندی بە دونیای دەرەوە بکەن، بەڵام تورکیا بۆ دژایەتی بزاڤی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی باشوور لەگەڵ عێراقدا هاریکار بووە. لە ساڵی ١٩٧٨ لەگەڵ عێراق رێککەوتننامەیەکیان مۆر کرد، بە پێی ئەو رێککەوتننامەیە سوپای تورکیا دەیتوانی سنووری عێراق ببەزێنێت بۆ راوەدوونانی شۆڕشگێڕانی کورد[٦٦٤]، لە سەر ئاستی حکومەت هیچ کام لە دەوڵەتانی ئەورووپیی و بەرەی سۆشیالیزمی رۆژهەڵات هاوکاری بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان نەبوون[٦٦٥]، بەڵام ئەورووپا وەکو وڵات نەك وەکو پاڵپشتی حکومەتەکان بۆ بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان بە گشتیی و سەرکردایەتی هەردوو حیزب شوێنی لەباربووە بۆ پەیوەندیکردن بە جالیەی کوردییەوەو لەوێوە کاروچالاکی سیاسیی و راگەیاندنیان ئەنجام داوە، هەموو لایەنە سیاسیەکان سوودیان لە وڵاتانی ئەورووپیی وەرگرتووە[٦٦٦]

لە رووی راگەیاندنەوە لە ساڵی ١٩٧٦ بەدواوە کۆمەڵێك بڵاوکراوە لەلایەن پارتو رێکخراوە کوردییەکانەوە دەرچوو، کە رۆڵی هەبووە لە پاڵ خەباتی سیاسیی و دواتر چەکداری بۆ ئاشنا کردنی کورد لە ناوەوەو دەرەوە بە شۆڕشو گەیاندنی بارودۆخی

---

٦٦٣- بۆ ئەو بەیاننامەیە بروانە: (الحرصان: التيارات السياسية، ل٧٢٥

٦٦٤- مەکدواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٧١" ش.ج.مەکۆیی و ئەوانی تر: کوردستانی هاوچەرخ، و:گوشاد حەمە سەعید، هەولێر٢٠٠٥، ل٥٤

٦٦٥- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل١٦٨

٦٦٦- هەمان سەرچاوە، ل٥٧

کوردستان لە دوای نووشستی شۆڕش، وەکو: (الشرارە)و (رزگاری)و (خەبات)و هەروەها زنجیرەیەك راپۆرتی تایبەت بە باروودۆخی کوردستانو قۆناغی بزاڤی شۆڕشی کوردستان، بەڵام ئەو بڵاوکراوانە لەگەڵ ئەوەدا بۆ زیندووکردنەوەی گیانی شۆڕشگێڕیو ناساندنەوەی قۆناغی تازەی بزاڤی کورد بە سوودبوون، بەڵام درێغیان نەکردووە لە جۆشدانی گیانی ناکۆکی ریزەکانی شۆڕشی کوردستان[٦٦٧]

لەگەڵ سەرهەڵدانەوەی پارتو رێکخراوەکان شەڕی راگەیاندن لەبەرانبەر یەکتری دەستی پێکرد، ئەوانەی (ی.ن.ك)یان لە ١/٦/١٩٧٥ دامەزراند[٦٦٨]، لەگەڵ ئەوانەی سەرکردایەتی کاتی (پ.د.ك)یان دامەزراند[٦٦٩]، بە ناکۆکیو شەڕی راگەیاندن دەستیان پێکرد، هەریەك لە دوو هێزە بە رەوایان نەدەزانی هێزی بەرانبەرو هیچ

---

٦٦٧- وەکو: نامیلکەی(الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟)و (پارتی دیموکراتی کوردستان ریبازی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد، راپۆرتی سیاسی سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان، پەسندکراوی کۆنفرانسی (١١- ١٥) ئابی ١٩٧٦).

٦٦٨- لە بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ك) دوو خاڵ بە روونی بەدیار دەکەون. یەکەمیان (ی.ن.ك) پێی وایە سروشتی سەرکردایەتی عەشائیری (پ.د.ك) بەرپرسیارە لە هەرەسی شۆڕشی کورد. دووەمیان، دامەزراندنی (ی.ن.ك) وەڵامدانەوەی دروستی ئەو بۆشاییە دەبینێت کە سەرکردایەتی (پ.د.ك) لە ساحەی خەباتی کوردستان دروستی کرد. بڕوانە: بەیاننامەی ناوبراو لە بەڵگەنامەی ژمارە (٩)

٦٦٩- سەرکردایەتی کاتی (پ.د.ك) پێی وابوو، دامەزرێنەرانی (ی.ن.ك) درێژەپێدەری ئەو باڵەی تری (پ.د.ك)ن، کە ساڵی ١٩٦٤-١٩٧٠ لە مستەفا بارزانی جیا بوونەوە، بۆیە جەختیان کردبووە سەر دوو خاڵ لەوانە: رێککەوتننامەی جەزائیر وەکو پیلانی دەولی هۆکاری سەرەکی هەرەسی شۆڕش بووە، سەرکردایەتی (پ.د.ك) توانای درێژەدان بە خەباتی لە دەست نەدا بوو، بەڵام جەلال تالەبانیو هاوڕێکانی ئەوەیان بە فرسەت زانیوە وەکو بەدیلی (پ.د.ك) خۆیان بێنە پێشەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: بەیاننامەی لقی ئەورووپای (سەرکردایەتی کاتی)، الحرصان: التيارات السياسية، ص٦٩٨

هێزێکی دیکە لە کوردستان دروست ببێت[٦٧٠]، ئەمەش سەرەتاییەکی ترسناک بوو، بۆیە لەگەڵ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٦ شەڕی ناوخۆی لێکەوتەوەو بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستانی لەو قۆناغە تاڵەدا بە ئاقارێکی ترسناکدا برد.

لە یەکەم بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ك)دا هاتووە: ((ڕووداوەکان ئەوەیان سەلماند، کە سەرکردایەتی عەشائیری بۆرژوازی ڕاستڕەو و سازشکار، نوشستی هێناوەو دەستەوەستانە لە سەرکردایەتی بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد...))[٦٧١]، لەبەرانبەردا (پ.د.ك سەرکردایەتی کاتی) پێی وابووە، (ی.ن.ك) لە ڕکابەرایەتی ئەوان دروست بوون بۆ جێگرەوەی سەرکردایەتی بزاڤی کوردایەتی لە کوردستان، کە لە واقیعدا نەیاندەویست لەو بارەیەوە ڕکابەریان هەبێت و قەناعەتیان بە پارتی سەردەستە هەبووە[٦٧٢]

دوو لەتبوونی سەرکردایەتی جووڵانەوەی سیاسی و چەکداری کوردستان لە نیوەی دووەمی حەفتاکان بەرئەنجامێکی دیکەی نوشستی شۆڕشی ئەیلول بووە.

---

٦٧٠- حەبیب موحەممەد کریم: بەشداری لە دامەزراندنەوەی سەرکردایەتی کاتی نەکردووە، بە دامەزراندنی "ی.ن.ك" دەڵێ: (...لەو تەنگژەیەدا ڕەوتی سیاسی تازەی دژ دامەزران.. یان.. لە دوای هەرەس هەندێ مشك لە کون دەرچوون..). بڕوانە: (حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص١٥٢- ١٦١)

٦٧١- ئەو جۆرە دەربڕینە لە شوێنی تری بەیاننامەکە هەیە بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: دەقی بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ك) لە بەڵگەنامەی ژمارە (٩)

٦٧٢- لە بەیاننامەی کۆتایی ئازاری ساڵی ١٩٧٧ سەرکردایەتی کاتی (پ.د.ك)ی ئەورووپا، بە ڕوونی باوەڕ بە مەسەلەی پارتی سەردەستە بەدەرەکەوێ. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الخرسان: التيارات السياسية، ص٦٩٨-٦٩٩)

سەرەڕای هەوڵەکان لە سوریاو ئەورووپا بۆ بە یەکگەیاندنی هەردوو پارتی ناکۆک، هاوکات لە نێوان فەرماندە مەیدانیەکانی هەردوولاش لە کوردستان لەو جۆرە هەوڵانە هەبووە[٦٧٣]. لە دەرەوەش مەسعود بارزانی لە سەر داوای (حیزبی بەعس)ی سووریا سەردانی سوریای کرد، لەوێدا لەگەڵ جەلال تالەبانی بۆ پاراستنی تەبایی نێوان هەردوولا گەیشتنە ئاکام، بەڵام دواتر ئیلتیزامیان پێوە نەکرد[٦٧٤]، هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ جەلال تالەبانی لە ئەورووپا لەگەڵ سامی عەبدوڕەحمان بۆ لێك نزیکبوونەوە کۆبوونەوە[٦٧٥]، بەڵام ئەو هەوڵانەش بێئاکام بوو.

لە مانگەکانی مایس و حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٦ز مەفرەزەی چەکدار بۆ بەگژاچوونەوەی ڕژێمی بەعس دروست کرا، وازنەهێنانی حکومەتی عێراق لە پێشێلکردنی مافە سەرەتایەکانی میللەتی کوردو سیاسەتی ڕاگواستن و کاولکردن و چەوسانەوەو هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ناسنامەی خەڵکی کوردستان، هۆکاری بابەتی و بنەڕەتی بوون بۆ دووبارە بەرەو پیرەوەچوونی کورد بۆ بانگەوازی خەباتی چەکداری و بەرەنگاری مەیدانی لە شاخەکانی کوردستان، بەڵام لە پاڵ ئەو سەرەتایەدا پەنابردنە بەر چەك بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکی سیاسی و پێشبڕکێ لە سەر زەعامەتی شۆڕشی کوردستان لاپەڕەیەکی ڕەشی ئەو قۆناغە هەستیارە بووە، بەرئەنجامێکی دیکەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر بووە لە سەر کورد، چونکە وەکو بەدەردەکەوێ سەرکردایەتی پارت و ڕێکخراوە سیاسیە کوردییەکان کە سوریایان کردبووە بەدیل بۆ پەیوەندی کردن

---

٦٧٣- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان، ل١٦٦-١٦٧" الحرصان: التيارات السياسية، ص٣٥٦-٣٥٨)

٦٧٤- صلاح الحرصان: التيارات السياسية، ص٣٥٧" علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص١٥٢

٦٧٥- صلاح الحرصان: التيارات السياسية، ص٣٥٦-٣٥٧" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٥٨

بە دەرەوە، شەڕی (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) لە سەر كۆنترۆلكردنی ئەو ڕێگایە بووە، هەتا لەو گەمارۆدانەی ئێران خۆ دەربازبكەن، كە لە سەر ئەساسی ڕێككەوتننامەی جەزائیر بە سەر بزاڤی كورددیدا سەپابوو.

دەستەی دامەزرێنەری (ی.ن.ك) لە كۆبوونەوەكانی خۆی لە ١٩٧٦/٥/٢٣ بڕیاری ناردنی یەكەم وەجبە پێشمەرگەیدا بۆ كوردستانو داوای لە ڕێكخستنەكانی ناوخۆی لە هەردوو باڵەكەی (ی.ن.ك) كردبوو مەفرەزە بنێرنە شاخ[٦٧٦]، كە پێشتر لە دەرەوەی عێراق پەیوەندیان بە دەستەی دامەزرێنەرانی (ی.ن.ك) كردبوو[٦٧٧]، دواتر لەگەڵ پاراستنی ناوو تەشكیلاتی خۆیان وەكو بەرەیەك بە ناوی (ی.ن.ك) پێكەوە كۆبوونەوە[٦٧٨]

سەركردایەتی كاتی لە دوو شوێنەوە مەفرەزەیان ناردەوە كوردستانی عێراق، یەكەمیان، لە بەرەی بادینان لە سنووری توركیاو عێراق، ئەوەی دیكە لە سنووری ئێرانو عێراق[٦٧٩]. لە پاڵ ئەو دوو هێزە (پاسۆك) بەشداری ڕەمزی هەبووە.

سەرژمێری دروست لە ساڵی یەكەمی دەستپێكردنەوەی شۆڕشی چەكداری لە بەردەستدا نییە لە سەر ژمارەی (پ.م)، لە سەرەتای ئەیلولی ساڵی ١٩٧٧ (ی.ن.ك)

---

٦٧٦- لە بارەی وردەكاریەكانی دەستپێكردنەوەی خەباتی چەكداری لە لایەن (ی.ن.ك)ەوە بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: لە كەناری دانوبەوە، ل٨٧" سەروەر عەبدوڕەحمان: یەكێتی نیشتیمانی كوردستان، ل١٢٢-١٤٢)

٦٧٧-نەوشیروان مستەفا: لە كەناری دانوبەوە، ل٨٤.

٦٧٨- ئەو بەرەیەی (ی.ن.ك) هەتا سەرەتای ئەیلولی ساڵی ١٩٧٧ لە سەر ئەرزی واقیع دروست بوو. بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: لە كەناری دانوبەوە، ل١٧٥-١٧٠)

٦٧٩- بۆ دەستپێكردنەوەی خەباتی چەكداری لە لایەن (پ.د.ك) بڕوانە: (علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٥٩" مارتین ڤان برونسن: ئاغاو شێخو دەوڵەت، ل٦٠)

هێزێکی گەورەی ڕێکخست، کە لە هەشت هەرێمی (پ م) پێك هاتبوو، بە سەر ناوچەکانی کوردستان دابەشی کردن[٦٨٠]، بەڵام لە ڕووی چەك و تەقەمەنییەوە زیاتر (پ م) بە چەکی سوك چەکدار کرابوون[٦٨١]، سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی چەکداری لە شاخەکانی کوردستان بە شێوازی پارتیزانی هاوکات بوو لەگەڵ هاوئاهەنگی مەیدانی عێراق و ئێران لە بواری سەربازی و ئەمنی بۆ پاراستنی ناوچە سنوورییەکان.

عێراق هەتا ئازاری ساڵی ١٩٧٧ بە ڕەسمی هیچ جموجۆڵێکی سەربازی بۆ شەڕی (پ م) دەست پێنەکرد[٦٨٢]، لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ حکومەتی عێراقی داوای لە (ی ن ك) کرد بۆ گفتوگۆ، ئەوانیش قبوڵیان کرد و نوێنەریان چووە بەغدا، بەڵام نەگەیشتنە ئاکام و ئەو دانوستانە زوو بە کۆتا گەیشت. لە بەهاری ساڵی ١٩٧٨ جەنەراڵ ئەزهاری سەرۆکی ستادی ئەرکانی سوپای ئێرانی سەردانی عێراقی کرد، لەگەڵ سەرکردایەتی فەیلەقی یەك لە سەر چەند خاڵێك ڕێککەوتن هەتا لە ڕووی مەیدانییەوە هاریکاری یەکتر بن بۆ بەرەنگار بوونەوەی بزاڤی چەکداری لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی عێراق[٦٨٣]

لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٧٦وە لە پارێزگای دهۆك و سلێمانی زنجیرەیەك پێکدادان و کوژران لە نێوان هەردوو هێزی (ی ن ك) و (پ د ك)دا ڕوویدا، بەڵام لە دوای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی چەکدار شەڕی خوێناوی تووشی هێزێکی (ی ن ك) بوو، (٨٠٠) پێشمەرگە لەگەڵ زۆربەی سەرکردە سەربازی و سیاسیەکانیان لەگەڵ هێزێکی

---

٦٨٠-الحرصان: التيارات السياسية، ص٣٥٣؛ نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانووبەوە، ل١٧٣

٦٨١- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانووبەوە، ل١٦٩

٦٨٢- هەمان سەرچاوە، ل٩٣-٩٤

٦٨٣- هەمان سەرچاوە، ل١٨٩-١٩٠

(پ.د.ك) له ناوچەی هەكاری سنووری توركیاو عێراق له حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٨ بە شەڕ هاتن، به شكانی (ی.ن.ك) دوایی هات، لەو شەڕەدا زۆربەی سەركردەكانی بەدیل گیراوو كوژران[٦٨٤]. ئەوە سەرەتایەكی مەترسیداربوو بۆ شەڕی ناوخۆیی كوردستان. گەرچی ئەوە یەكەم جار نەبووەو دواجاریش نەبوو، هێزەكانی ئەو دوو هێزە سەرەكیە پەنا بەرنە بەر چەك بۆ یەكلایی كردنەوەی ناكۆكیەكان.

له بەهاری ساڵی ١٩٧٧ هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٧٩، له چەند شوێنێك هێزی پێشمەرگە كەوتنە شەڕ لەگەڵ سوپای عێراقی، بەڵام زۆربەی زۆری شەڕەكان بەرگری بووە.

٦٨٤- ئەو ڕووداوە به كارەساتی هەكاری ناسراوە كه ژمارەیەك سەركردەی (ی.ن.ك) كوژران لەوانە: عەلی عەسكەری، حسێن بابەشێخ، خالید سەعید، ئەوانە بەو نیازە چووبوون چەك له سووریاوە بهێنن، گەرچی لێكدانەوەی جیاواز هەیە كه گوایە چووبن بۆ دەركردنی هێزی (پ.د.ك) له ناوچەی هەكاری. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الحرصان: التیارات السیاسیة، ص٣٧٥-٣٧٩" ستانسفیلد: كوردستانی عێراق، ل٢٠٧-٢١٠)

## باسی دووەم:

## راگواستنو وێرانکردنی گوندو شارەدێیەکان

دوای نسکۆی شۆڕشی کورد حکومەتی عێراقی چڕترین سیاسەتی وێرانکردنو راگواستنی دەست پێکرد[٦٨٥]، گەرچی شالاوی راگواستن پێشینەیەکی زووتری هەیە، بەلام ئەم قۆناغە پەیوەستە بەپڕۆتۆکۆلی سێیەمی تایبەت بە ئاسایشی سنوور، کە لەوێدا هاتووە: ((لە پێناو رێگری لە مەبەستی کەسانی تێکدەر لە کاتی پێویستو بە هاریکاری هەردولا بڕیار لە سەر دروستکردنی ناوچەیەکی چۆڵ لە ئاوەدانی درا))[٦٨٦]، بۆیە حکومەت راستەوخۆ لە دوای کۆتایی هاتنی شۆڕشی ئەیلول، کەوتە بەرنامەڕێژی بۆ ئەوەی گوندە سنووریەکان بە زۆر لە شوێنی خۆیان بگوازرێتەوەو پشتێنەی لەمنی چۆڵ لە دانیشتوان دروست بکرێ.

---

٦٨٥-لەسفەر جەعفەر ولدانی: رۆڵی فاکتەرە جوگرافیو جیوپۆلەتیکی یەکان لە پەیوەندی میسر بە کەنداوی فارسەوە، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، ژمارە (١)، ساڵی ١٢، شوباتی ٢٠٠٥، ل١٩٣

٦٨٦- پرۆتۆکۆلی پەیوەست بە ئاسایشی سنووری عێراقی ئێرانی لە بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

پەیڕەوکردنی سیاسەتی ڕاگواستن یەکێکە لە بەرئەنجامە مەترسیدارەکانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر[٦٨٧]. لەوبارەیەوە جەلال تالەبانی دەنووسێت: ((حکومەت ڕێککەوتننامەکەی نێوان سەدام حوسێن لەگەڵ شای ئێرانی ١٩٧٥ی جەزائیر، کە بە دەستخۆشی هنری کیسنجەر بووە بە دەرفەت زانی بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی شۆڤێنیستی لە هەوڵدان بۆ کۆتایهێنان بە بوونی کوردو تەعریبی کوردستانی عێراق، بۆ ئەو مەبەستە دەستی کرد بە پیلانێکی ئەخشە بۆ کێشراو بۆ ڕوخاندنی ئەو گوندە سنوورییانەی کەوتبوونە نێوان سنووری عێراق لەگەڵ ئێران و عێراق لەگەڵ تورکیاو عێراق لەگەڵ سوریا بە قوڵایی ٣٠ بۆ ٤٠ کیلۆمەتر لە ناو خاکی عێراق، هەروەها هەستا بە دەرکردنی جوتیارو کرێکاری کورد لە ناوچە نەوتییەکان...))[٦٨٨] سیاسەتی ڕاگواستن بە درێژایی دەسەڵاتی بەعس و بە تایبەت ساڵانی دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ١٩٧٥/٣/٦ هەتا ١٩٨٠/٩/١٧ز بە تەنیا یەك ڕووی مەترسیدارو یەك بواری نەبووە بۆ زیانگەیاندن بە کۆمەڵگای کوردەواری، بەڵکو کۆمەڵێك زیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و تەندروستی لەگەڵ خۆیدا هێنا، ساڵێك نەبووە کۆتایی بێت، پرۆسەیەکی بەردەوام، دڵەڕاوکێ هەموو گوندنشینانی کوردستانی گرتەوە، هەتا لای ئەوانەش کە شاڵاوی ڕاگواستن

---

٦٨٧- مراد حەکیم موحەممەد، ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی، ل٥-١١" جرجیس فەتحوڵلا: شاری کەرکوك، کێشە لە سەر پێکهاتەی ڕەگەزی (ئەتنی)و هەوڵدان بۆ بەعەرەبکردنی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠)ی هاوینی ٢٠٠٠، ص٢٥٨-٢٦٣" ڕەفیق شوانی: کێشەی کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠)ی هاوینی ٢٠٠٠، ص٢٢٩-٢٣٢" نیزامەدین گلی: لێکۆڵینەوەیەکی گشتی سەبارەت بە کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢١)ی هاوینی ٢٠٠٠، ل١٧٨-١٧٩.

٦٨٨- حول القضية الكردية، ص٢٩

نەیگرتبوونەوە، چونکە مەرج و بڕیاری جێگیر نەبووە جوتیاری کورد بەرچاو روونی هەبێت، کە لە شالاوی راگواستن رزگاری دەبێ.

وەکو بەدیاردەکەوێ مێژووی روخانی گوندو راگواستنی دانیشتوانەکەی لە مێژووی دەسەلاتی بەعسیەکان دەگەڕێتەوە بۆ سالی ١٩٦٣، لەو سالەی دەسەلاتیان گرتە دەست، هەتا سالی ١٩٧٥ لە نێوان سستی و خێراییدا ئەو پرۆسەیە بەردەوام بووە، لە دوای بەیاننامەی ١١ی ئازار بە سالێك دەستیان کردەوە بە سیاسەتی راگواستن[٦٨٩]، ئەو سیاسەتەش لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بۆ سالی ١٩٧٤ یەکێك بووە لە هۆکارەکانی بە یەکنەگەیشتنی گفتوگۆکانی بەعس و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد.

وەکو روون کرایەوە راگواستنی بە زۆر بەرنەغامی بەرچاوتەنگی رەوتی دەمارگیری ناسیونالستی حیزبی بەعس بووە، کە ویستوویەتی ئەو بیرۆکەیە بلاوبکاتەوە، کە کەمینەکانی نیشتیمانی عەرەب دەبنە داردەستی ئیمپریالیزم و سەهیونی و زیان بە نیشتیمان و سەروەری ولات دەگەیەنن. بیریاری بەعس (مشیل عفلق)[٦٩٠] شەڕی شۆڕشی

---

٦٨٩- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئەنوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٢٥٨-٢٥٩" میدل ئیست، ووچ: جینۆساید لە عێراق و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و/سامەندی موفتی زادە، سلێمانی ١٩٩٩، ل٩٩" موحەممەد مراد حەکیم: ئاکامە کۆمەلایەتیەکانی، ل١١٧-١٢٤" مشیل عفلق: نقطة البداية، بيروت ١٩٧٣، ص١٠٦)

٦٩٠- مشیل ئەفلەق: لە سالی ١٩١٢ لە دیمەشق لە خێزانێکی ئەرسۆدەکسی مەسیحی لە دایك بووە، لە سالی ١٩٣٩ لەگەل صلاح بەیتار بزالی بووژانەوەی عەرەبی (حركة الاحياء العربي)ی دامەزراند، لە سالی ١٩٥٣ لەگەل (الحزب العربي الاشتراكي) بە سەرۆکایەتی ئەکرەم حورانی یەکیان گرت، (حزب البعث العربي الاشتراكي)یان پێکهێنا، لە سەردەمی دەسەلاتی بەعس لە عێراق دامەزرێنەر و سکرتێری گشتی و سەرۆکی سەرکردایەتی نەتەوەیی حیزبی بەعس بووە، لە ٤/٦/ ١٩٨٩ مردووە. بڕوانە: (الكيالي

کوردستانی عێراق بە شەڕی دوژمنانی ڕەسەنیەتی عەرەبو پیلانی داگیرکەران داوناوە[691]. لەو دیدەوە کوردو پێکهاتە نەتەوەییەکانی دیکەی عێراق کۆسپن لە بەردەم ئاسایشی نەتەوەی عەرەب[692]

حکومەتی عێراقی لە کۆتایی ئازاری ١٩٧٥ هەتا کۆتایی ئەو ساڵە سەرقاڵی بەتاڵکردنەوەی شۆڕشی ئەیلولو نەهێشتنی شوێنەوارەکانی بووە، لە ڕێگەی بەردەوامبوونی کۆبوونەوەکانی لیژنەی هاوبەشی هەردوو وڵات، نیشتەجێکردنو چاودێری کردنی ئاوارە گەڕاوەکانی ئێران، کۆنترۆڵکردنەوەی کوردستان بە سوپاو ئاسایش، دامەزراندنی دەزگا کارتۆنییەکانی لە کوردستان. لە پاڵ ئەو هەنگاوو بەرنامە چڕانەش لە ژێر پاساوی پشتێنەی ئەمنی درێغی نەکردوە لە شاڵاوی چۆڵکردنو ڕوخاندن، بۆیە وەکو توێژەر دەنووسێت: ((کوردستانی خواروو لە دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ بە شێوەیەکی فراوانترو سیستماتیکتر لە جاران لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ڕووبەڕووی سیاسەتی ڕاگواستن بۆتەوە...))[693]، یان دەنووسێت: ((ڕەنگە ڕاگواستنی لادێنشینانی کوردستان لە ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٧-١٩٧٩ دیارترین نموونەی ئەو کۆچە زۆرە ملیۆنییە بووە لە ناو سنووری وڵاتێکدا))[694]. بێگومان

---

و الاخرون: موسوعة السياسية، ج٦/ ص٥١٥-١٥١٦، ئەلیوت عیما: خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، ل٢١-٣٦، ٩٣)

٦٩١- مراد حەکیم محمد، ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی، ل٤٨-٤٩

٦٩٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیس، ل٦٧-٧٢)

٦٩٣-هەمان سەرچاوە، ل١١

٦٩٤-هەمان سەرچاوە، ل٢٤

راگواستن لە سایەی دەسەڵاتی بەعس لە عێراق لەوە دێرینترە، بەڵام لێرەدا پێ لە سەر خاڵێك دادەگرین، وەکو بەرئەنجامی رێککەوتننامەی جەزائیر دەستی پێکرد"[٦٩٥]

وەکو دەڵێ بڕیاری هیچ ناوەندێکی حکومەت لەبەردەست نییە لە سەر رووبەری ناوچەی چۆڵکراو لە دانیشتوان، بەڵام سەدام حوسێن لە ١٩٧٨/٧/١٨ لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا، کە بە هەردوو بۆنەی کۆدەتای ١٤و ١٧ی تەمموزەوە ئەنجامیدا، دەڵێ: ((...سەبارەت بە خەتی سنووری عێراقو ئێرانو عێراقو تورکیا...، بڕیاری گواستنەوەی ئەو گوندانە، کە زۆربەیان ماڵی چۆڵ بوون، هیچ کەرەستەیەکی پێشکەوتنو شارستانی تێدا نەبووە، دەوڵەت نەیدەتوانی هیچ خزمەتگوزاریەکی کۆمەڵایەتیو ئابووریان بۆ دابین بکات، بۆیە بڕیاردرا ئەو ناوچە سنوورییانە بە قوڵایی ١٠ بۆ ٢٠ کم چۆڵ بکرێن، واتە زەوی عێراقی هاوسنووری تورکیاو ئێران، دانیشتوانەکەی بگوازرێنەوە گوندی نموونەیی هاوچەرخ، کە هەموو کەرەستەیەکی خزمەتگوزاری بۆ دابینکراوە، بە جۆرێ لە گوندەکانی دەورووبەری بەغداو شارەکانی دیکەی عێراق ئەو خزمەتگوزاریانە دەست ناکەوێ، ئەوەیە گواستنەوە، دەڵێن کوردی گواستۆتەوە))[٦٩٦]، لەبەرانبەر ئەو قسە راشکاوانەی سەدام حوسێن، لە ساڵی ١٩٧٨ ژمارەیەك لە نووسەران، باسی ٢٠کم دەکەن، کە حکومەت بڕیاری چۆڵکردنی داببێت لە ناوچە سنوورییەکان[٦٩٧]، لەگەڵ ئەوەدا ژمارەی جیا لە نێوان ١٠کم[٦٩٨] بۆ ٣٠بۆ

---

٦٩٥- ئەسفەر حەهفەر ولدانی: رۆڵی فاکتەرە جوگرافیو، ل١٩٣

٦٩٦- نص الكامل لوقائع المؤتمر الصحفي، ص٢٣٠

٦٩٧- ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیس، ل١٩٢؛ شورش حاجی: الانفال الكرد و الدولة العراق، ص٣٥؛ مارتین فان برونسن: ئاغاو شێخو دەوڵەت، ل٥٩؛ نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٢٥٩؛

٦٩٨-ئیتیسار: ئینتزنەتەوایەتی کوردی، ل٢٦٨

٤٠كم[٦٩٩] یان ٣٠كم[٧٠٠] دەوترێ، كە لە ڕووی ڕەسمییەوە یەكلایی نەكراوەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا لەو ڕووبەرە زۆر زیاتر چۆڵ كراوە.

لە وتەكانی سەدام حوسێن دوو سەرنج گەڵاڵە دەبن وەكو ئەو هەنگاوەی حكومەت هیچ پەیوەندی بە خۆشگوزەرانی خەڵكی ناوچە سنوورییەكانەوە نەبووە، لە پرۆتۆكۆڵی ئاسایشی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت بە ڕوونی هۆكاری چۆڵكردنی ناوچە سنوورییەكان ڕوونكراوەتەوە، كە بۆ سوود وەرنەگرتنی (پ پ م) لەو ناوچانەوەو ڕێگرتن لە سەرهەڵدانەوەی بزاڤی چەكداری كوردستان بووە[٧٠١]، كە دواتر پێیان دەوت ناوچەی (پشتێنەی ئەمنی)[٧٠٢]، ئەمەیان مەبەستی ڕاستەقینەی حیزبی بەعس بووە لە چۆلكردنی ئەو ناوچە سنوورییانە نەك ئەو هۆكارەی ئاماژەی پێداوە.

پاشان هەتا هەڵوەشاندنەوەی ڕێككەوتننامەی جەزائیر لەلایەن عێراقەوە لە ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ ڕووبەری چۆلكردنی گوندە سنوورییەكانی كوردستان بە ناوی پشتێنەی ئەمنی زۆر لەو دووریەی تێپەڕاند، سەرەڕای ناوچە سنوورییەكانی لەگەڵ توركیاو سوریاشی گرتەوە، كە پەیوەندیان بە پرۆتۆكۆڵی ئاسایشی نێوان عێراق‌و ئێرانەوە نەبووە، بەشێك نەبوون لە چوارچێوەی باسكراوەی ناو پرۆتۆكۆڵی ئاسایشی نەتەوەیی سنووری عێراقی – ئێرانی[٧٠٣].

---

٦٩٩- ئیبراهیم جەلال: خوارووی كوردستان، ل٤٠٢* جلال طالباني: حولة القضية الكردية، ص٢٩* سەروەر عەبدولڕەحمان: یەكێتی نیشتیمانی كوردستان، ص٥٨*

٧٠٠- مەكدواڵ: مێژووی هاوچەرخی كورد، ل٥٥٩* گەراس‌نارهی، ستانسفیلد: كوردستانی عێراق پەرەسەندنی سیاسی‌و پشكوتنی دیموكراسی، و/ د.یاسی سەردەشتی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل١١٢

٧٠١- ئەوشیروان مستەفا: لە كەناری دانوبەوە، ل٧٩-٨٠* بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

٧٠٢- ڕانداڵ: كوردستان یان، ل٢٤٨.

٧٠٣- بڕوانە، پرۆتۆكۆڵی ناوبراو لە بەڵگەنامەی ژمارە (٣).

لە ڕاستیدا وەکو بەدەردەکەوێ چۆڵکردن بە بیانووی ناوچە ئەمنیەکان دوو ئاراستەی وەرگرت: یەکەمیان لە ناوچە سنووریەکانەوە بۆ ناو خاکی کوردستان، دووەمیان لە ناوخۆی عێراق لە ناوچە هاوسنوورەکانی نێوان کوردستان و عەرەبستان و یان ناوچەکانی نزیک بە چاڵە نەوتیەکان، کەواتە ڕاگواستنی کورد و نیشتەجێکردنی خێڵە عەرەبەکان لە شوێنی ئەوان، ڕووبەری کوردستانی عێراقی بەرتەسک کردەوە.

حکومەتی عێراق لەدوای گەڕاندنەوەی ئاوارەکانی باشووری عێراق نەیهێشت هەندێکیان بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، وەکو کوردەکانی کەرکوک و خانەقین[704]، سەرەڕای بارزانیەکان کە نەیهێشت بگەڕێنەوە ناوچەی بارزان[705].

بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵگای کوردی ئەوکات لە ڕووی گەشەی ئابووریەوە کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی بووە، ڕاگواستنی گوند زیانی زۆری لە ئابووری کوردستاندا.

داینکردنی سەرژمێری لە سەر دانیشتوانی ڕاگوێزراو و زیانەکانی بەردەست نیە، بە تایبەت کارێکی ئەستەمە زانیاری ورد لە سەر قۆناغەکانی ڕاگواستن بەدەست بهێنرێت. ئەوانەی لەو بوارەیان توێژیوەتەوە بە زۆری بە تەخمینکردن لەسەر ژمارەی دانیشتوان، زیاتر ژمارەی گوندی ڕاگوێزراویان خستۆتە ڕوو[706]، نەك زانیاری لە سەر ژمارەی دانیشتوانی ڕاگوێزراو.

---

٧٠٤- شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوك ل٢٥

٧٠٥- میدڵ ئیست، وچ: جینۆساید لە عێراق‌دا، ل١٠٠٠، لە ئەیلولی ١٩٧٩ ڕێگە بە بارزانیە ئاوارەکراوەکانی خوارووی ناوەڕاستی عێراق درا بگەڕێنەوە بۆ کوردستان و لە قوشتەپەی نزیك هەولێر نیشتەجێ بن. بڕوانە: ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (٤٩٣)ی ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٩.

٧٠٦- بە پێچەوانەی ئەو قسەیەی کە دەڵێ: (... ئەوانە گوند نەبوون، بەڵکو زۆربەی ماڵی چۆڵ بوون...)، نص الكامل لوقائع المؤتمر الصحفي، ص٢٣، شوێنێکی وەکو ئەوێڵە لە قەزای هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٨٠

ئەمە سەرەڕای ئەو گوندانەی بەر لە ڕێککەوتننامەی جەزائیر ڕاگوێزراون، لەگەڵ ئەوەدا هەندێ توێژینەوە لەو بوارەدا کراوە، یان هەوڵی باش دراوە بۆ خستنەڕووی زانیاری لە بابەت ڕاگواستن، بەڵام هەموو تەخمینەو ژمارەی دروست نین.

سەرچاوەیەك پێ وایە لە ساڵی ١٩٧٥ واتە ساڵی یەکەمی ڕێککەوتننامەی جەزائیر نزیکەی ٦٨٠ گوند ڕاگوێزراون[٧٠٧]. زیاتر ئەو گوندانە هی دەڤەرە سنوورییەکانی عەشیرەتی (بەرۆژی)و (نزاری)و (هەرکی)و (مزوری)و (شێروانی)و قەزای سمێل و بوون لە پارێزگای هەولێرو دهۆك، لەگەڵ دەیان گوندی ناحیەکانی سەر بە قەزای خانەقین و ناحیەی جەلەولای سەر بە پارێزگای دیالەو ناحیەی قەرەتوش و گوندەکانی قەزای سەنجارو شێخان و تەلعەفەرو (گەرگەری)یەکانی دەڤەری (عین زالە)ی سەر بە پارێزگای موسڵ، تەنیا لەو ساڵە لە هەردوو ناحیەکەی سەر بە قەزای سەنجار ١٤٦ گوند ڕاگوێزران[٧٠٨]. هەندێکیان دەکەوتنە چوارچێوەی پشتێنەی ئەمنی سنوورەوە، ئەوی دیکە بە مەبەستی (تعریب) بووە، بە پێی سەرچاوەیەك هەتا ساڵی ١٩٧٨ نزیکەی (١٤٠٠) گوند خاپورکراوە[٧٠٩]، یان کۆی گوندی خاپور کراو لە ساڵی ١٩٧٥ هەتا ساڵی ١٩٧٩ گەیشتۆتە (٢٠٠٠) گوند[٧١٠]

---

ڕاگوێزرا (٢٠٠٠) خێزانی لێ نیشتەجێ بووە، کە دەکاتە نزیکەی ١٢٠٠٠ کەس. بڕوانە: (ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیس، ل١٦١-١٧٧)

٧٠٧-مراد حەکیم: ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی، ل١٢٦-١٢٧

٧٠٨- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (مراد حەکیم: سیاسەتی ڕاگواستنی، ل٢٣)

٧٠٩-هەمان سەرچاوە، ل٢٤

٧١٠- هەمان سەرچاوە،، ل٢٦

توێژەریك پێی وایە لە ساڵی ١٩٧٤ بۆ ساڵی ١٩٧٨ ئەو ژمارەیە هەڵدەکشێت بۆ (١٠٢٢٢) گوند[٧١١]، ڕۆژنامەی (الثورة) بە تەنیا لە دوو مانگی ساڵی ١٩٧٦دا دانی ناوە بە ڕاگواستنی ١٥٠٠٠ گوندی ناوچە سنوورییەکان[٧١٢]، کە دەکاتە نزیکەی ٨٠٠٠٠ کەس، لە جێگای هەندێ لەو گوندانە هۆزە عەرەبییەکانی لێ نیشتەجێکردن، یان هەندێکیانی ناچارکرد خۆیان بە عەرەب بنووسن[٧١٣]، ئەو شاڵاوە پێکهاتە ئاینیو نەتەوەییەکانی دیکەشی گرتەوە، وەکو یەزیدیەکانو دیانەکانو کاکەییەکان[٧١٤]، کە دەکەوتنە هاوسنووری عەرەب، یان نزیك بە ناوچە نەوتیەکان[٧١٥]. مەبەستی حکومەت لە ڕاگواستنی ناوچە هاوسنوورییەکانی عەرەبستانو ناوچە نەوتیەکان بە عەرەبکردنی کوردستان بووە، بۆ نموونە ٢٠٠ خێزانی عەشیەتی گەرگەری لە نزیك عین زالە بۆ قەزای ئاکرێ دوورخستەوە، لە ساڵی ١٩٨٠ دوای ئەوەی ناچاربوون خۆیان بە عەرەب ناونووس بکەن دەرفەتی پێدان بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان[٧١٦].

---

٧١١- ش.ج.مگزیو ئەوانی تر: کوردستانی هاوچەرخ، ل٥٤

٧١٢- مراد حەکیم: سیاسەتی ڕاگواستنی، ل٢٣

٧١٣- شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوك، ل٢٦

٧١٤- یەزیدیو کاکەیی لە ڕووی نەتەوایەتیەوە کوردن، یەزیدیەکان لە ڕووی ئاینیەوەو کاکەکەییەکان لە ڕووی مەزهەبیەوە جیاوازن، دیانەکان لە ڕووی نەتەوەییەوە ئاشووریو ئەرمەنیو کلدانن. حکومەت لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ زۆربەی کاکەییو یەزیدەکانیو دیانەکانی بە عەرەب ناونووس کرد، سەرەڕای ناونووسکردنی ژمارەیەکی زۆر لە تورکمانەکان. بۆ زانیاری زیاتر. بڕوانە: (ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیس، ل٢٦٣)

٧١٥- لە سنووری قەزای ئاوەند لە کەرکوك‌و لە قەزای دووبز ٥٩ گوندو لە سنووری کۆیە ١٠ گوندی بە هۆی ئاسایشی کانە نەوتیەکانەوە ڕاگوێزران. بڕوانە: (ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیس، ل٨٩)

٧١٦- مراد حەکیم: ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی، ل١٢٨

گوندانی راگوێزراو لە (ئۆردوگا)[٧١٧] پارچەیەك زەوی‌و بڕێك پارە بۆ دروستكردنی خانوویەكی سام ناوەندیان وەردەگرت، دواتر ڕووبەڕووی گۆڕانێكی ترسناك دەبوونەوە، لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیەی كە تەواو جیاواز بووە لەگەڵ شێوە ژیانی لادێی، لە ڕووی كۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سەرچاوەی بژێوی‌و چاودێری حكومەت بە سەر هەموو هەڵسوكەوتێكی سیاسی‌و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی، لەو شوێنە نەیدەتوانی نەچێتە سەربازی‌و منداڵەكانی لە قوتابخانەیە نەخوێنن، كە پرۆگرامەكانی بە جۆرێك داڕێژرابوون نەوەی تازە دابڕێ لە بیری نەتەوایەتی‌و ئازادیخوازی. لە ئۆردوگا هەموو جموجۆڵێكی سیاسی خستبووە ژێرچاودێری[٧١٨]، بۆیە ئەو جۆرە كۆچپێكردنە هەرگیز نەدەچووە چوارچێوەی گەشەپێدانی وڵات یان ڕەچاوكردنی بەرژەوەندی راگوێزراوان، بەڵكو دەچووە چوارچێوەی كۆچپێكردنی ناچاری، كە لە ڕێگەی دژایەتیكردنی ڕەگەزی‌و ئینتیمای سیاسیەوە پەیدا بووە[٧١٩]

---

٧١٧- ئۆردوگا: شوێنی كۆكردنەوەو نیشتەجێكردنی گوندە راگوێزراوەكان بووە، ئەو ئۆردوگایانە لە نزیك شارە گەورەكان یان سەر ڕێگاو بانە سەرەكییەكان دروستی كرابوون، هەتا بە ئاسانی كۆنتڕۆڵ بكرێن، هەروەها بۆ ئەوەی ژمارەی كورد لەو سنوورە ئۆتۆنۆمییەی دایانبوو كورت بكاتەوە هیچ ئۆردوگای لە دەرەوەی ئەو سێ پارێزگایە دروست نەكرد، لە كۆی ٥٩ ئۆردوگا، (٢٩) ئۆردوگا لە سنووری پارێزگای سلێمانی‌و (١٦) بۆ هەولێرو (١٤) بۆ دهۆك. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ڕانداڵ: كوردستان یان، ل٢٤٨" ئەمین قادر مینە: ئەرحیل، تعریب، تبعیس، ل٢٦٣" میدڵ ئیست ووچ: جینۆساید لە عێراقدا، ل١٠٤

٧١٨- بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەوە بڕوانە: ئەمین قادر مینە: ئەرحیل، تعریب، تبعیس ، ل١٧٨-١٩٦

٧١٩- هەمان سەرچاوە، ل٢٥-٢٧

لەلایەکی دیکەوە حکومەت بە چۆڵکردنی گوندە سنووریەکان دەیویست هەموو پەیوەندییەکی سیاسیو بازرگانیو هاوکاری نەتەوەیی لە نێوان بەشەکانی کوردستان بپچڕێنێت.[720]

حکومەت بەو کارە سنووری کوردستانو زێدی کوردی بەرتەسک کردەوە هەتا هاوسەنگی نەتەوەیی لە عێراق لە بەرژەوەندی رەگەزی باڵادەست دابێ، لەوبارەیەوە تشالز تریب دەڵێ: ((...حکومەت بۆ هاوسەنگی لە بەرژەوەندی عەرەب هانی خێزانە عەرەبەکانیدا لە باشوورەوە بۆ باکور کۆچ بکەن...))[721] سەرەڕای گواستنەوەی کارمەندو سەربازی عەرەب بۆ کوردستانو دوورخستنەوەی فەرمانبەری کورد بۆ دەرەوەی ناوچە کوردییەکانو تەنانەت بەخشینی پارە بۆ هاندانی ژنخوازی نێوان کوردو عەرەب بۆ مەبەستی سیاسەتی تەعریب[722].

سەرەڕای ئەو شێوازانەی سەرەوە، حکومەت رێوشوێنی دیکەیشی گرتبووەبەر بۆ گۆڕینی باری دیموگرافیای ناوچەکە، ئەویش بە دەستکاریکردنی سنووری پارێزگاکان، لەو پێوەندانگەدا لە مەرسومێکی کۆماری بە ژمارە (٤١)ی رۆژی ٢٩ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٦ قەزای دوزخورماتووی لە پارێزگای کەرکوك دابڕیو خستیە سەر پارێزگای سەلاحەدین (تکریت)، هەروەها لە دوو مەرسومی کۆماریدا بە ژمارەکانی (٦٠٨)ی رۆژی ٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٥) هەردوو قەزای کەلارو کفری لە پارێزگای کەرکوك دابڕیو خستیە سەر پارێزگای سلێمانیو دیالە. لە بەرانبەردا ناحیەی (دوبز)ی لە پارێزگای کەرکوك بە مەرسومی ژمارە (٧٢) لە ١٥ی شوباتی

---

٧٢٠- هەمان سەرچاوە، ل٤٠٦

٧٢١- صفحات من تأريخ، ص٢٨٥

٧٢٢- مەکدواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٥٧

ساڵی ١٩٧٦ کرده قەزا[٧٢٣]، پاشان بە بڕیاری (٦٠٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ قەزای چەمچەماڵی لە پارێزگای کەرکوک دابڕیو خستیە سەر پارێزگای سلێمانی[٧٢٤]، هەموو ئەو هەنگاوانە بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کورد بووە لە پارێزگای کەرکوک[٧٢٥]، ئەمە سەرەڕای شاڵاوی چڕی تەعریب لە ناو شاری کەرکوک بە دامەزراندنی گەڕەکی تازە بۆ عەرەبی هاوردەو دەرکردنی ماڵە کوردەکان. هەروەها کرێکارو کارمەندە کوردەکانی دەگواستەوە بۆ باشوورو لە جێگەی ئەوان هی عەرەبی دادەمەزراند، سەرەڕای تەعریبی ناوی تەواوی قوتابخانەو گەڕەکو شوێنە گشتیەکان[٧٢٦]

سەرەڕای ئەوانە گرتنەبەری زۆر ڕێگای دیکە بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد لە کەرکوک لەوانە: ڕێگەگرتن لە تۆمارکردنی خانوبەرەی تازە بە ناوی کوردو

---

٧٢٣- مەکدوال: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٥٧" عەبدوڵلا غەفور: پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان لە باشووری کوردستاندا بە پێی سەرژمێری دانیشتوان لە عێراق.١٩٧٧، سلێمانی٢٠٠٥، ل٣٠-٣٧، ٦١" فاتیح عەبدوڵلا: پارێزگای کەرکوک ساڵی ١٩٥٧-١٩٧٧ (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-سیاسی بەراوردکاریە لە ڕووی شێواندنی سنووری جوگرافیو کاریگەری باری نەتەوەیی)، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٠٢-١١٤

٧٢٤- فاتیح عەبدوڵلا: پارێزگای کەرکوک، ل١١٩

٧٢٥- لەگەڵ ئەو ڕەخنانەی لە ناکامی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ دەگیرێ، بە پێی ئەو سەرژمێریە زۆرینەی دانیشتوانی ئەو چوار قەزایە کوردبوون، وەکو چەمچەماڵ ٩٦./. کەلار ٩٩./. دوزخورماتوو ٤٥./. قەزای کفری ٨٢./. کورد بووە. بڕوانە: (نوري الطالباني: منطقة كركوك و محاولات تغير واقعها القومي، لندن ١٩٩٥، ص٧٢-٧٣" كاظم حبيب: الاستبدادر القصرة في العراق،، سليمانية ٢٠٠٥، ص٤٧٦)

٧٢٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الحرصان: صفحات من تأريخ العراق الحديث، ص٣٩٦-٣٩٨" شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوک، ل٤٦-٤٨" نوري الطالباني: منطقة كركوك، ص٦٠-٦١)

دەرفەتنەدان بە نۆژەنکردنەوەی خانوو، تاوان دانە پاڵ کوردان هەتا بترسێن و شار بەجێ بهێڵن[727]

تاکامێکی دیکەی مەترسیداری راگواستن و تۆزردوگاکان، بە هۆی بێکاری و برسیەتی و نەبوونیەوە ناچارکردنی کورد بووە بە چەك هەڵگرتن بۆ رژێم و سزادانی ئەوانەی چەکیان هەڵنەگرتایە[728]

لە سەرەتاوە پارت و رێکخراوە کوردییەکان دەیانویست بەگژ سیاسەتی راگواستن و گۆڕانی باری دیمۆگرافی کوردستاندا بچنەوە، لە یەکەم مەرجی گەرماو گەرمی گفتوگۆی (ی.ن.ك) لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ز بریتی بووە لە: ((کۆتایی هێنان بە سیاسەتی راگواستن و گۆڕینی سیمای نەتەوایەتی و گەڕانەوەی دەرکراوەکان بۆ شوێنی خۆیان))، سەدام حوسێن سەبارەت بەو داواکاریە وتبووی: ((راگوێزانی دێهاتەکانی سنوور پەیوەندی بە ئاسایشی عێراق و پاشەڕۆژیەوە هەیە، لەبەر ئەوە ئەگەر هەموو جەیشی عێراقی لە ناوبچێ جێبەجێی دەکەین))[729].

لەبەرانبەردا ئەو پارت و رێکخراوە کوردیانەی لەگەڵ بەعس چووبوونە بەرەوە، بێ هەڵوێست بوون لەو پرسە. (حشع) لەبەرانبەر راگواستن بەتەواوی بێدەنگ بووە، لە بڵاوکراوەکانیدا دەنگی هیچ نیگەرانیەك نییە[730]. ئەو تەنگژەی جوتیار و کرێکار و رەنجدەری کوردستان تێی کەوت، ویژدانی (حشع) نەجولاند[731]. بەهائەدین نووری لەو بارەیەوە دەنووسێت: ((...سەدان گوندی کوردیان دەگواستەوە. مەکتەبی سیاسی

---

٧٢٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: انوري الطالباني: منطقة كركوك، ص٦١-٦٢).

٧٢٨- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٤٠٥

٧٢٩- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری، ل١٨-١٨٢

٧٣٠- ئەمین قادر مینە: ئەرحیل، تعریب، تبعیس، ل٩٧-٩٨

٧٣١- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان، ل٤٠٦

بەرانبەر ئەوە بێدەنگی هەڵبژاردە...))[732]. (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)یش باس‌و ئەدەبیاتی کۆنگرەکەیان تەرخان دەکرد بۆ خوێندنەوەی سەروەریەکانی حیزبی بەعس[733]

لە هەرسێ پارێزگای ناوبراو رووبەری چۆڵ کراو بەو شێوەیە بووە: ٣١/١٪. لە پارێزگای سلێمانی‌و ٢٦/٩٥٪. لە پارێزگای هەولێرو ٦٠/٤٦٪. لە پارێزگای دهۆك. تێکڕای ناوچەی چۆڵکراو لە سنووری هەرسێ پارێزگا دەگەیشتە (٣٦/٤٦٪.) کۆی رووبەری گشتی. بەڵام لە پارێزگای کەرکوك‌و دیالەو موسڵ ناوچەکە راگوێزراوەکان بە چۆڵی نەدەهێشترایەوە، لە جێگەی ئەوان ماڵی عەرەب نیشتەجێ دەکرا، زەوی‌و خاك‌و تاریان دەدرا بەو هۆزە عەرەبیانەی لە ناوچەکانی باشوورەوە دەهێنران.

هەڵبەت ئامار لە سەر ژمارەی دانیشتوان یان گوندی راگوێزراو بۆ ئەوانەش ئەستەمە، کە دیراسەی تایبەت لە سەر ئەو بابەتە دەکەن[734]، بەڵام ئامارەکان‌و رووبەری چۆڵکراو ئەوە دەردەخەن یەك لە سەر سێی زەمینی کوردستان چۆڵ کرا، بەمەش دەیان هەزار جوتیاری کورد لە زەوی‌و زاری دوورخرایەوەو زیانی گەورە بە بەرهەمی کشتوکاڵی‌و ئابووری کوردستان کەوت، یەك لە سێی زەوی‌و زاری بەراوو دێم لە کوردستان بۆ هیچ جۆرە سوودێکی کشتوکاڵی‌و ئاژەڵداری بەکارنەدەهات، هەزاران

---

٧٣٢- مذکرات، ص٣٢٩

٧٣٣- بڕوانە: رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٣٠٢)، ١٩٧٦/٢/٦.

٧٣٤-مراد حەکیم: ئاکامەکانی راگواستنی، ل٣٢" صلاح سعد الله: للمسألة الکردیة في العراق، قاهرة ٢٠٠٦، ص١٠٦

مێگەلە مەڕو بزنو چێڵو پەلەوەری ماڵی لە ناوبران[٧٣٥]، بە پێی توێژینەوە ژمارەی ئاژەڵ بە هۆی ڕاگواستن زۆر ڕووی لە کەمی کرد[٧٣٦]

هەموو ئەو گوندانەی لە شوێنی خۆیان حکومەت گواستیەوە بۆ ئۆردوگاکان، بە بلدۆزەرو نارنجۆک تەختی کردن، درەختەکانی بڕینەوە، کانیاوەکانی وێران کردن[٧٣٧]، ئەمەش بۆ ئەوە بووە هەتا دانیشتوانەکەی هیوا بڕاو بن، لەوەی جارێکی دیکە بگەڕێنەوە بۆ سەر موڵکو ماڵی خۆیان.

٧٣٥- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو، ل٤٠٥" نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٢٦١-٢٦٢

٧٣٦- بڕوانە: (مراد حەکیم: ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی، ل١٧٧)

٧٣٧- ڕانداڵ: کوردستان یان کلۆڵی نەتەوەیەک ل٢٤٨.

## باسی سێیەم:

## گۆڕانی رژێمی دەسەڵات لە ئێران و بزافی رزگاریخوازی کوردو هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیر

پێش ئەوەی بچینە سەر هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیرو واقیعی جوڵانەوەی کورد لە سایەی گۆڕانکاریە تازەکان، هۆکارەکانی روخانی شا لە چەند خاڵێکدا پوخت دەکەینەوە: -

### یەکەم : پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئێران و روخانی شا:

سیاسەتی شا کۆنک بوو لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، واشنتۆن پاڵپشتی دامەزراوەی سەربازی ئێرانی دەکرد، وەکو پێگەی گرنگی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەیڕوانیە ئێران[٧٣٨]، حیزبی کۆماریەکان لە ئەمریکا زیاتر گرنگیان بە شا دەدا، بەڵام لە دوای ساڵانی ١٩٧٦ ئەو گرنگی پێدانە کەم بۆوە، شا زۆر نازی بە سەردا دەکردن و ئەمریکاش نازی هەڵدەگرت، بەڵام ئەو هەڵوێستە

---

٧٣٨- بۆ زانیار لەو بارەیەوە بڕوانە: (جرجیس حسن: ترکیا في استرتیجیة الامریکیة، ص١٥-١٦)

بەتایبەت لە سەردەمی (جیمی کارتەر)دا گۆڕا[739]. وا بەدەردەکەوێ سروشتی سیستمی سەرمایەداری ئەمریکایی‌و پەیوەندییە سەربازی‌و ئابووریەکانی لەگەڵ ئێران لەگەڵ ئەمریکا ئەو قەناعەتەی لای گەلانی ئێران دروست کردبوو، کە ئەمریکا هۆکاری درێژەپێدانی زۆرداریەتی ئەو ڕژێمەیە، کارتێکی بە هێز بووە بە دەست هەردوو ڕەوتی ئیسلامی شیعەو چەپ[740] و دیموکراتی‌و لیبرالەکانی ئێران.

لە سەرەتاوە ئۆپۆزسیون دەروشمی ڕوخانی ڕژێمی شای بەرز کردبۆوە، لە کاتێکدا ڕوخانی شا بە هۆی بە هێزی ئۆپۆزسیون‌و دەستەوەستانی شا مەحاڵ نەبوو، بەڵام لە ئاستی ناوخۆ بەرانبەر شەقامی ئێرانی بە تایبەت پیاوانی ئاینی، کە ڕۆڵی سەرەکیان دەگێڕا لە بزواندنی جەماوەر، شا پشتیوانی‌و هاریکاری دەرەکی نەمابوو. نەزاغی لەو بارەیەوە دەنووسێت: ((هەرچەندە ئارەزووی سەربەخۆ بوون‌و نیشتیمانپەروەری شا قووڵ بوایە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ ئیسرائیل‌و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەستی نەتەوایەتی‌و ئاینی ئێرانیەکانی ئەزیەت دەدا...))[741].

پەیوەندییە ئیقلیمیەکانی ئێران لە ساڵی ١٩٧٥ بە دواوە گۆڕانی بە سەردا هات، لە پاڵ هاریکاری سەربازی‌و ئاسایشی لەگەڵ عێراق لە بواری ئابووری‌و بازرگانی‌و گەشتیاریش پەیوەندیان دامەزراند[742]، بە سەرپەرشتی وەزیری بازرگانی هەردوولا لە ئەمڕۆی ساڵی ١٩٧٧ دوو ڕێککەوتننامەی هاریکاریان مۆرکرد، یەکەمیان لە بواری

---

٧٣٩- نەزاغی: لە دەرباری شاوە بۆ زیندانەکانی شۆڕش، ل٨٣-٨٤

٧٤٠- چەپ: بەکارهێنانی بیرۆکەی چەپ زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی، بۆ هەموو بزاڤە شۆڕشگێڕە رادیکاڵەکان بەکاردەهات، لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیەوە بۆ پارتە ڕێکخراوە کۆمۆنیستیەکان بەکارهاتووە. بڕوانە: (فاتیح رسوڵ: بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ، ل٢١-٣٤)

٧٤١- نەزاغی: لە دەرباری شاوە بۆ زیندانەکانی شۆڕش، ل٢١

٧٤٢- ماریون وبتر سلوجت، العراق الحدیث من الثورة، ص٢٤٧

(گەشتیاری)و دووەمیان لە بواری (کشتوکاڵ و ڕاوەماسی)[743]. بەڵام باشبوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ عێراق کاریگەری بەسەر باری ناوخۆی ئێرانەوە نەبوو، عێراق لە ساڵی ١٩٧٨ هیچ کاریگەری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی نەبووە بە سەر ناڕەزاییەکانی گەلی ئێران، پەیوەندی ئێران لەگەڵ وڵاتانی کەنداویش زۆر ئاسایی بووە، بەڵام ئەوانیش بێکاریگەری بوون.

لە سەرەتاوە ئەمریکا هاوکاری ئێران بووە لە دامەزراندنی سوپای بە هێزو پڕ چەکو دەزگای هەواڵگری ساواک[744]، دوای لاواز بوونی پێگەی یەکیەتی سۆڤیەتی لە کەنداو زیاتر ببوە جێگەی متمانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەو بارەوە تورتۆر: دەنووسێت: ((ڕژێمی شا لە کەنداوو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کۆڵەکەیەکی بنەڕەتی بووە بۆ واشنتۆن))[745]. هەروەها هاتووە کە: ((هێزی سەربازی ئێرانی بەهایەکی گەورەی هەیە بۆ ئەمریکا بەرانبەر یەکیەتی سۆڤیەت، ئێران ڕۆڵی بەرچاو دەگێرێت لە دژایەتی هێزە نیشتیمانیەکانی دەرەوەی سنووری خۆی، شا لە زۆر بۆنەدا ڕایگەیاندووە، کە بەرگەی (کاری تێکدەرانە)ی هیچ بزاڤێکی دیموکراتی یان نیشتیمانی ناگرێ)) لە ساڵی ١٩٧٣ واژۆی لە سەر هاوپەیمانیەتی کردووە دژی شەپۆلی کۆمۆنیستی و بزاڤی ڕزگاریخوازی لەگەڵ وڵاتانی: فەرەنسا، ئێران، سعودیە، مەغریب، میسر، کە ناویان لە خۆیان نابوو "یانەی سەفاری"[746]. سەرەڕای ئەوە

---

٧٤٣- الوقائع العراقية، ژمارە (٢٦٢)ی ٥ی کانونی یەکەمی١٩٧٧ و ژمارە (٢٦٢٧)ی ٢٦ی کانونی یەکەمی١٩٧٧

٧٤٤- فەوزیە صابر محمد: کێشەی نەتەوایەتی لە ئێران (١٩٤١-١٩٤٦)، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (١٥)ی بەهاری ٢٠٠٠، ل٢٨-٤٨

٧٤٥- جرجیس حسن: ترکیا في الاستراتیجیة الامریکیة، ص١٥-١٦.

٧٤٦- المصدر نفسه، ص١٢-١٣

نەچووبوە ناکۆکی کردەیی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت، بەرژەوەندی ئابووری هەمەلایەنەو ستراتیژی وڵاتەکەی رەچاو کردبوو، پەیوەندی لەگەڵ ئەویش تێک نەدابوو، یەکیەتی سۆڤیەتیش زیاتر لە هەوڵی پاراستنی ئەو پەیوەندییە دابوو[747]، لەوانە ئەو سنوورە هاوبەشەی لە نێوانیان دابوو هەردوولایان هەستیان بە مەترسی قوڵکردنەوەی ناکۆکیەکانی کردبێت، ئەمەش وای کرد باری رۆڵی بەرهەڵستکارەکانی ئێرانی ئاراستە چەپ لە کۆتایی هەفتاکان لە ژێر فشاری سیستمی دیکتاتۆری و بێ پشتیوانی یەکیەتی سۆڤیەت لاواز بێ.

ئەو دەرفەتەی لە کەناڵەکانی راگەیاندنی رۆژئاوا بە تایبەت فەرەنساو بەریتانیا لە کۆتایی حەفتاکان بۆ بەرەی ئۆپۆزسیون کرایەوە وەکو بەدەردەکەوێ رەوتی چەپ لێی هەندێ سوودمەندبووە، چونکە حکومەتی فەرەنسا سەرەرای ئەوەی (خومەینی)[748] دالدەدا، رێگەی گەرانەوەشی پێدا بۆ ئێران[749]، ئەمەش زیاتر بە ئۆپۆزسیونی مەزهەبی کرد لە بەرانبەر رەوتی بەرهەڵستکاری چەپ، پشتێکردنی فەرەنسا دەردەخات لە رژێمی شا.

حکومەت لە ئێران لەبەرانبەر ئۆپۆزسیون بە ئاگری دۆستایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی دەسووتا، ئەمریکاش بە چەند ساڵ پێش هاتنی شۆرشی گەلانی ئێران

---

٧٤٧- ئینتیار: ئینتۆنەتەوایەتی کوردی، ل٤٤

٧٤٨- خومەینی: یەکێك بووە لە پیاوە گەورەکانی شیعە، لە شاری قوم دادەنیشت، بە هۆی چالاکی دژ بە حکومەت شا لە ساڵی ١٩٦٤ لە ئێران دەرکرا، لە شاری نەجەف لە عێراق نیشتەجێ بوو، لە سەر داواکاری شای ئێران لە ٦ی تشرینی ساڵی ١٩٧٨ خومەینی لە عێراق دەرکرا. نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٥٠

٧٤٩- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٥٠

پشتی کردبووە شا، وەکو پێشتر بە پۆلیسی ناوچەکە بۆ ئەمریکا ناسرابوو[750]، دیارە رژێمی شا هەر بەو دیدەوە چاوەڕوانی پشتگیری ئەمریکا بووە، گۆڕینی سیاسەتی رەخنەگرتن، زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵی ١٩٧٧، ئەوکاتەی (جیمی کارتەر) رووبەڕووبوونەوەی پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤی کردبووە دروشمی بانگەشەی هەڵبژاردنو دەسەڵاتی شای خستبووە لیستی پێشێلکارانی مافی مرۆڤەوە، هەرچەند شا هەوڵیدا بۆ ئاساییکردنەوەی ئەو پەیوەندیانە، بەڵام ناکامی نەبوو[751]، هەتا دروشمەکانی کارتەر ئەوکات مستەفا بارزانی خستە ژێرکاریگەری خۆیەوە[752]، دوای سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکان نامەی پیرۆزبایی بۆ نارد، بە زەقی ئەو حاڵەی بە بیر هێنابۆوە[753]، بەڵام ئەوەی کارتەری تووشی شۆك کرد لە بەرانبەر رکەبەرەکانی هەڵوێستی رژێمی تازە بووە لە بارمتە گرتنی ئەو ئەمریکیانەی لە ئێران بوون، کە کارتەر لە بەرانبەر ئازادکردنیان دەستەوەستان بوو[754]

لەگەڵ هەموو چاوەڕوانیەکانی شا بە ئەمریکاو بەریتانیا لە ٨ی کانوونی یەکەم وەزیری دەرەوەی ئەمریکا رایگەیاند وڵاتەکەی بە هیچ شێوەیەك نیازی دەستوەردانی نییە لە کاروباری ناوخۆی ئێران، شا لە بیرەوەریەکانی زۆر نیگەرانی نیشان داوە، کە ئەمریکاو بەریتانیا سەریان لێشێواند، نیگەران بووە لەوەی نوێنەدی هەواڵگری بەریتانی لە ئێران پێی وتووە نە لە سەر خۆیی‌و نە لە سەر دەسەڵاتەکەی دڵنیایی

---

٧٥٠- السبكي: تأريخ ايران السياسي بين الثورتين (١٩٠٦-١٩٧٩)، كويت، ١٩٩٩، ص٢٦٧

٧٥١- ئەزاغی: لە دەرباری شارە، ل٨٣-٨٤

٧٥٢- د. فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، ل٢٩٧

٧٥٣- بەڵگەنامەی ژمارە (١١).

٧٥٤- الكيالي و الاخرون: موسوعة السياسية ج٥/ ص٢٣

ناداتێ[٧٥٥]، که له راستیدا له کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ بارودۆخی ئێران بۆ ئاستێك تەقیبۆوە، به پاڵپشتیو دەستێوەردانی دۆستەکانی شاش چارەسەر نەکرێت.

پێدەچوو سەرۆکی ئەمریکاو هەموو ئەو وڵاتانەی کەمتەرخەمیان نواند له پشتگیری شا به دوای لێکدانەوەی دیکەدا گەڕابن، ئەو سەردەمە بەریتانیا هەڵوێستێکی ناحەزانەی گرتبوو بەر بەرانبەر شا، لە هەمان کاتدا دۆستایەتی یەکیەتی سۆڤیەتی بۆ شا تەنیا لە چوارچێوەی پاراستنی بەرژەوەندیەکان بووە[٧٥٦]، فەرەنسا لە ژێر ناوی ئازادی راگەیاندنەوە کەناڵەکانی راگەیاندنی خستبووە خزمەت ئۆپۆزسیونی ئێرانی، ئەمەش جۆرێکی دیکە بووە لە پشتتێکردنی حکومەتی فەرەنسا لە شای ئێران[٧٥٧].

## دووەم: گەندەڵی ئیداریو دارایی خانەوادەی شاو داردەستەکەی:

زیاتر نیگەرانی گەلانی ئێران لە رژێمی شا لەبەرانبەر گەندەڵی ئابووری دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی پەنجاکان، ئەو رووبەڕووبوونەوە لە ئاکامی خۆماڵیکردنی پەترۆڵ لە ئێران لە سەر دەستی سەرۆك وەزیرانی ئەوکات (موسەدەق)[٧٥٨] هاتەدی، شا بە پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەڕایەوە ئێرانو حکومەتی موسەدق

٧٥٥- آمال السبكي: تأريخ ايران السياسي، ص٢١٦

٧٥٦-- المصدر نفسه، ص١٩٥-١٩٦

٧٥٧-لەو بارەیەوە بڕوانە: (نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٨٧-٨٨)

٧٥٨- موحەممەد موسەدەق: (١٨٨١-١٩٦٧) لە ساڵی ١٩٥١ کرایە سەرۆکی وەزیران، لە ساڵی ١٩٥٣ هەوڵی دا نەوتی ئێران خۆماڵی بکات، شاو بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەو هەنگاوە نارازی بوون، هەتا لە ئاکامی کودەتایەك لە سەر کار لابرا. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (زهیر ماردینی: الثورة الايرانية بين الواقع و الاسطورة، بيروت، ١٩٨٦، ص١٢١* نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٣٣٧)

رووخا، ئەو هەنگاوە نیشتیمانیەی ئەوکات کۆدەتایەکی ناراستەوخۆ بووە بە سەر رژێمی شاهەنشایی لە ئێران[759]. شا بە تەنیا لە رووی دەسەڵاتەوە توانیبووی بە پشتگیری ئەمریکاو بەریتانیا حکومەتی نیشتیمانی بڕوخێنێت، بەڵام هۆکارە بابەتیەکان و کاریگەری ئەو کۆدەتایە لە دەروونی گەلی ئێران هەڵنەکەنرابوو، نارەزایی خەڵکی ئێران دژی گەندەڵی کارگێڕی و دارایی و ئەخلاقی بووە لەرانبەر بنەماڵەی پەهلەوی زیاتر ببوو، گەلی ئێران ئەو بنەماڵەیان بە سەرچاوەی گەندەڵی و نیگەرانیەکەی دەزانی، خانەوادەی شا لە خێزان و کوڕو کچەکانی و خوشك و براکانی رابەرایەتی ئەو گەندەڵیە گەورەیان دەکرد[760]، دەوڵەمەندبوونی خێرای هەندێ لە چینەکان و جیاوازی چینایەتی بە بێ هیچ بەهایەکی شەرەفمەندانە، لەگەڵ ئەو ئیمتیازاتە زۆرانەی لە دەستی نزیکەکانی شاو بە تایبەت بنەماڵەکەیدا بوو هۆکاری گرنگ بوون بۆ وروژاندنی خەڵکی ئێران لەلایەن ئۆپۆزسیۆنەوە[761]

لە دوای سەرەتای شەستەکانەوە شا سیستەمی نوێنەرایەتی (نیابی) لە ئێران فەرامۆش کرد، دەسەڵاتی کاروبارەکانی وڵاتی لە بندەستی (حیزبی رەستاخیز = حیزبی بوژانەوەی ئێران) کە حیزبی دەسەڵاتداربووە کورت کردەوە، ئەمەش لە سەر حیسابی پارت و رێکخراوو رەوتەکانی دیکەی ئێران[762]

---

٧٥٩- آمال السبكي: تأريخ ايران السياسي، ص١٨١-١٨٧* دونالد ولبر: ايران ماضيها و حاضرها، ت/عبدالمنعم محمد حسنين، د.م، ١٩٨٥، ص٧* نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٢٠٥

٧٦٠- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٤٧

٧٦١- نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٢١

٧٦٢- دونالد ولبر: ايران ماضيها و حاضرها، ص٩-١٠

شا بۆ کەمکردنەوەی گلەیی خەڵکی ئێران بەشێکی سەروەت و سامانی بنەماڵەکەی دابووە بە دامەزراوەیەکی ئابووری بە ناوی (دامەزراوەی پەهلەوی)[٧٦٣]، کە داهاتەکەی ئاراستەوخۆ خزمەتی شاو خزم و کەس و دەسەڵاتەکەی دەکرد، بەو هەنگاوەشی نەیتوانی سەرنجی ئەو ڕەخنانە کەم بکاتەوە، کە لە سەر گەندەڵی دارایی و بەکارهێنانی ناڕەوای موڵک و سامانی دەوڵەت لە شا دەگیرا. خزم و کەسە نزیکەکانی شا دەسەڵاتیان بە سەر بزاوتی ئابووری وڵاتدا گرتبوو، بازرگانی بە مادە بێهۆشکەرەکان و بەشداری ئەوان لە کۆمپانیا بازرگانییەکانی ئێران و دەرەوە، کردنەوەی ئەندازەیەکی زۆر لە قومارخانە و ناوەندەکانی ڕابواردن بۆ خانەوادەی شا ئابووری وڵاتیان بەرەو ئەوپەڕی گەندەڵی بردبوو، سەرەڕای ئەوە دەسەڵاتی شا سەراپای ئێرانی خستبووە گەندەڵی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی[٧٦٤]، هەموو ئەوانەی بۆ پشتگیری لە مانەوەی خۆی لە دەسەڵات و لاوازکردنی ئۆپۆزسیۆن سازکردبوو.

شا بۆ کەمکردنەوەی ناڕەزایی چەند جار بە دوای یەکدا سەرۆک وەزیرانی گۆڕی[٧٦٥]، کۆمەڵێك ڕێوشوێنی توندی گرتەبەر لەوانە گۆڕینی سەرۆکی (ساواك) و قەدەغەکردنی

---

٧٦٣- دامەزراوەی پەهلەوی: لە ساڵی ١٩٥٨ەوە دامەزرابوو، شا بۆ چاوبەستەکی گەلانی ئێران لە ڕێگەی ئەو دامەزراوەوە سامانی خۆی و خانەوادەکەی خستبووەگەڕ، تەنیا لە ڕووی زەوی و زارەوە ٨٢٠ گوندیان هەبووە، بێجگە لە کۆشك و باڵەخانەو... هتد، ئەو کۆمپانیایە پشکی لە زۆربەی پرۆژە ئابووری و بازرگانییەکانی وڵاتدا هەبووە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (ئەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٥٩-٦١)

٧٦٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئەنوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە ، ل٣٤٧-٣٤٨

٧٦٥- شا لە دوای ١٢ ساڵ لە سەرۆکی وەزیران عەباسی هوەیدای لابرد و جەمشیدی ئامووزگاری لە جێگای دانا، دواتر لە سەرەتای تشرینی دووەمی ١٩٧٨ حکومەتێکی عەسکەری بە سەرۆکایەتی (ژەنەراڵ ئەزهاری) دامەزراند، ئەحکامی عورفی ڕاگەیاند و زانکۆ و قوتابخانەکانی داخست، ئەو هەنگاوەشی ناکامی ئەبوو، لە ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٧٨ شاپور بەختیاری ڕاسپارد حکومەتێکی دەستووری پێ پێك بهێنێت.

خۆپیشاندان[٧٦٦]، بەڵام هیچ کاری نەکردە سەر کەمکردنەوەی ناڕەزایی‌و خۆپیشاندانی شارەکان. لەبەرانبەردا مانگرتنی سەرانسەری دەستی پێکرد، لە هەڵوێست وەرگرتن بۆ بەرەنگاری شاو بنەماڵەو ڕژێمەکەی دووبارە یەکدەنگی شەقامی ئێران پاڵپشتی ئەو هێزو ڕەوتە سیاسیانە بوون، کە لە بزواندنی ڕاپەڕین ڕۆڵیان هەبووە.

ئەگەر زۆربەی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان لە بەر لاوازی باری سەربازی‌و چەک‌و تەقەمەنی‌و بێ پشتیوانی دەرەکی ڕووخابن، ئەوە لەو بارەیەوە هەموو خواستەکانی لە چەک‌و تەقەمەنی سوپا بە زیادەوە تێر کرابوو، ئەو هێزەبووە، کە شای لە خۆبایی کرد ناکامەکەی بە ڕوخانی دوایی هات[٧٦٧].

## سێیەم: زەبروزەنگی دەزگای (ساواك)و سوپای ئێرانی لە بەرانبەر خەڵکی ئێران.

شا ڕاستەوخۆ دوو دەزگای هەستیاری وەکو سوپاو ساواکی لە ڕێگەی خۆیەوە بەڕێوەدەبرد، میزانیەی زۆری بۆ تەرخانکردبوو، ساواك تۆڕێکی گەورەی سیخوڕی لە ناو هەموو دامەزراوەکان‌و شوێنە گشتیەکان بڵاوکردبۆوە، سێ ملیۆن کارمەندو سیخوڕ لەو دامەزراوە کاریان کردووە، بۆ دامەزراندنی ئەو دەزگایە پشتی بە دەزگا هەواڵگریەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئیسرائیل بەستبوو[٧٦٨].

---

دوای ئەوە شا لە ١٦ای ئەو مانگە شا بە بێ دیاری کردنی ماوەی گەڕانەوە وڵاتی بەجێهێشت. ئەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٣٣١-٣٣٢.

٧٦٦- ئەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٤٧

٧٦٧- ڕانداڵ: کوردستان یان، ل٣٠٤

٧٦٨- الکیالي و الاخرون: موسوعة السیاسیة، ج٦/ص١٢١-١٢٢

بە هۆی ترس و تۆقاندنی دەزگای ساواك لە بەرتەسك کردنەوەی ئازادی ببووە هۆکاری رقی جەماوەری ئێران بەرانبەر شا[769]، کە رۆڵی سەرەکی هەبووە لە بەکارهێنانی توندوتیژی و هەوڵدان بۆ سەرکوتکردنی خۆپیشاندەران[770] ساواك لە دیدی گەلی ئێرانەوە بە ئارەزووی شا کاری کردووە، زانیاریەکانی لە سەر پەیوەندییە دەرەکی و ناوخۆییەکانی بۆ پاراستنی خۆیی و ساواکیش لە خزمەتی شا دابووە، لە سەر ئەو بنەڕەتەش بەرپرسان بۆ ساواك دیاریکراون[771]

ئێران خاوەنی دامەزراوەی گەورەی سوپا بووە، ئەفسەرە گەورەکانی هێزی ئاسمانی و زەمینی، داردەستی خواستەکانی شا بوون، بۆیە لە بەرانبەر خۆپیشاندانەکانی ئێران لە بەکارهێنانی هێز سڵی نەکردۆتەوە، لە مانگی ئەیلولەوە سوپا بە توندو تیژی بە رووی خۆپیشاندەران بۆوە، ئەمەش پەیوەندی نێوان بەرهەڵستکاران و شای پچڕاند[772]

## چوارەم: رۆڵی پیاوانی ئاینی و پارت و رێکخراوە بەرهەڵستکارەکان:

بەرەی ئۆپۆزسیون لە چەند ئاراستەیەکی تەواو لێك جیا پێکهاتبوو، بەڵام هەموویان لە سەر دروشمەکانی رووخانی شا کۆك بوون و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشیان بە پشتیوانی ئەو رژێمە دەزانی.

لەگەڵ ئەوەدا شا لەلایەن سوپا و دامەزراوەی بە هێز و تۆقێنەری (ساواك) پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام لەبەرانبەر یەکدەنگی و یەك هەڵوێستی بەرهەڵستکارانیدا

---

٧٦٩- نەزاغی: لە دەرباری شارە، ل٢١، السبكي: تأريخ ايران السياسي، ص١٩٨

٧٧٠-دونالد ولبر: ایرلن ماضیها و حاضرها، ص٢٠-٢١

٧٧١نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٢٠٠٥-٢٠٠٩

٧٧٢- هەمان سەرچاوە، ل٣٢١

دڵنیا نەبوو لە ئایندەی ڕژێمەکەی، یەکدەنگی نێوان گەلو پارتو ئاراستە سیاسییەکان[٧٧٣]، یەکدەنگی پارتو ڕێکخراوە سیاسییەکانو فەرمانبەرانو پیاوانی دامەزراوەکانی حکومەت. هەموو ئەو یەکدەنگیانە خاڵی بەهێزی بەرەی ئۆپۆزسیۆن بووە.

سەرەڕای بزاڤە سیاسیو ئایینیەکان بزاڤی ئازەریو کوردیو عەرەبی خوزستانو ئەوانی دیکەش هەبووە[٧٧٤]. ڕێککەوتننامەی جەزائیر بە تەنیا کاریگەری لە سەر تەنگپێهەڵچنینی بزاڤی کورد لە عێراق نەبوو، بەڵکو هێزە سیاسییە بەرهەڵستکارەکانی ئێرانیش لە لایەن عێراقەوە تەنگیان پێهەڵچنرابوو چالاکی ئەنجام نەدەن، بۆ نموونە (حدکا) ڕێگەی پێنەدەدرا عێراق بکاتە دەروازەیەك بۆ پەیوەندی کردن بە دونیای دەرەوەو تەنانەت خەباتی سیاسی بکات[٧٧٥]. دیارە ئەمەش کاریگەری هەبووە بۆ لاوازبوونی ئەو پارتە کە لە کاتی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران ڕۆڵی کاریگەری نەبێ. بە پێی ئاگاداری چاودێرێکی سیاسی، بە هۆی هاریکاری عێراق لەگەڵ ئێران، ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆنی کوردی لە ڕاپەڕینەکانی دژی ڕژێمی شا لاوازبووە[٧٧٦].

بزوێنەری سەرەکی خۆپیشاندانو مانگرتنەکانی سەرانسەری ئێران پیاوانی ئایینی شیعە بوون، لەگەڵ ئەوەدا چەند کەسایەتیەکی ئایینی سونی مەزهەب لە کوردستانی

---

٧٧٣-بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ئاراستە سیاسیو تۆژە جیاوازەکانی ئێرانو هەڵوێستیان بەرانبەر شا بڕوانە: (زهیر ماردینی: الثورة الایرانیة، ص١٠٣-١٠٧)

٧٧٤-جرجیس حسن: ترکیا في ستراتیجیة الامریکیة، ص١٢-١٣

٧٧٥- عەبدولڕەحمان قاسملو، عەبدوڵڵای حەسەن زادە: کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی، ل٢٧٩، ٢٨٣-٢٨٤

٧٧٦- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٥٢

ئێران لەو وەرچەرخانەدا رۆڵیان هەبووە[777]، راستە ئۆپۆزسیونی ئێرانی لە پێشەوە پیاوە ئاینییەکانی شیعە بزوێنەری سەرەتاو کۆتایی خۆپیشاندانو مانگرتنەکان بوون، بەڵام وەکو بەدەردەکەوێ هۆکارە بابەتییەکان لە خودی رژێمی شاوە بەرجەستە بووە، بۆیە ئۆپۆزسیون بەو ئاسانییە توانی جەماوەری بەرفراوان بخاتە گەڕ.

شاری قوم مەڵبەندی ئەو گردبوونەوەی پیاوانی ئاینی بووە، آمال السبکی دەنووسێت: ((ناتوانین خۆبپوێرین لە ئاماژە بە رۆڵی حەوزەی زانستی شاری قوم، ئەو دامەزراوە ئاینییە بەهێزەی هەموو لایەنە فقهییەکانی تێدا کۆبۆوە، لە سەردەستی پیاوانی ئاینی شایستە بۆ فەتواو ئیجتهاد، لە پاڵ ئەوەدا لاوان لە قۆناغەکانی قوتابخانەی حەوزە دەیانخوێند، حەوزە تەواو لە رووی ئابوورییەوە لەبەرانبەر دەوڵەت سەربەخۆ بووە..))[778]، کۆبوونەوەی پیاوانی ئاینی لە دەوری مەرجەعییەکانی شیعە پێشینەی هەیە، لە پاڵ پیاوانی ئاینی بازرگانە بچوکو گەورەکانیش لە رێگەی زەکات رۆڵی گرنگیان گێرا لە دابینکردنی پێویستییەکانی دامەزراوەی ئاینی، ئەو دوو توێژە بوونە پاڵپشتی بەردەوامی یەکتر[779]

خومەینی لە ساڵی ١٩٦٤ەوە بە هۆی ڕێبازی توندی لەبەرانبەر رژێمی شا لە ئێران دەرکرابوو، لە نەجەف دادەنیشت، بە هۆی ناکۆکی نێوان عێراقو ئێران بە زەحمەت دەنگی بە جەماوەری شیعەی ئێران رادەگەیشت، بەڵام دوای رێککەوتنامەی

---

٧٧٧- لە ناودارترین پیاوانی ئاینی لە کوردستان شێخ عیزەدینی حوسەینی لە شاری مهابادو مەلا شێخ جەلالی برای لە شاری بانەو ئەحمەدی موفتی زادە لە شاری سنە، لەبەرانبەردا (حدکا)و (کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) لە سەرەتاوە ئەو رۆڵەیان نەبووە. بڕوانە: (ئەنوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٦-١٧، ٢٥)

٧٧٨-تأريخ ايران السياسي، ص٢٦٦

٧٧٩- المصدر نفسه، ص٢٠٣

جەزائیر ڕێگەی زیارەتکارانی ئێرانی بۆ شوێنە پیرۆزەکان کرایەوە، لەو ڕێگەیەوە پەیوەندی نێوان خومەینی‌و جەماوەری شیعەش لە ئێران کرایەوە، لە کاتی زیارەت ئێرانیەکان وتارەکانی ئەویان لەگەڵ خۆیاندا دەبردەوە بۆ بڵاوکردنەوە[٧٨٠]. لە ڕاپەڕینی ٧ی کانوونی دووەمی ١٩٧٨ لە شاری (قوم) وتارەکانی خومەینی لە ڕێگەی کاسێتەکانیەوە دەگەیشتە خۆپیشاندەران‌و هانی دەدان بۆ ڕاپەڕین[٧٨١]. لە پەراوێزی کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەزیرانی دەرەوەی عێراق‌و ئێران ڕێککەوتن خومەینی لە عێراق دەربکەن، لە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٨ فەڕەنسا مافی نیشتەجێ بوونی پێدا[٧٨٢]، بەڵام ئەمجارە هێرشەکانی بۆ سەر هەردوو حکومەتی عێراقی‌و ئێرانی دەست پێکرد[٧٨٣]. چونکە لە فەڕەنسا دەرفەتی باشی بۆ ڕەخسا بتوانێ سوود لە میدیاکانی ئەوێ وەربگرێ، کۆمەڵێک کەناڵی ڕاگەیاندن بەرچاوی بینی لە گواستنەوەی پەیامەکانی خومەینی بۆ ئێران[٧٨٤]. ئەوی جێی سەرنج بووە هیچ کام لەو لایەنە کاریگەرانە هەتا ڕوخانی شا بەرنامەیەکی ڕۆشنیان نەبوو[٧٨٥]، هەر بۆیەشە لە دوای هەڵاتنی شا بۆ ماوەیەک ئێران بە حاڵەتێکی گەڕەلاوژەدا تێپەڕی.

---

٧٨٠- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٤٦-٣٤٧" نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل١٨" صلاح الخرسان: حزب الدعوة الاسلامية، دیمشق، ١٩٩٩، ص٢٧١)

٧٨١- أمال السبكي: تاريخ ايران السياسي، ص٢٠٠٢

٧٨٢- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل: ٣٥٠

٧٨٣-نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٤٨

٧٨٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا: کەناری دانوبەوە، ل٣٤٧).

٧٨٥- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل٣٦

لایەنێکی دیکەی سەرکەوتنی شۆڕشگێڕان بە ڕێبەرایەتی پیاوە ئاینیەکان[٧٨٦]، ئەو بیناگاییەی پێشتری دەسەلاتی شا بووە لەو توانا گەورەیەی ئەوانە هەیانبووە بە سەر خەلکی ئێرانەوە، ساواك بە درێژایی شەستەکانو حەفتاکان لە سەر بەرەنگاربوونەوەی یەك شێوە مەترسی خۆی ئامادەکردبوو، ئەویش چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی ڕێکخراوە کۆمۆنیستیەکان بووە، قورسایی هەوڵەکانی خستبووە سەر حیزبی تودەو ڕێکخراوە چەپەکانو جوجوڵی یەکیەتی سۆڤیەت، لەو بارەیەشەوە سەرکەوتنی بەرچاوی بە دەست هێنابوو، حیزبی تودە کە لە پەنجاکانی سەدەی رابردوو ڕۆڵی کاریگەری لە بزاڤی بەرهەڵستی شا هەبووە، بۆیە ئەو ڕۆڵە کاریگەرەی پیاوانی ئاینی بۆ شاو دەزگای ساواك چاوەڕوان نەکراوبوو[٧٨٧]

لایەنێکی دیکە خاڵی لاوازی شا خاسیەتی دەسەلاتی شاهەنشایی خۆی بووە، کە زۆر لە خۆی ڕازی بووەو ڕاوێژکارو ڕاوێژی قبوڵ نەبووە[٧٨٨]، ئەمە وای کردووە هەتا باری نارەزایی نەتەقیەوە هەستی پێنەکرد.

لە سەرەتای خۆپیشاندانەکان لە شاری (قوم) دەستی پێکرد، پیاوانی ئاینی لە ٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٨لەبەرانبەر یاسای ڕیفۆرمی کشتوکاڵیو یاسای پەرەپێدان بۆ ژنان لەو شارە خۆپیشاندانی گەورەیان سازدا، ئاکام بە هێزی توندو تیژیەوە ژمارەیەك کوژراوی لێکەوتەوە[٧٨٩]، بە بۆنەی چلەی شەهیدانی قومەوە خۆپیشانادنێکی گەورە لە شاری تەوریزی پایتەختی ئازەربایجانی ڕۆژهەلات کرا، هێرش

---

٧٨٦- بۆ پێگەی پیاوانی ئاینی لە ئێران بڕوانە: (دونالد ولبر: ایران ماضیها و حاضرها، ص٢٢-٢٣" زهیر ماردینی: الثورة الایرانیة، ص٨١)

٧٨٧- نەزاغی: لە دەرباری شارە، ل٢١٧-٢١٨

٧٨٨- هەمان سەرچاوە، ل٢١٦-٢١٧

٧٨٩- أمال السبکي: تأریخ ایران السیاسي، ص٢٠٢

کرایە سەر دامەزراوەکانی دەوڵەت، چەند دەزگار ئۆتۆمۆبیلی دەوڵەت سوتان‌و بە هۆی شەڕو پێکدادانەوە ژمارەیەك کوژران[٧٩٠] هەر لەو خۆپیشاندانە هێرش کرایە سەر سینەماو قومارخانەکان‌و بارەگاکانی حیزبی دەسەڵاتدار، دووبارە پیاوانی ئاینی لە شاری تەورێز لە ڕۆژی هەینی داوایان لە شارەکان کرد لە چلەی ئەو شەهیدانە دەست بکەنەوە بە خۆپیشاندان، لە ئاکامی بە پیەوچوونی ئەو بانگەوازەش لە شارەکانی ئەسفەهان‌و تاران خۆپیشاندان دەستی پێکرد، وردە وردە پەرەی سەند، تا وای لێهات هەموو شارەکانی ئێرانی گرتەوە. بە گشتی لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٧٨ خۆپیشاندان زیادی کردو لە پاڵ ئەوەدا هێرش دەکرایە سەر دامەزراوەکانی حکومەت[٧٩١]، پەنا برایە بەر هێزو تەنانەت سوپار فڕۆکە بەکارهێنرا بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکان بەڵام بە بێ ئاکام بوو[٧٩٢]. لەو ڕاپەڕینانەدا پیاوانی ئاینی ڕۆڵی سەرەکیان گێڕا[٧٩٣]، وەکو بەدەردەکەوێ ئەوە زیاتر ڕاپەڕین بووە نەك خۆپیشاندان.

گیانی بەرەنگاری بەتەنیا لە پیاوانی ئاینی‌و ڕێکخراوە سیاسیەکان کورتهەڵنەهاتبوو، لە شەستەکانەوە گیانی شۆڕشگێڕی لە زانکۆکانی ئێران بڵاببوەوە، لەو نێوەندەشدا بیروبارەوەڕی چەپو ئاینی‌و لیبراڵی بووە هەوێنی بیرکردنەوەی ناوەندەکانی زانکۆکە وەکو ناوەندێکی ئامادە بۆ بەرەنگاری ڕژێمی شا ڕۆڵی بەرچاو بگێڕێ[٧٩٤]. کە لەڕاستیدا ڕۆڵی زانکۆ لە سەرەتای شۆڕشی گەلانی ئێران ڕۆڵێکی چالاکو گرنگە.

---

٧٩٠- عەبدوڕەحمان قاسملو، عەبدوڵڵای حەسەن زادە: کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی، ل٣٨٤.

٧٩١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئەنوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٤٧-٣٤٩)

٧٩٢- آمال السبكي: تأريخ ايران السياسي، ص٢٠٠٣

٧٩٣- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ئەمزاغی: لە دەرباری شاوە، ل١٢-١٥)

٧٩٤- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (دونالد ولبر: ايران ماضيها و حاضرها، ص١٤-١٥)

لە سەرەتای ئەیلولی ساڵی ١٩٧٨ لە ڕۆژی هەینی ڕاپەڕینێکی گەورە لە تاران کرا، حکومەت بە توندو تیژی بەرەنگاری بۆوە، هەتا (٥٠٠) کەس کوژرا[٧٩٥]، ئەمە وەرچەرخانێك بوو لە ڕێڕەوی ئەو ڕاپەڕینە، لێرەوە ڕۆڵی خومەینی زیاتر بە دیارکەوت، جەماوەر لە دروشمەکانیان داوای ئازادیان دەکرد، لە دوای ئەو کارەساتەی تاران ڕێڕەوی ڕاپەڕینەکە گۆڕا بۆ مانگرتن، بەو هۆیەوە زانکۆو فەرمانگەو کارخانەو دامودەزگانی دەوڵەت لە کارکەوتن[٧٩٦]. سەرەڕای فراوانبوونی مانگرتن بۆ بازاڕو دوکاندارەکان، هەتا مانگرتن فراوان بوو بۆ ئەو کەرتانەی بۆ حکومەت کاریگەرن، وەکو کرێکارانی کارگەکانی نەوت، بانکەکان‌و رادیۆو تەلەفزیۆن[٧٩٧]

بۆ دامرکاندنەوەی ناڕەزاییەکان لە ١٩٧٨/١٢/٢٩ (شاپوور بەختیار)[٧٩٨] کرا بە سەرۆکی وەزیران، بەڵام مانگرتن گۆڕانی بە سەردا نەهات[٧٩٩]. حکومەتی تازە لەلایەن بەرەی ئۆپۆزسیونەوە قبوڵ نەکرا، شاپور بەختیار بە ناچاری وڵاتی بەجێهێشت‌و چووە فەرەنسا[٨٠٠].

---

٧٩٥- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٣٩٩

٧٩٦-هەمان سەرچاوە، ل٣٩٩

٧٩٧- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٦

٧٩٨- شاپور بەختیار: پێشتر ئەندامی بەرەی نیشتیمانی ئێرانی بووە بە سەرۆکایەتی (موسەدق). یەکێك بووە لە بەرهەڵستکارانی شا، بە هاتنی سەرانی تازەی شۆڕش دڵخۆش نەبووە، دوایی ئێرانی بەجێهێشت. (الكيالي و الاخرون: الموسوعة السياسية، ج١/ ص٤٩٨-٤٩٩)

٧٩٩- أمال السبكي: تأريخ ايران السياسي، ص٢٢٠" هەڵی کەندی: فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان‌و وڵاتانی جیهان، هەولێر ٢٠٠٥، ل٧١

٨٠٠- أمال السبكي: تأريخ ايران السياسي، ص٢٢٠

لە ١٦ای کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ شا ئێرانی بە جێهێشت[٨٠١]، دیارە ئەوەش لە ژێرفشاری مانگرتندا، لە ١ی شوباتی ئەو ساڵە خومەینی گەڕایەوە ئێران‌و روخانی یەکجاری شا راگەیەنرا[٨٠٢].

لەم وەرچەرخانەدا هەر زوو ئێران بە رەسمی پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل پچڕاندو یاسر عەرەفات سەردانی تارانی کرد، لە مانگی شوباتەوە ئەوجا خۆپیشاندان بۆ پشتگیری لە رژێمی تازە، کە خومەینی‌و هاوەڵانی رێبەرایەتیان دەکرد دەستی پێکرد. هەر لەو مانگەدا (نعمت الله النصیری) سەرۆکی ساواک‌و ژمارەیەك لە گەورە بەرپرسانی پێشووی سوپا لە لایەن شۆڕشگێرانەوە لە سێدارە دران. لە کۆتایی شوباتدا بە رەسمی رژێمی پاشایەتی هەڵوەشێنرایەوەو کۆماری ئیسلامی راگەیەنرا[٨٠٣]. ئەمە سەرەتای چەسپاندنی دەسەڵاتی تازە بوو، لێرەوە دۆستانی شا لە ئێران‌و دەرەوە بێ ئومێدبوون، کە شا جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە بۆ ئێران[٨٠٤].

یەکەم کابینەی حکومەتی دوای رۆیشتنی شا بە رەزامەندی خومەینی لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٩ز راگەیەنرا، کە حکومەتێکی کاتی بوو بە سەرۆکایەتی

---

٨٠١- جرجیس حسن: ترکیا في ستراتیجیة، ص٦٧" ئەم ناونیشانە ئەلیکترۆنیە: www.aljazeera.net

٨٠٢- أمال السبکي: تأریخ ایران السیاسي، ص٢٢٠ " عەلی کەندی: فەرهەنگی رووداوەکانی، ل٧١" وەزارەتی رۆشنبیری‌و راگەیاندن، دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی، بۆچی رێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوان عێراق‌و ئێراندا هەڵوەشایەوە؟، بغداد ١٩٨١، ل١١

٨٠٣- نەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٣٣٢-٢٣٠

٨٠٤- دوای ئەوەی شا بە ناوی سەفەر ئێرانی بەجێهێشت چەند وڵاتێك گەڕار دوایی لە میسر نیشتەجێ بوو، هەتا لە ٢٧ای تەموزی ساڵی ١٩٨٠ بە نەخۆشی شێرپەنجە مرد. بڕوانە: ئەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٣٣٢)

(مەهدی بازرگان)[٨٠٥]، بازرگان زیاتر لە لیبراڵە میانەڕەوەکانەوە نزیك بووە، زۆربەی کابینەی وەزارەتەکەی لە کەسانی لیبراڵو عەلمانی پێکهاتبوو، بەڵام ئەو حاڵەتە درێژەی نەکێشا، حکومەتی بازرگانیش کەوت، خومەینیو هاوەڵانی لە یەکەم هەنگاویاندا کەوتنە بە هێزکردنی دامەزراوەی ئایینیو بە دەستهێنانی هاوسۆزی جەماوەر، حکومەتێکی دیکە بە سەرۆکایەتی (بەنی سەدر)[٨٠٦] پێك هات، بەڵام ئەو حکومەتەش لە بەرانبەر رەوتی خومەینیو هاوبیرانی لاوازبووە، هێندەی نەبرد لە سەر شێوەی بەڕێوبردنی حکومەت ناکۆکی کەوتە نێوان خومەینیو بەنی سەدر[٨٠٧].

وەکو دەردەکەوێ لە کوردستان ئەو کوتوبەندانەی لە سەر خنکاندنی شۆڕش لە ئازاری ساڵی ١٩٧٥ یەکیانگرتبوو، لە پێشەوەیان رێککەوتنی عێراقو ئێران بە روخانی رژێمی شا نەما، رژێمی شا کە لایەنێکی سەرەکی پیلاندارێژەری دژ بە سەرهەڵدانەوەی بزاڤی سیاسیو چەکداری بووە لە کوردستان نەما، ، شا لەو بارەیەوە

٨٠٥- مەهدی بازرگان: پێشتر لە نزیکەکانی بەرەی نیشتیمانی ئێرانی بووە بە سەرۆکایەتی موسەدەق، لە ژمارەیەك رێکخراوی مەدەنی رۆڵی هەبووە، لەگەل هەندێ لە پارتە بەرهەڵستکارەکانی دژ بە شا کاری کردووە، دوای روخانی شا بە فەرمانی خومەینی یەکەم کابینەی حکومەتی لە سەردەمی کۆماری پێك هێنا. بڕوانە: (ئەزاغی: لە دەرباری شاوە، ل٣٤١' الکیالي و الاخرون: موسوعة السياسية، ج٥/ ص٤٧٢' هۆشمەند عەلی مەحمود: عەبدولڕەحمان قاسملور ، ل٦٠)

٨٠٦- بەنی سەدر: بە نەخشەدارێژەری راستەقینەی شۆڕشی ئێرانی دەژمێردرێ، نیزك بووە لە خومەینیەوە، بووە بەڕاوێژکاری مەهدی بازرگان بۆ کاروباری ئابووری، خاوەنی بیرۆکەی پێکهێنانی پاسەوانی شۆڕشەو بە ئیمام دانانی خومەینیو پچڕینی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا بووە، لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩ کرایە سەرۆکی حکومەت دەیویست نوێنەرایەتی باڵی میانەڕەوی شۆڕی ئیسلامی بکات، لەوەدا سەرنەکەوت، وازی هێناو وڵاتی بەجێهێشت. بڕوانە: (دونالد ولبر: ایران ماضیها و حاضرها، ص٨، ٣١-٣٢ فاضل رسول: العراق- ایران، ٥١)

٨٠٧- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (أمال السبکي: تاریخ ایران السیاسي، ص٢٣٩-٢٤٦)

دژسیەی مێژوویەکی رەشی لە هزری شەڤامی کوردستاندا هەبووە[808]. لێرەوە ئاسۆ روونیەك بۆ بزاڤی کورد بەدیارکەوت، چونکە ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ پوچەڵبوونەوەی مادەکانی رێککەوتننامەی جەزائیر

لەگەڵ ئەوەدا دوای روخانی رژێمی شا پارتو رێکخراوەکانی کوردستان گەشەیان کرد، هێزی (پ.م) زیاتر بوو، چالاکی سیاسیو راگەیاندن زیادی کرد، ئەندامو لایەنگری بزاڤی سیاسی کوردستان رووی لە زیادی کرد[809].

لەو چوار ساڵەی عێراقو ئێران تەبا بوون، هەردوو وڵات گرفتی ئۆپۆزسیونیان هەبووە، زۆر بە هەستیاریو هاریکاری مامەڵەیان لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا کردووە، بۆ پاراستنی پەیوەندییەکانیان گەمارۆی ئۆپۆزسیونی بەرانبەر یەکتریان دابوو[810]، بۆیە لە هەموو رووبەکەوە روخانی شا وەرچەرخانێکی گەورە بووە لە پەیوەندییەکانی عێراقو ئێران، سروشتی رژێمی تازە لەگەڵ رژێمی شا تەواو جیاواز بوو، بۆیە شێوازەی پەیوەندییەکان تێکچوو.

لە سەرەتاوە حکومەتی عێراقی بە چاوی گومانەوە دەیڕوانیە سەرانی ئۆپۆزسیونی دژ بە شاو پێشوازی ئەو گۆڕانکاریانەی نەکرد[811]، دەکرێ مەترسی هەبووبێ لە تێکچوونی رێککەوتنی نێوان هەردوو حکومەت.

لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٨وە لە پاریس وەفدی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) سەردانی خومەینیان کردبوو[812]، لەگەڵ گەڕانەوەی خومەینی بۆ ئێران جارێکی دیکە

---

٨٠٨- بڕوانە: بەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیە.

٨٠٩- بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: (فاتیح رسول: بنچینەی مێژووی بیرکەی چەپ، ل٣٦٠-٣٦١)

٨١٠- نەوشیروان مستەفا: لە کەناری دانوبەوە، ل٢٥٠

٨١١- ترێب: صفحات من تأریخ، ص٢٩٢° حامید محمود عیسی: القضیة الکردیة، ص٢٩٦

له تاران سەردانیان کرد، لەوێوە پەیوەندی نێوان (ی.ن.ك) و ڕژێمی تازە دروست بوو[813].
ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە سەرەتای ڕووداوەکانی ئێرانەوە ویستوویانە بە قازانجی بزاڤی کوردستانی عێراق سوودی لێوەرگرن.

لە بەرانبەردا (پ.د.ك)یش پێشوازی لە ڕوخانی ڕژێمی شا کرد، لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ دوو لە ئەندامانی بەرپرسی خۆی ناردە پاریس بۆ دیداری خومەینی، لەو کۆبوونەوەیەکدا تاوتوێ هاریکاری یەکتریان کرد بوو[814]. مستەفا بارزانی بە بۆنەی سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران بروسکەی پیرۆزبایی ناردە بۆ خومەینی، لەو بروسکەیەدا سەرەڕای دەبڕینی نیگەرانی لەبەرانبەر ڕژێمی پێشوو، هیواو ئومێدی زۆری لە سەر ئایندەی دەسەڵاتی تازە هەڵچنیبوو[815]، لە دوای گەڕانەوەی خومەینی وەفدی (پ.د.ك) سەردانی خومەینیان کرد لە ئێران[816]. ئەوکات (پ.د.ك) زیاتر لە (ی.ن.ك) و هێزە سیاسیەکانی دیکە کەرەستەکانی خەباتی سیاسی و چەکداری کەوتبووە ژێردەسەڵاتی حکومەتی ئێران، چونکە ئەو پەناهەندانەی لە ئێران مابوونەوە زیاتر کەرەستەی خەباتی (پ.د.ك) بوون.

لە کاتی هێنانەوەی لاشەی مستەفا بارزانی کوردستانی ئێران بۆ شاری (شنۆ)، لەگەڵ ئەوەشدا ڕژێمی تازە لە سەرەتای دەسەڵاتی بوو، بایەخی بە مەراسیمی

---

٨١٢- الحرصان: التيارات السياسية، ص٣٨٧

٨١٣- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل٢٢

٨١٤- البديل الثوري في الحركة التحريرية الكردية، ب م،١٩٨١، ص٢٦

٨١٥-بڕوانە: دەقی نامەی ناوبراو لە بەڵگەنامەی ژمارە (١٢).

٨١٦- الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٥٣

ئاشتنەکەیدا[٨١٧]. هەر لەو روانگەیەوە بۆ پەناهەندەکان رەخسا بەشداری لە خەباتی سیاسی‌و چەکداری بکەن.

لە سەرەتای تشرینی دووەمی ١٩٧٩ (پ د ك) کۆنگرەی نۆیەمی خۆی گرتدا[٨١٨]، سەرۆکی تازەی هەڵبژارد، راپۆرتی سیاسی‌و سەربازی پەسەند کردو سەرکردایەتی تازەی هەڵبژارد[٨١٩]. لە بریارەکانی کۆنگرەو بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرەدا داوا لە حکومەتی ئێران کردووە رێککەوتننامەی جەزائیر هەڵبوەشێنێتەوە[٨٢٠]، لە راپۆرتی سیاسی‌و عەسکەری کۆنگرەی نۆدا هاتووە: ((گومان لەوەدا نییە کە سەرکەوتنی گەلانی ئێران بە سەر رژێمی شادا سەرکەوتنی گەورەیە بۆ گەلی کوردو هەموو گەلانی ژێردەست لە جیهاندا...))[٨٢١]. حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پشتیوانی کردنی هێزە بەرهەڵستکارەکانی کورد لە کوردستانی عێراق حیسابی بۆ رێککەوتننامەی جەزائیر نەکرد، لە بەرانبەردا حکومەتی عێراقیش هەمان هەنگاوی هەڵگرت، کەچی حکومەتی ئێران بە رەسمی رێککەوتننامەکەی هەڵنەوەشاندەوە.

---

٨١٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: البارزاني: البارزاني والحركة، ج٣/ص ٤٢٢

٨١٨- حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص١٥٨

٨١٩- بۆ ئەدەبیاتی کۆنگرەی نۆیەمی (پ د ك) لە راپۆرتی سیاسی‌و عەسکەری، بریارەکانی کۆنگرە، بەلاغی کۆتایی بڕوانە: (حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص٣٧١-٤٠٤)

٨٢٠- بڕوانە: بریارە سیاسیەکانی کۆنگرەی نۆیەمی (پ د ك) لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩. لە کتێبی (حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص٣٩٠)

٨٢١- بڕوانە: راپۆرتی سیاسی‌و عەسکەری‌و تەنزیمی سەرۆکی پارتی (مسعود بارزانی) بۆ کۆنگرەی نۆیەمی (پ د ك) لە سەرەتای تشرینی دووەم ١٩٧٩. بەلاغی کۆتایی هاتنی کۆنگرەی نۆیەمی (پ د ك) —عێراق. لە کتێبی (حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني، ص٢٨١، ٤٠٠)

به بۆچوونی بەرپرسانی ئێرانی (ی.ن.ك) حیزبێكی چەپەو لە رووی ئایدۆلۆژییەوە ناكۆكیان لەگەڵیدا هەیە[822]، بەڵام زیادبوونی ناكۆكییەكانی عێراق و ئێران و بەرژەوەندیان لە هاریكاری بەرهەڵستكارانی لەوە گەورەتر بوو حیساب لە سەر ئەو خاڵانە بكەن، لەگەڵ لایەنە چەپو لیبراڵەكانی ئێران و پارت و رێكخراوە كوردییەكانی كوردستانی ئێران دەكرد كەوتبوونە شەڕی ئایدۆلۆژی.

لە ئابی ۱۹۷۹ جەلال تاڵەبانی سەردانی تارانی كرد، چاوی بە خومەینی و زۆربەی بەرپرسانی ئێرانی كەوت، داوای لێكردبوون بە پارەو چەكو تەقەمەنی و ئازوقە یارمەتیان بدەن و رێگە بدەن بە هێنانی چەكو تفاقی جەنگی لە سوریا، لەگەڵ كارئاسانی هاتوچۆ بە ناو خاكی ئێران و چارەسەری برینداروەكان لە نەخۆشخانەكانی ئێران، ئێران بەشێك لە داواكاریەكانی قبولكرد[823].

لە چوارچێوەی ئەو دەرفەتە تازەی دوای روخانی رژێمی تازە، الخرصان دەنووسێت: ((بە روخانی شا لە ۱۱/۲/۱۹۷۹ (ی.ن.ك) متمانەی بە خۆی بە هێز كرد، ئەو هاریكاریە قورسەی لە سەر شان لاچوو، كە پێشتر لە نێوان سەرۆكی ئەركانی سوپای عێراقی و ئێرانیدا هەبوو بۆ لە ناوبردنی ئەوان))[824]. (ی.ن.ك) لە رووی كەرەستەی راگەیاندنیشەوە بوژایەوە، ئامێرێكی رادیۆی لە دەرەوە هێنا و لە ۲۱/۳/ ۱۹۷۹ خستیەگەڕ[825]، بە ناوی رادیۆی دەنگی (شۆڕشی عێراق)[826].

---

۸۲۲- نەوشیروان مستەفا: پەنجەكان، ل۱۵۸.

۸۲۳- هەمان سەرچاوە، ل۱۱۲

۸۲٤- التيارات السياسية، ص۲۸۷

۸۲٥- المصدر نفسه، ص۲۸٦

لەبەرانبەردا (پ.د.ك)یش چالاكیە سەربازیەكانی خۆی چڕ كردەوە دژی سوپای عێراقی[٨٢٧]. گەرچی ئەو چالاكیانە لە سنوورێكی بەرتەسك دابوون، چونكە ئەوكات بە هۆی شەڕی نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) پێشمەرگەكانی (پ.د.ك) لە زۆربەی سنووری كوردستانی عێراق دابڕابوون.

حیزبی بەعس لەو قۆناغە هەستیارەدا لە جیاتی پەیوەندیەكانی لەگەڵ (حشع) پەرەپێبدات بە پێچەوانەوە شاڵاوەكانی تەنگپێهەڵچنینی بۆ سەر ئەوان چڕكردەوە، هەتا لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ لە ژێر ئەو گوشارەدا لە (بەرە) كشایەوە[٨٢٨]، بۆ ڕوخانی دەسەڵاتی بەعس چووە شاخ و بڕیاری بەشداریكردنی شۆڕشی چەكداریدا[٨٢٩].

جەمال نەبەز دەڵێ: ((... سەدام حوسێن بۆی بە دەركەوت دوژمنە هەرە گەورەكەی واتە خومەینی دێتە سەركار، ئەوجا ویستی لە كۆمۆنیستەكان نزیك بێتەوە، داوای لێكردن... بەڵام نەگەیشتنە ئەنجام))[٨٣٠]. لە ڕووی بابەتیەوە لە ڕاستیەوە نزیكە، بەڵام وەكو ئاماژە هەیە حیزبی بەعس لەو كاتە قورسایی پەیوەندیەكانی و گرێبەستی كڕینی كەرەستەی جەنگی لە سەر سۆڤیەت نەمابوو، جەختی زیاتری لە سەر ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و فەڕەنسا و ئەڵمانیا و بەرازیل و ئیتالیا بوو،[٨٣١]. كاتی خۆی

---

٨٢٦- ئاماژە هەیە بەرە لە دوای كۆبوونەوەی وەفدی (تودع) لەگەڵ سەركردایەتی (ی.ن.ك)، بە هاوبەشی گەیشتوونەتە ئەو بڕیارەی كە دەبێت بە ناوی (شۆڕشی عێراق)ەوە بەخش بكرێ. بڕوانە: - (الحرصان: التیارات السیاسیة ، ص٢٨٧)

٨٢٧- البدیل الثوري في الحركة التحرریة الكردیة، ص٢٩

٨٢٨- نەوشیروان مستەفا: پەنجەكان، ل٣٠-٣١

٨٢٩- فاتیح رسول: لە ناو كاروانێكی دوور و درێژدا، ل٢٣٨" نەوشیروان مستەفا پەنجەكان، ل٣٠-٣١.

٨٣٠- ئیدۆلۆژیای هوردە بورژوای، ل٥١-٥٢.

٨٣١- ماریون ویتر سلوجت، العراق الحدیث، ص٢٤٤-٢٥٦

هاوپەیمانیەتی لەگەڵ (حشع) ڕەهەندێکی دەرەکی هەبووە زیاتر لەوەی ڕەهەندێکی ناوخۆیی هەبێت، بەشێك بووە لە ڕازیکردنی یەکێتی سۆڤیەتو وەکو چاودێرێکی سیاسی ڕوونی دەکاتەوە، کە عێراق لە واژۆکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر ڕاوێژی بە سۆڤیەت نەکردو ئەو ڕێککەوتنە بۆ ئەویش جێی سەرسوڕمان بووە[832].

لە خۆبایی بوونێکی دیکەی حکومەتی عێراقی ئەوە بووە لەو کاتە ناسکەدا لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٠ ڕەگەزنامەی لە کوردە فەیلیەکان وەرگرتەوەو وەزیری ناوخۆی ڕاسپارد بە زۆریی لە عێراق دەریان بکات[833].

ڕێبەرانی شیعە لە عێراق لە نوێژی هەینیو بۆنە ئاینیەکانیاندا هێرشیان دەکردە سەر دەسەڵاتی بەعس، لە بەرانبەردا حکومەت کەوتە شاڵاوێکی بەرفراوانی ڕاوەدوونانو گرتنیان، هەتا (موحەمەد باقر سەدر)[834] زانای ناوداری ئەوانی گرتو لە سێدارەیدا، بەمەش ناڕەزایی گەورەی لە ناو شیعەکانی عێراقو جیهان دروست کرد،

٨٣٢- ایوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية و صراع القوى، ص٣٤٤

٨٣٣-بە بڕیاری ژمارە (٦٦٦) لە ٧/٥/١٩٨٠، حکومەتی عێراقی ئاوانی دڵسۆز نەبوون بۆ عێراقی دابوونە پاڵ. بڕوانە: (کازم حەبیب: مەینەتی کوردە فەیلیەکانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٢٣، پاییزی ٢٠٠٢، ل١٠٤-١١٤" ماریون فاروق سلوغلت، بیتر سلوغلت، من الثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨، ص٣٣٧-٣٣٨)

٨٣٤- موحەمەد باقر سەدر: لە ساڵی ١٩٣٥ لە کازمیەی بەغدا لە دایك بووە، لە مەرجەعیە باڵاکانی شیعەی عێراق بووە، ڕۆڵی هەبووە لە زۆربەی ئەو چالاکیانەی ئیسلامیەکان لە ساڵانی پەنجاکان ئەنجامیان داوە، چەند جار گیراوە، خاوەنی ٢٥ کتێبو لێکۆڵینەوەی فیقهیو فیکریو ئابووریو سیاسی بووە، لە ٥ی نیسانی١٩٨٠ حکومەتی عێراق لە سێدارەی دا. بڕوانە: الحرصان: حزب الدعوة الاسلامية، ص٧٠-٧٢

بەلام بەعس بەتوندی بەرەنگاری هەموو نارەزاییەکانی شیعە بۆوە[٨٣٥]، پێناچێ حکومەتی عێراق لە سەرەتاوە هەستی بەو کاریگەرییە گەورەیە کردبێ بە سەر شیعەکانی عێراق، وەکو سەرچاوەیەك ئاماژەی پێدەکات موحەمەد باقر سەدر بە بۆنەی سەرکەوتنی گەلانی ئێرانەوە بە ئاشکرا پیرۆزبایی لە خومەینی کرد[٨٣٦]، پێدەچێ ئەمەش بۆ حکومەتی عێراق چاوەڕوانکراو نەبووبێ.

ئەو بارودۆخی گونجاوە بۆ بزاڤی سیاسی کوردستان هاتە ئاراوە، بەلام وەکو بەشداربوویەکی رووداوەکانی ئەوکات دەنووسێ: ((ئەگەر هەموو رێکخراوە کوردییەکانی عێراق لای ئێرانییەکان دژی یەکتر قسەیان نەکردبایەو نهێنییەکانی یەکتریان بۆ ئێران ئاشکرا نەکردایە، بەدەنگێکی یەکگرتوو داواکانی خۆیان بخستایە بەردەمیان، بێگومان رێزی کوردی عێراق زیاتر دەبوو، لەوانەیش بوو زۆری داواکانیان کە بریتی بوو لە پشتیوانی سیاسیو یارمەتیدانی مادی دژی بەعس جێبەجێ بکرایە..))[٨٣٧].

هێرشەکانی حکومەتی ئێرانی بۆ دووبارە کۆنترۆلکردنەوەی کوردستانی ئێران، ناکۆکی زیاتری خستە ناو (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) بەوەی یەکەمیان پشتگیری (حدکا)و دووەمیان پشتگیری حکومەتی ئێرانی کرد، زیاتر ناکۆکیەکانیان قوڵبۆوە[٨٣٨].

---

٨٣٥- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ترب: صفحات من تأريخ العراق، ص٢٩٢-٢٩٣؛ ئینتیسار: ئینتۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٦٩--٢٧٠)

٨٣٦- صلاح الخرسان: حزب الدعوة الاسلامية، ص٢٥٩-٢٦١

٨٣٧- نەوشیروان: پەنجەکان، ل٢٣.

٨٣٨-بڕوانە: (نەوشیروان: پەنجەکان، ل٢٢-٢٣؛ الخرسان: التيارات السياسية، ص٢٥٤؛ هۆشمەند عەلی مەحمود: عەبدولرەحمان قاسملوو ، ل١٠٥)

لەلایەکی دیکەوە سەرەڕای دوو لەتبوونی (ی.ن.ك) بە جیابوونەوەی (حسك) لە بەهاری ١٩٧٩و یەکەم کۆنگرەی خۆیان بەست[٨٣٩]. هەر لە پایزی ١٩٧٩ (پ.د.ك) کۆنگرەی نۆیەمی خۆی بەست، لەو کۆنگرەیەدا بەشێکی لێ جیابۆوە[٨٤٠]، بۆشاییان لەو پارتە دروست کرد[٨٤١]، پێیان وابووە ئەو کۆنگرە کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی پەناهەندەکانی ئێران بووە نەك کۆنگرەو لە ئاستی ڕووداوەکاندا نەبووە[٨٤٢]، هەتا دواتر ئەوانە پارتێکی نوێیان ڕاگەیاند[٨٤٣].

سەرەڕای هەڵگیرسانی شەڕی نێوان (ی.ن.ك)و (حسك)، هەر لە پایزی ١٩٧٩ (حسك) بە تەنیا لەگەڵ حکومەتی عێراق کەوتە گفتوگۆ[٨٤٤]. پێدەچوو حکومەتی لەو گفتوگۆیەدا ڕستبێتی ئەو حیزبە لە ئەوانی دیکە دابڕێ، چونکە نیشانەکانی ناکۆکی هەردوو حکومەتی ئێرانو عێراق تا دەهات قوڵتردەبۆوە.

ناکرێ ئەو هەنگاوانە نادیدە بگیرێ، کە حکومەتی بەعس هاوڕێشتوویەتی لە پێناو بەهێزکردنی دەسەڵات، هەنگاوەکانی عێراق لە ئاستی عەرەبیو نێو دەوڵەتی ئەوە بەدەردەخەن، کە عێراق ویستوویەتی قەرەبووی بێهێزی ڕابردووی بکاتەوە، لە ئاستی

٨٣٩- بڕوانە: ئاغاو شێخو دەوڵەت، ل٦٠" الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٥٨

٨٤٠- بڕوانە: (بڕوانە: ئاغاو شێخو دەوڵەت، ل٦٠" الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٥٨

٨٤١- الحرصان: التيارات السياسي، ص٢٥٨" علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية، ص٦٢

٨٤٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (البديل في الحركة التحررية الكردية، ص٣٣)

٨٤٣-(سامی عەبدوڕەحمان، نوری شاوەیس، ڕویا سالح ساعاتی، ئازاد خەفاف، کەریم سنجاری،..هتد.) هەندێکیان گەڕانەوە ناو "پ.د.ك" بەڵام ئەوانی دیکە (پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان)یان دامەزراند.
بڕوانە: الحرصان: التيارات السياسية، ص٢٨٤

٨٤٤- نەوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٢٨-١٢٩" دیداری توێژەر لەگەڵ بەڕێز قادر عەزیز لە٢٠٠٦/٩/٧ لە سلێمانی.

ناوخۆ لە هەوڵی دروستکردنی پێگەیەکی بەهێز دابوو، ناکۆکیە عەرەبیەکانی دەقۆزتەوە بۆ بەهێزکردنی پێگەی عێراق، لە سەر ئاستی ناوخۆش زیاتر بەرەو دیکتاتۆریەت هەنگاوی دەنا، شاڵاوەکانی بەعەرەبکردنی چڕتر دەکردەوە[٨٤٥]، بەعس وەکو حیزبی سەرکردە (حزب القائد) بەسەر هەموو هەنگاوێکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو فەرهەنگی وڵات بەرجەستە دەکرد.

لە ١٥ی نیسانی ساڵی ١٩٧٥ (رێککەوتننامەی هاریکاری بۆ بەکارهێنانی ئاشتیانەی وزەی ناوکی) لە نێوان سۆڤیەتو عێراق واژۆکرا[٨٤٦]، لەپاڵ ئەو پەیوەندەیەدا راستەوخۆ دوای رێککەوتننامەی جەزائیر لە ساڵانی ١٩٧٦و ١٩٧٧ عێراق لە سەرقاڵی گرێبەستی کڕینی کەرەستەی جەنگی فڕۆکەو دەبابەو زرێپۆشو پاپۆڕی جەنگی پێشکەوتوو بوو لەگەڵ فەڕەنساو بەرازیلو ئیتالیا[٨٤٧]، لە نیسانی ساڵی ١٩٧٨ رێککەوتنی ئاسایشی.لەگەڵ تورکیا مۆرکرد، بە پێی ئەو رێککەوتننامەیە تورکیا بۆی هەبوو بۆ راوەدوونانی شۆڕشگێڕانی کورد سنووری عێراق ببەزێنێت[٨٤٨]، دەکرێ ئەو هەنگاوانەشی سەرئەنجامی ئەو ئاساییکردنەوە بێ لەگەڵ وڵاتانی رۆژاوا.

حکومەتی عێراق زۆر بە پەلە ئیدانەی سەردانی ساداتی کرد بۆ ئیسرائیل، پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ میسر پچڕاند، بەوە نەوەستا لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨سەرکردە عەرەبەکانی بۆ کۆبوونەوەی لوتکە بانگردە بەغدا، لە شوباتی

---

٨٤٥- سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان ، ل٦٠؛ نوري الطالباني: منطقة كركوك، ص٦٠

٨٤٦- الوقائع العراقية، عدد (٢٤٨٦) في ١٩٧٥/٨/٢٥.

٨٤٧- ماريون ريتر سلوجت، العراق الحديث ص٢٥٦، ٢٤٤

٨٤٨- مەکدواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٥٧١

ساڵی ١٩٨٠ دووباره کۆبوونەوەی لوتکە لە بەغدا بەسترا، وای لێهات حکومەتی عێراق خۆی بە خەمخۆری عەرەبەکان نیشان بدا[٨٤٩]. لە وتاری یادی دامەزراندنی سوپای عێراقدا سەدام حوسێن هێرشی کردە سەر رێککەوتننامەی (کامپ دیڤد)[٨٥٠]و ئەنوەر سادات ، گوایە ئێران ئەو دەرفەتەی قۆستبێتەوە بۆ دژایەتی عەرەب، عێراقیش هەر لە بەر ئەوە بووە سازشی بۆ شای ئێران کردووە[٨٥١]، هەتا کار گەیشتە ئەوەی لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ لە کۆنگرەی عەرەبیدا بڕیار بدرێت بەرەیەکی دژی سادات پێک بێت، هەروەها بۆ گۆشەگیرکردنی میسر لە کۆمەڵگای عەرەبی بڕیاریاندا بارەگای کۆمکاری عەرەبی لە میسرەوە بگوازرێتەوە بۆ تونس[٨٥٢].

سەدام حوسێن لە هەموو پۆستە حیزبی و حکومیەکان کە جێگری دووەمی سەرۆکی عێراق بووە، بەڵام بە کردەوە کەسی یەکەمی بە دەسەڵاتی عێراق بووە، لە ١٦ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٩ ئەحمەد حەسەن بەکر بە رەسمی دەستی لەکارکێشایەوە، لە ماوەی چەند سەعاتێک سەدام حوسێن بە رەسمی بووە سەرۆک کۆمارو سەرۆکی

---

٨٤٩- بۆ زانیاری زیاتر لەوبارەیەوە بڕوانە: (ترىب: صفحات من تأريخ، ص٢٩١ -٣٠٤

٨٥٠- کامپ دیڤد: لە ١٨ی ئەیلولی ١٩٧٨ بە سەرپەرشتی جیمی کارتەر سەرۆکی ئەمریکا لە نێوان ئەنوەر ساداتو میناحم بیگن سەرۆکی ئیسرائیل بە مەبەستی ئاشتی نێوان عەرەبو ئیسرائیل لە شاری کامپ دیڤید لە ئەمریکا واژۆکرا، ناڕەزایی گەورەی لە شەقامی عەرەبیدا دروست کرد، عێراق ئەو نیگەرانیەی قۆزتەوە، خێرا داوای بەستنی کۆبوونەوەی لوتکەی کۆمکاری عەرەبی کرد. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (الکیالي و الاخرون: موسوعة السیاسیة، ج٥/ ص٥٢-٥٥، ج٧/ ص٥٦١ ـ ٦٠٤)

٨٥١- بڕوانە : راپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، ل٣٢٤" رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٥٠٩)ی ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠

٨٥٢- ماریون ربتر سلوجت، العراق الحدیث، ص٢٨٢.

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش[٨٥٣]، دوای ئەوە هەمووی دەسەڵاتەکانی لە بندەستی حیزبەکەی زیاتر کورت کردەوە، خۆی وەکو ئیمپراتۆریەتێکی ترس بەسەر حیزبو حکومەتەوە بەدیارخست، بە بیانووی پیلاندانان لە دژی ئەو لە کۆبوونەوەی هەرێمایەتی حیزبیو ئەنجومەنی وەزیراندا بڕیاری لە سێدارەدانی ژمارەیەك لە ئەندامە سەرکردەکانی حیزبەکەیدا[٨٥٤]. سیاسەتی ترساندنو تۆقاندنی بە هەموو عێراقدا بڵاوکردەوە، سەپاندنی فیکری بەعسو باڵادەستی سەدام حوسێن هەموو وڵاتی گرتەوە، بە هەڵگرتنی دروشمی: ((عێراقیەکان ئەگەر بەعسیش نەبن هەر بەعسین))[٨٥٥]، بۆشای بۆ رای جیاواز نەهێشتەوە، دەستوور یاسار سیستەمی حوکمڕانی هەمووی بەستەوە بە نەتەوەی زۆرینەوەو لەوێشەوە بۆ حیزبی بەعسو دواجار بۆ تاك سەرکردە[٨٥٦]. بنکەیەکی پتەوی لە لایەنگرانی دروستکرد، هەتا لەو رێگەیەوە کاریزمایی ئەو بپارێزێت[٨٥٧].

سەدام بەردەوام گوتاری عێراقی دەگوازێتەوە بۆ ئاستی نیشتمانی عەرەبی، عێراقی بە پاسەوانی دەسپاکی خاکی عەرەب ناودەبرد، نەیدەویست نیشانی بدات، کە ئێران بە تەنیا گرفتی لەگەڵ عێراقدا هەیە، بەڵکو لەگەڵ هەموو عەرەب هەیەتی، ئایندەی

---

٨٥٣- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ترب: صفحات من تاریخ، ص٢٩٤" عەلی کەندی: فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان، ل١٧" ماریون فاروق سلوغلت، بیتر سلوغلت: من الثورة الی الدکتاتوریة العراق منذ ١٩٥٨، ص٢٧٧)

٨٥٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ترب: صفحات من تاریخ، ص٢٩١-٢٩٤" کاظم حبیب: لمحات من نضال حرکة التحرر، ص٥٠٥-٥١٠" ماریون فاروق سلوغلت، بیتر سلوغلت: من الثورة، ص٢٧٨)

٨٥٥- (العراقیون بعثیون و ان لم ینتموا) بڕوانە: کاظم حبیب: الاستبداد و القسوة في العراق، ص٤٢٣

٨٥٦- المصدر نفسه.

٨٥٧- ترب: صفحات من تاریخ، ص٣٠١

پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران بەستبۆوە بە پەیوەندی حکومەتی ئێرانی بە عەرەب[٨٥٨]، لەو روانگەوە خۆی کردبووە پارێزەری ئاسایشی کەنداو[٨٥٩]، رژێمی خومەینی لە ئێران وەکو مەترسی لە سەر وڵاتانی کەنداو دەناساند، مەترسیەکانی ئێرانی بۆ سەر عێراق دەیگواستەوە بۆ مەترسی بۆ سەر وڵاتانی کەندا[٨٦٠]، تۆباڵی سازشی رێککەوتننامەی جەزائیری بەستبۆوە بە قوربانیدان لە پێناو عەرەب[٨٦١]. سازشی بۆ ئێران پەیوەستکردبوو بە خەبات لە پێناو فەلەستین و خۆیەکلایی بوونەوەی عێراق بۆ بەرەی عەرەب -ئیسرائیل[٨٦٢]، پاشان گوتاری سیاسی لە عێراق بە ئاقارێکدا رۆیشت ئاسایشی عێراق وەکو ئاسایشی ناسیونالستی نەتەوەیەك بەدەربکەوێ، کە بێجگە لە عەرەب هیچ نەتەوەو پێکهاتنێکی دیکە لە عێراقدا ناژی[٨٦٣].

لە سەر ئاستی سەربازیو خۆپڕچەککردن، حکومەتی عێراقی هەنگاوی گەورەی هاویشت، ژمارەی سوپای بە چەند بەرانبەر زیاد کرد، لە ناو سوپاشدا دامەزراوەی

٨٥٨-بڕوانە: (صباح سليمان: اضواء على الحرب، ١٣-١٤" رۆژنامەی هاوکاری ژ(٥٠٩)ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠و ژ(٥١٣)ی ٨/٢/١٩٨٠)

٨٥٩- ترب: صفحات من تأريخ ص٣٠٥" برزان التكريتي، الصراع الدولي في، ص١٣٧-١٤٠" العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢٦

٨٦٠- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢٦-٢٢٨.

٨٦١- ئەلیاس فرح: لە دوای هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیروساڵی یەکەمی شەڕی عێراقو ئێران دەنووسێت: (شەڕی ١٩٨٠ شەڕێکی نەتەوەیی رزگاری بەرجەستە کردووە، کێشەی فەلەستین سەرەڕای ئەوەی لە رووی جوگرافیەوە لێی دوورە، بەڵام شوێنی گرنگی هەیە، چونکە شەڕێکی نەتەوایەتییەو بەئەولوی لە بەرەنگاربوونەوەی فاشیەتدا خۆی دەبینێتەوە...) بڕوانە: (الياس فرح: معركة العرب القومية على الحدود الشرقية، بيروت، ١٩٨١.ص١٩)

٨٦٢- المصدر نفسه، ص٢١٩.

٨٦٣- بڕوانە: (فاضل البراك، استراتيجية الامن القومي "آراء و افكار"، بغداد. ١٩٨٧، ص١٩٩-٢٣١)

بەعسی بەهێز کرد[٨٦٤]، مەبەستی لەوەدا رێگری بووە لە هەر هەوڵێکی کوردەتا دژی حیزبی بەعس، تەنانەت ئاماژە هەیە لە مانگی نیسانی ١٩٨٠ەوە رێنومایی بە سوپا داوە خۆی بۆ لێدانی ئێران ئامادە بکات[٨٦٥].

هەر لەو ماوەیەدا ئاستی ئابووری عێراق بەرزبوو، ئەوەش لە ئاکامی زیادەی ناردنە دەرەوەی نەوت و بەرووبومی دیکەی کشتوکاڵی بووە، کە جێی بایەخی حکومەتی عێراق بووە[٨٦٦].

سەرکردەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی دژایەتی و هێرشکردنە سەر بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوایان وەکو بیروبارەڕی ئاینی دانابوو، بەجۆرێ کە جێگای سازش نەبێ[٨٦٧]، حکومەتی عێراقیش ئەو هێرشەیان بۆ سەر دوو بلۆکبەندی رۆژهەڵات و رۆژئاوا قۆزتەوە بۆ دروستکردنی پشتیوانی، سەرەڕای لێداوانی بەرپرسانی ئێرانی، کە وڵاتانی کەنداوی ترساند، پێیان وابووە زوو یان درەنگ دەکەونە بەر شاڵاوی ئێران، لەبەرانبەریشدا ئەو حاڵەتە بۆ ئەمریکا چاوەڕوان نەکراو بووە[٨٦٨]، شۆڕشی ئێران

---

٨٦٤- ئەلیوت هیسا: خوێندنەوەی بەعس، ل١٠٧-١٠٨، سەرەڕای سوپای نیزامی حکومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٧٦ەوە تەشکیلەیەکی تریشی دامەزراند بە ناوی سوپای بەرگری (جیش الشعبي)، کە بەر لە هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیر ژمارەیان گەیشتە ٧٥ هەزار جەنگاوەر. بڕوانە: (ماریون ریتر سلوجت: العراق الحديث، ص٢٥٨-٢٥٩)

٨٦٥- ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٧٢-٢٧٣.

٨٦٦- بۆ زیاتر زانیاری لەو بارەوە بڕوانە: ماریون فاروق سلوغلت، بیتر سلوغلت: من الثورة الى، ص٢٣٩-٢٤٢

٨٦٧- ولید عبدالناصر: ایران دراسة عن الثورة و الدولة، القاهرة، ١٩٩٧، ص٥٩-٦٠

٨٦٨- ماریون ریتر سلوجت: من الثورة الى، ص٢٥٠

یەکێك بووە لە ڕووداوە گەورەکانی سەردەمی شەڕی ساردو ناچاری کردن بەنەخشەکانیاندا بچنەوە[869].

ئەمریکا بە ناوی پاراستنی ئۆقرەییەوە هێزی ناردە کەنداو[870]. چونکە ئێران لە هاوپەیمانیەتی ناتۆ هاتە دەرێ[871]، بەمەش هاوپەیمانو پارێزەرێکی گرنگی لەدەستچوو، کاردانەوەی ئەو هەنگاوەی ئەمریکا ئەوە بووە یەکیەتی سۆڤیەت بە هێزی سەربازی ئەفغانستانی داگیرکرد[872]، لە بەرانبەردا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەرەی ناتۆی ناچاربوون لە بیری ڕێگە چارەی تازە بن بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، بۆیە پشتگیریکردنی عێراق یەکێك بووە لە جێگرەوە باشەکان. بە پێی ئاماژە لە بری ئەوەی ئەمریکا لەو حالەتە سەیری جەنگی عێراقی دژ بە ئێران بکات، کە ڕەنگدانەوەی سروشتی شەڕانگێزی حکومەتی عێراقە، وای دانابوو فاکتەرێکی گرنگە بۆ گورز وەشاندن لە ئێران[873].

جیمی کارتەر چۆن لە پروپاگەندەی هەڵبژاردن سوودی لە هێرشکردنە سەر ڕژێمی شا وەرگرت بەوەی مافی مرۆڤی لە ئێران پێشێل کردووە، لە کۆتایی خولی دەسەلاتی سەرۆکایەتی تووشی تەنگژەی بەرانبەرەکەی بۆوە لە سەر دەستبەسەرکردنی بارمەتە ئەمریکیەکان لە ئێران. باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئێران تەنیا باڵوێزخانەیەکی ئاسایی نەبووە، توێژەرێك لەو بارەیەوە دەڵێت: ((باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئێران بە تەنیا کاری

---

٨٦٩- نورەدینی: سێنتەمی نوێی، ل١٠٦-١٠٧.

٨٧٠- حامید محمود عیسی: القضیة الکردیة، ص٤٢٥

٨٧١-فاضل رسول: العراق- ایران، ص٥٣

٨٧٢- نورەدینی: سێنتەمی نوێی، ل١٠٧.

٨٧٣- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (ڕێبوار محمد کەریم: پەیوەندییەکانی عێراقو ئەمریکا "١٩٢١-١٩٨٩"، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ٥٣، تشرینی دووەمی ٢٠٠٧، ل١٢٨-١٣٩)

پاراستنی پەیوەندی دیبلۆماسی نەبووە، بەڵکو بنکەیەکی پاراستنی رژێمی وڵاتەکەش بووە...، نزیکەی ٥٠-٦٠ پسپۆڕو شارەزای ئەمریکایی کرێی زۆریان دەستدەکەوت و لە باڵەخانەی نموونەیی دا دەژیان...))[٨٧٤]. بە بارمتەگرتنی دیبلۆماس و پسپۆڕە ئەمریکیەکان کاریگەری لە سەر رای گشتی ناوخۆی ئەمریکا هەبووە، سەرەڕای لە دەستچوونی بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی، ئێرانیش بەو کارە لە سەر ئاستی دونیا زیاتر خۆی گۆشەگیر کرد[٨٧٥]، ئەمریکاش لای خۆیەوە لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٧٩ بڕیاری بلۆککردنی هەموو سامانە رەسمیەکانی ئێرانیدا[٨٧٦].

لە ساڵی ١٩٧٩و نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٨٠ کارگەیشتە ئەوەی بە ئاشکرا حکومەتی ئێرانی ئەو ئارەزووە نەشارنەوە، کە دەیانەوێت شۆڕشەکەیان فراوان بکەن[٨٧٧]، ئەمەش لە چوارچێوە بنەمای ناردنەدەرەوەی شۆڕش دابووە بۆ وڵاتانی ئیسلامی[٨٧٨]، لەو پێوەنداگەوە هانی شیعەکانی عێراق و کەنداوی عەرەبی دەدرا بۆ راپەڕین، کە رێژەیەکی بەرچاو شیعە لە هەندێ وڵاتی کەنداو هەن بە تایبەت لە بەحرەین[٨٧٩]. لە لایەکی دیکەوە عێراق دەیویست ئەو کارتە بۆ وروژاندنی عەرەبەکانی کەنداو بەکاری بهێنێ.

---

٨٧٤-جرجیس حسن: ترکیا في ستراتیجیة الامریکیة، ص١٥

٨٧٥- تأریخ ایران السیاسي، ص٢٤٨

٨٧٦- ئەزاھی: لە دەرباری شارە، ل٣٣٢

٨٧٧- ماربون وبتر سلوجت: من الثورة الى الدکتاتوریة، ص٢٤٨" صباح سلیمان: اضواء على الحرب، ص١٥

٨٧٨- بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی بیری ناردنە دەرەوەی شۆڕش بڕوانە: (ولید عبدالناصر: ایران، ص٧١)

٨٧٩- المصدر نفسه، ص٨٠

لە دوای هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر عێراق ویستبووی وا نیشان بدات، کە لە سەرەتای ڕاپەڕینەکانی ئێرانی دژ بە شا بە چەندان شێوە هاوکاری ئۆپۆزسیۆنی دژی ڕژێمی شای کردووە[880]، یان هیچ نەبێ پێشوازی لەو گۆڕانکاریە کردووە[881]، کە ئەمە جێی گومانە، چونکە لە سەرەتاوە دەسەڵاتی تازە لە ئێران دەسەڵاتی بەعسی لە عێراق بە ڕژێمێکی لادینیو ناحەز بە خۆی زانیوە، وەکو گومڕایی دژی بە ئیسلام ڕێنای کردووە[882]، دەکرێ ئەمەش بەشێکی بگەڕێتەوە بۆ دەرکردنی خومەینی لە عێراق، قاسملو لەوبارەیەوە دەنووسێت: ((زۆر لە لایەنگرانی ئایەتوڵلا خومەینیو شەخشی خۆشی جوابکردنی خومەینیان لە عێراق لە ساڵی١٩٧٨ وەکو دوژمنایەتیەکی گەورەی عێراق دەرهەق بە ڕژێمی ئیسلامی ئێران تەماشا دەکرد، لە هەوڵی تۆڵەسەندنەوەدابوون))[883]، لەلایەکی دیکەوە لە سەرەتاوە ڕژێمی عێراق بە هاتنە سەرکاری ڕژێمی ئیسلامی دڵخۆش نەبوو[884]، چونکە لەو بارەیەوە بەڵگەمان دەست نەکەوتو ئەو لێدوانانەش هی سەردەمی دواتری لەدەسیاتی دەسەڵاتدارانی بەعس بووە، لە چوارچێوەی پاساوەکانی شەڕی عێراق- ئێران.

لە ئەموزی ساڵی ١٩٧٩و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ خومەینی لە دوو پەیامی جیاوازیدا داوای لە گەلانی عێراق کرد بە ڕووی ملهوڕیو خوێنڕێژان لە عێراقدا بوەستنو سیستمێکی ئیسلامی دابمەزرێنن، کە کەرامەتی مرۆڤی تێدا پارێزراو

---

٨٨٠-بۆچی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوان عێراقو ئێراندا هەڵوەشایەوە؟، ل١١

٨٨١- بۆ زانیاری لەو بارەیەوە بڕوانە: (العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢٣-٢٢٤" صباح سليمان: اضواء على الحرب، ص١٢-١٥).

٨٨٢- ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٦٩

٨٨٣- عەبدولڕەحمان قاسملو، عەبدوڵڵای حەسەن زادە: کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی، ل٣٨٩

٨٨٤- هەمان سەرچاوە، ل٣٨٩

بێت[٨٨٥]، بە پێی ئەو پێگە لاوازەی شیعە لە عێراقدا هەیبوو لە بەشداری دەسەڵاتی سیاسی، کە لەگەڵ قەوارەی خۆیاندا نەدەگونجا[٨٨٦]، ئەو کاریگەرییە باڵایەی پیاوانی ئاینی شیعە بە سەر شەقامی عێراقی هەیانبوو بۆ ئێران جێی بایەخ بووە. تریپ لەوبارەیەوە دەنووسێت: ((دوژمنایەتی نێوان رژێمی تازەی ئیسلامی لە ئێرانی شیعەو حکومەتی عێراقی بووە هۆی توندوتیژی لە بەرانبەر شیعەکانی عێراق، بە جۆرێ دەرفەتی ئاوبڕیوانی نەمێنێتەوە، رژێمی عێراق لەلای ئێران ببووە نیشانەی هەموو خراپەیەکو چار نەبوو دەبوایە لە ناو ببرێ...))[٨٨٧]، لە لایەکی دیکەوە عێراقی تاوانبار دەکرا بە هاندانی عەرەبەکانی خوزستانی ئێران بۆ یاخیبوون[٨٨٨]، کە بۆ عێراق کارتی فشاربووە تۆڵەی پێ لە ئێران بکاتەوە.

راستە سەرۆکی کۆماری عێرلق ئەحمەد حەسەن بەکر بروسکەی پیرۆزبایی بۆ دەسەڵاتی تازەی ئێران نارد[٨٨٩]، دواتر عێراق بانگهێشتنی (مەهدی بازرگان)ی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی ئێرانی کرد، بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکیەکانی هەردوولا سەردانی عێراق بکات، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدرایەوە[٨٩٠]. پێدەچێ لە دوو هۆکارەوە سەرچاوەی گرتبێ، کە حکومەتی عێراق ویستبێتی پێشوەخت خاڵی لاواز نەداتە دەست کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە بەرانبەر رژێمی تازە. ئەو گوزارشتە لە جێی خۆیدایە، کە دەنووسێت: ((رژێمی عێراق بە چاوی سۆزەوە نەیدەڕوانیە ئۆپۆزسیۆنی

---

٨٨٥- ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٧٠-٢٧١

٨٨٦- بۆ زانیاری دەربارەی قەوارەی شیعە لە عێراقدا. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٩.

٨٨٧- صفحات من تأريخ، ص٣٠٢

٨٨٨-ماريون وبتر سلوجت: من الثورة الى الدكتاتورية، ص٢٥٥

٨٨٩- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢٢-٢٢٤؛ www.albasrah.net

٨٩٠- Loc. cit.

تازەی ئێرانی دژ بە شا، بە تایبەتی، کە ئۆپۆزسیۆن پەیوەست بووە بە پیاوانی ئاینی شیعەوە.. بە تایبەت حکومەتی عێراقی لە سەر داواکاری شای ئێران خومەینی لە عێراق دەرکرد))[891]، عێراق پێی وابووە ئەمە کاردانەوەی لە سەر هەڵوێستی خۆی‌و هاوڕێکانی دادەنێت، ئەمەش کاریگەری دەبێت لە سەر شیعەکانی عێراق[892]، لە راستیشدا هەر وادەرچوو لە زۆربەی شارە شیعەنشینەکان جموجۆڵی پیاوانی شیعە دەستی پێکرد[893]. ئیتر راگەیاندنی عێراقیش نارەزاییەکانی شەقامی ئێرانی بە گشتی پارتە سیاسیەکانی پەخش دەکرد[894]. ناکۆکی لە ناو ئەو هەموو نیگەرانیەی هەردوولا بەرانبەر یەکتری، دەرفەتێك دێنێتەوە بۆ دڵخۆشی حکومەتی عێراقی بەرانبەر رژێمی تازە لە ئێران.

ئەو ئاماژانەی دەسەڵاتدارانی بەعس لە عێراق لە بەرانبەر جێبەجێنەکردنی هەندێ خاڵی پەیوەست بەسنوور لە سەردەمی شا[895]، وەکو بۆردومانی مەخفەرە سنووریەکانی عێراق‌و هێرشکردنە سەر باڵوێزخانەی عێراق لە تاران‌و قونسولگەری

891- تریب: صفحات من تاریخ، ص292

892- ئێنتیسار: ئێنتۆنەتەوایەتی کوردی، ص269

893- تریب: صفحات من تأریخ، ص259-270، 275-279" ئێنتیسار: ئێنتۆنەتەوایەتی کوردی، ص269

894- لەو بارەیەوە بڕوانە: رۆژنامەی هاوکاری زمانحاڵی حکومەتی بەعس ژ(500)، 19/11/ 1979، ژ(501 بۆ 513)ی شوباتو ئازاری 1980).

895- مثنی امین: قضایا القومیات ر، ص175-176" وتاری سەدام حوسێن سەرۆك کۆماری عێراق لە کۆنگرەی ئیسلامی لە تائیف، لە 4/2/1981. بڕوانە: رۆژنامەی هاوکاری ژ(572)ی 5/2/1981. راپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، ل266-267" ماریون ریتر سلوجت: العراق الحدیث من الثورة الی، ص348

عێراق له موحەمەرەو کرماشان[٨٩٦]، هاریکاری ئێران بۆ ئەوانەی خۆی ناوی لێنابوون دەستەی هەڵگەڕاوەی بەکرێگیراو (زمرە التمرد العمیل) بەوەی بارزانیو کوڕانی لە ئەمریکاوە هێناوەتەوە بۆ ئێران هەتا دژی حکومەتی عێراق پشتیوانیان لێبکات، گوایە ئێران ڕێگەی بە پەڕینەوەی سنووربەزێنەکانی داوە سنووری عێراق بۆ مەبەستی گێرەشێوێنی ببەزێنن[٨٩٧]. لە ڕاپۆرتی ناوەندی کۆنگرەی نۆیەمی هەرێمایەتی بەعس هاتووە کە ((...سەرکردایەتی یاخیبوانیانی لە ئەمریکاوە بانگ کردۆتەوە بۆ ئێران...))[٨٩٨].

لە بەرانبەر ئەو هەڵوێستەی حکومەتی ئێرانی، حکومەتی عێراقی کەوتە یارمەتیدانی: ((حدکا و کۆمەڵەی شۆڕشگێرانی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانو سازمانی خەباتو هەموو کەسایەتیە ئاینیو عەشاریەکانی ئۆپۆزسیونی دەسەڵات))[٨٩٩]، بەڵام ئەگەر پشتگیری حکومەتی عێراقی بۆ بەرهەڵستکارانی ئێرانی دواکەوتبێ، ئەوە وەکو بەدەردەکەوێ هەرزوو دەسەڵاتدارانی ئێرانی بۆ بزوتنەوەی شیعەکانی عێراقی بوونە پاڵپشتی مەعنەوی.

---

٨٩٦- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢٥"وتاری سەدام لە کۆنگرەی ئیسلامی لە ١٩٨١/٢/٤، هاوکاری، ژ(٥٧٣)ی ٥/٢/١٩٨١

٨٩٧- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢٢٢-٢٢٧

٨٩٨- ڕاپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، ل٣٧٠" بۆچی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوان عێراقو ئێراندا هەڵوەشایەوە؟، ل٣١

٨٩٩- لەوبارەیەوە بڕوانە: (ئەنوشیروان مستەفا: پەنجەکان، ل١٢٧)

لێرەوە دەسەڵاتدارانی عێراقی کەوتنە برەودان بە مەسەلەی شعوبیەتو چاوتێبڕینی فارسی لە خاکی عەرەبیو کەنداو، ڕۆڵی عێراق لە پاسەوانیەتی نیشتیمانی عەرەبو گوزراشتی لەو بابەتە[900]

عێراق لای خۆیەوە ئێرانی تاوانبار دەکرد بە دەستدرێژی کردنە سەر مەخفەرە سنووریەکان، سنووربەزاندنی ئاسمانی، هەوڵدان بۆ کاری تیرۆرستی لە زانکۆی موستەنسریەو بەغدا، کارئاسانی بۆ ڕێکخراوە شیعەکانی دژ بە حکومەت..، ئەوانە وەکو پاساو زەق دەکرانەوە، بە شێوەی ژمارەو بەروار سنووربەزاندنەکان دەخرانەڕوو[901]، لەگەڵ بۆردومانکردنی شارە سنووریەکانی خانەقینو زورباتیەو ئەوانی دیکە[902]

لە ساڵی ١٩٧٩ لە ڕۆژنامە ڕەسمیەکانی عێراقی بە شێوەی وتارو لێدوان لە سەر ئێران دەنووسرا، باسی هەموو چالاکیو بەرەنگاریەکی ڕێکخراوە سیاسیەکانی ئێران دەکرا لە راگەیاندنی عێراقیو دەسەڵاتی تازەو سەرانی درابوونە بەر هێرشو خومەینی

---

٩٠٠- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الیاس فرح: معرکة العرب، ص٥٨" مهدي حسین البصري، الموقف القومي التأریخي ازاء التحدي الفارسي، ب ش، ١٩٨٠)

٩٠١- لەوبارەیەوە بڕوانە: (العزي: مشکلة شط العرب، ص٢٢٧-٢٢٨" صباح سلیمان: اضواء علی الحرب، ص٨١-٩١" بۆچی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوان عێراقو ئێراندا هەڵوەشایەوە؟، ل١٢-١٥" خطاب صدام حسین في مؤتمر الاسلامي في طائف، ١٩٨١/٢/٤، هاوکاری، ژ(٥٧٣)ی ١٩٨١/٢/٥" سعد داود قریاقوس: مسؤولیة القیادة الایرانیة في شن الحرب علی العراق واطالتها. لە سەر ئەنتەرنێت www.albasrah.net)

٩٠٢- فاضل البراك: استراتیجیة الأمن القومي، ص٢٦٢. لە پەلاماری هەردوو شارەدێی "زین القوس و دیزفول" حکومەتی عێراقی دانی بەوەدا نەناوە، کە سنووری ئێرانی بەزاندووە، بەڵکو بەمانای ڕزگارکردنەوە گرتوویەتی، گوایە ئەو دوو شوێنە بە پێی ڕێککەوتننامەی جەزائیر دەبوایە بۆ عێراق بگەڕێتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (راپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، ل٢٨٩-٢٩٠).

ڕەگەز پەرستو دواکەوتوو بەکرێگیراو.هتد، ناونیشانی دەیان وتارو لێدوان بووە[٩٠٣]
هەر لەو ساڵەدا (موجاهیدی خەلقی ئێران) بەرهەڵستکاریەتی خۆی ڕاگەیاند بەرانبەر ڕژێمی تازەو قەیرانی ئابووریو بێکاری لە وڵات ووروژاند[٩٠٤]،

حکومەتی عێراق لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٨٠ پێدەچێ بەوەو ئەو باوەڕە چووبێ، کە دەرفەت هاتۆتە پێشەوە بۆ ڕزگاربوونی عێراق لە کۆتوبەندی ڕێککەوتننامەی جەزائیر[٩٠٥] و هاوسەنگی دەولی بە قازانجی عێراق دەگەڕێتەوە خۆی لەو ڕێککەوتننامەیە ڕزگار بکات[٩٠٦]. سەرەتای ئەو ئاماژەیەش لە وتاری سەدام حوسێن بە دیارکەوت بە بۆنەی لە ٦/١/ ١٩٨٠بە بۆنەی دامەزراندنی سوپای عێراقەوە، کە دەسەڵاتدارانی ئێرانی بە پێشێلکەری ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەی جەزائیر تاوانبار کرد[٩٠٧]

وەکو بەدەردەکەوێ لەو زەمینەسازیو ئاماژانەی هەردوو وای لە سەدام حوسێن کرد لە ڕۆژی ١٧ ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی

---

٩٠٣- بۆ ئەوە مەبەستە بڕوانە: ڕۆژنامەی هاوکاری ژ(٤٣٨ هەتا ٤٩٣) لە مانگەکانی ئایارو مایسو حوزەیران، ژ(٥٣١ هەتا ٥٤١) لە مانگەکانی تەموزو ئابو ئەیلولی ١٩٨٠).

٩٠٤-امال السبكي: تاريخ ايران السياسي، ص٤٢٨-٤٤٩.

٩٠٥- عەبدولڕەحمان قاسملو، عەبدوللای حەسەن زادە: کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی، ل٣٩٠" تربب. صفحات من تاريخ، ص٣٠٥" ش.ج.مەکۆریی‌و ئەوانی تر: کوردستانی هاوچەرخ، ل٥٥" ماریون ویتر سلوجت: العراق الحديث من الثورة الى، ص٣٤٩-٣٥٠

٩٠٦- تربب: صفحات من تاريخ، ص٣٠٥

٩٠٧- بڕوانە: (ڕۆژنامەی هاوکاری ژ(٥٠٩)ی ١٤/١٢/١٩٨٠)

جەزائیر بدا[٩٠٨]. (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) لە کۆبوونەوەیەکی نائاسای خۆیدا، بە هەموو پرۆتۆکۆڵو ڕێککەوتننامەکانی پەیوەست بەو ڕێککەوتننامەیەو کۆنووسی کۆبوونەوەکانی هەڵوەشاندەوە[٩٠٩]، سەدام حوسێن لە سەر شاشەی تەلەفزیۆنەوە ڕێککەوتننامەکەی دڕاند[٩١٠]. هەر لە ڕۆژی ١٧/٩/١٩٨٠ لەبەردەم ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش سەدام وتارێکی دوورو درێژیدا[٩١١]. دەقی وتارەکەی دیکۆمێنتێکی مێژوویی گرنگە لە مەڕ تێڕوانینی خۆیی و ڕژێمەکەی و هۆکارەکانی ڕازیبوونی عێراق بەو ڕێککەوتننامەیە هەتا دەگاتە هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەو مامەڵەی حکومەت لەگەڵ ڕووداوو پێشهاتەکان، تەنانەت خوێندنەوەی سەدام بۆ زۆر لەو خاڵانەی پەیوەستن بە سیاسەتی دەرەوەی عێراق[٩١٢]، لەوێدا هۆکاری بەستنی ڕێککەوتننامەی جەزائیری بەستۆتەوە بە ئەو فشارەی لە لایەن شۆڕشی کوردییەوە لە سەری بووە، کە ئێران پاڵپشتی لێکردووە، هەروەها لاوازبوونی سوپای عێراق و ئەو زیانانەی لە ماوەی (ئازاری ١٩٧٤ بۆ ئازاری ١٩٧٥) لێی کەوتبووە، عێراقی ناچاری سازشکردووە. پاشان پۆشینی ئەو سازشەی کاتی خۆی بۆ ئێرانی کرد، وای دەرخست، کە عێراقی لە مەترسی لێکترازان ڕزگار کردووە، دەڵێ: ((ڕێککەوتننامەی ئازار لە کاتی خۆیدا بڕیارێکی ئازایانەو لێزانانەو بڕیارێکی نیشتیمانی و نەتەوەیی بووە،

---

٩٠٨- ماریون وپتر سلوجت، من الثورة الى الدكتاتورية، ص٢٥١" مصطفى عبدالقادر النجار و الاخرون: الحدود الشرقية للوطن العربي (دراسة تأرخية)، بغداد، ١٩٨١، ص٢٧٤.

٩٠٩- دەقی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (١٣).

٩١٠- ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی، ل٢٧٢

٩١١- بۆ دەقی وتارەکەی سەدام حوسێن بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (١٤)

٩١٢- العزي: مشكلة شط العرب، ص٢١٩" بەڵگەنامەی ژمارە (١٤)

ئازایەتی بەس بە بەکارهێنانی چەکو شمشێر بە دەست نایەت))[913]، هەتا دەگاتە ئەو خاڵەی دەڵێ: ((رێککەوتننامەی ئازار لە بارودۆخی تایبەت بووە، گەلەکەمان تێدەگەیشت، کە لە چوارچیوەی بارودۆخی ئەو کاتە سەرکەوتنێکی گەورە بووە...))[914]

هەر لەوێدا نارەزایی بەرانبەر یەکیەتی سۆڤیەت دەربڕیوە، کە لە ماوەی شۆڕشی کوردستان بە بەراورد لەگەڵ پشتگیری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئێران بە کورد وەکو پێویست پرچەکی نەکردووە[915]

سەدام لە وتاری ١٧/ ئەیلول دارا لە ئێران دەکات مامەڵەی ئاسایی لەگەڵ ئەو بریارەی عێراق بکاتو شەڕ لەنێوان هەردوولا هەڵنەگیرسێت[916]، لە کاتێکدا بەر لەو بەروارە شەڕ دەستی پێکردبوو.

وتاری ١٧ی ئەیلولی ١٩٨٠ سەرەتای هەڵگیرسانی شەڕی راستەوخۆی نێوان هەردوو وڵات بووە، لەو روانگەی ئەو وتارەوە بووە راگەیاندنی بەعس بە هەمان حەماسەتەوە سازشی هەڵوەشاندنەوەی ئەو رێککەوتننامەیە بە حیکمەت دادەنێ[917]، لەو مەیدانەدا حیزبی بەعس لە رێگەی راگەیاندنەکانیەوە کەوتە پێداهەڵدان بە

---

٩١٣- بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە (١٤)

٩١٤- بەڵگەنامەی ژمارە (١٤).

٩١٥- بەڵگەنامەی ژمارە (١٤).

٩١٦- بەڵگەنامەی ژمارە (١٤).

٩١٧- غیلان: تأریخ الاطماع الفارسیة، ص٧-٨* راپۆرتی ناوەندی نۆیەم کۆنگرەی هەرێمانە، ٢٦٨* مازن السامرائی، وثائق عن الصراع العراقي الفارسي، ص٢٨٥-٢٨٩.

سەدام حوسێن، کە هەموو هەڵوێستەکانی بە سەرکەوتن و کارزانی بۆ هەژماربکرێ[918]

هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیر گەڕانەوە بووە بۆ خاڵی دەستپێکردنەوەی ناکۆکیەکانی هەردوو حکومەت، تایبەتمەندیە بنەڕەتەکانی پێش رێککەوتننامەی جەزائیر لە سروشتی پەیوەندیەکانی نێوان عێراق و ئێران وەکو خۆی دووبارە دەستی پێکردەوە[919]

---

٩١٨- لێرەدا دەربڕینێک هەیە بۆباسای گرێدانی رێککەوتننامەی جەزائیر هەڵوەشانەوەی، کە لە سەر زاری سەدام حوسێنەوە وتراوە: (...بە ڕوونی بە دیار دەکەوێ، کە سەرەتاکەی سەرکەوتن و کۆتاییەکەی هەر سەرکەوتن بووە) مەبەستی لە رێککەوتننامەی جەزائیرە. بڕوانە: صباح سليمان: اضواء على الحرب، ص٥١؛ غيلان: تأريخ الاطماع الفارسية في شط العرب، ص٨؛ بەڵگەنامەی ژ(١٤)؛

٩١٩- هەندێ لە تایبەتمەندیەکانی ناکۆکی هەردوو دەوڵەت وەکو پێشتر دەستی پێکردەوە، بەڵام لەمجارەیان وڵاتانە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیاتی ئێران پشتیوانی لە عێراق دەکرد.

# ملخص البحث

يعد هذه الدراسة المتواضعة، توصل الباحث الى عدة النتائج يكمن تلخيصها الى النقاط الاتية:

اولا: ان العلاقة بين العراق وايران كانت متوترة في اغلب الاحيان منذ سقوط الدولة العثمانية وتشكيل الدولة العراقية الى ابان الحرب العراقية الايرانية عام ١٩٨٠، و هذه الخلافات ناجمة الى اسباب عدة، شكلت القضية الكردية السبب الرئيسي للخلافات بين الطرفين، لان موطن الكرد عد الجزء الاهم من كلتا الدولتين.

ثانيا: على الرغم من الضغوط التي احدثتها الثورة الكردية على الحكومة العراقية، حيث بدأت في ايلول سنة ١٩٦١ من اجل (الحكم الذاتي لكردستان والديمقراطية للعراق)، فإن العوامل الخارجية كانت لها دوراً ملحوظاً لانعقاد اتفاقية الجزائر، فانزعاج كل من امريكا و ايران بـ(معاهدة التعاون و الصداقة) بين الاتحاد السوفيتي و العراق في نيسان عام ١٩٧٢، جلبت الاطراف الدولية، كما ان تشجع الاتحاد السوفيتي (حشع) وحزب البعث بتشكيل جبهة واحدة بأسم (الجبهة الوطنية و التقدمية القومية)، ثم وقعت اتفاقية شراء الاسلحة من الاتحاد السوفيتي، أدى الى توسع النفوذ السوفيتي في العراق و منطقة الخليج في مايس ١٩٧٢، لذا قررت كل من امريكا و ايران مساندة الثورة الكردية بهدف الضغط على العراق لغرض تحقيق اهدافهما التي كانت متمثلة من خروج العراق من الدائرة السوفيتية و تحقيق المصالح الايرانية في مياه شط العرب.

ثالثا: يمكن القول عن اتفاقية الجزائر انها (مساومة العراق امام ايران بفقدان سيادة المياه في شط العرب مقابل الخروج من هذه الازمة التي فرضت على الثورة الكردية في اعقاب مطالبتها بحقوقها المشروعة وهذه المساندة الخارجية التي تتمتع بها).

رابعا: ما كانت نتائج الاخرى لهـذه الاتفاقيـة انهـا كانـت سـببا في فشـل الثـورة الكردية كما كانت سبب في فقدان الامل لنصف مليون مـن اللاجئـيين الكـرد، الـذي شكل ثلث السكان الكرد في كردستان العراق، نتجت هذه الاتفاقيـة حملـة التعريـب و الاعتقال و ارهاب الكرد من قبل السلطات العراقية.

خامسا: اعتماد القيادة الكردية على العوامل الخارجيـة مـن الاسـباب الرئيسـية لفشل الثورة، لكن لانستطيع ان نبتعد انفسنا عن العوامل الداخلية التي جعلـت مـن القيادة ضحية لفشل متوقع، لكن هذه الخطوة لاتغير شيئا من حقيقة أنه ليست هنـاك لحركة ايدتها الجماهير الكردية قدر تأيدها لهذه الثورة التي بنيت عليهـا أمـال النصـر والخلاص.

سادسا: على الرغم من تدهور الظروف السياسية و عدم الثقة بالقيـادة الكرديـة، فبسبب القضية الكردية العادلة و استمرار حزب البعث الحاكم على سياسة الاضـطهاد ضد الشعب الكردي وسياسة التطهير العرقي عن طريق الترحيل والتعريب، وبعـد فـترة وجيزة ظهرت الحركة السياسية من جديد وبعدها بسنة واحدة بدات الحركـة المسلحة في جبال كردستان، صحيح أن الثـورة الكرديـة في سـنوات مـابين ١٩٧٥- ١٩٧٩ مـرت بأوقات صعبة بسبب اتفاق الحكومتين العدوتين (العراقية والايرانية)، اتجاه الكرد لكـن سقوط نظام الشاه في ايران وعودة الخلافات فيمـا بينهمـا مهـد الطريـق أمـام الثـورة الكردية وفتحت افاقا جديدا لها.

سابعا: أن سقوط نظام الشاه و مجيء النظام الجديد في ايـران اصـبح نقطـة تحـول في المنطقة والعالم و من نتائجه نشوء الخلافات بين العراق و ايران من الجديد، كـان النظـام الايراني جديد منذ مجيئه الى السلطة يقوم بحملاته الاعلامية ضـد العـراق، في الوقـت نفسـه اصاب هذا النظام الفوضى و عدم الاستقرار، كما اصبح منعزل دولياً انذاك، هذا ما دفع السلطات العراقية لاستغلال الفرصة بالغاء اتفاقية الجزائر في ١٧ /٩/١٩٨٠، بذلك فتحت امام الثورة الكردية نافذة جديدة.

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم: سەرچاوە کوردیو بەکوردیکراوەکان.


١. ئازاد عوبێد ساڵح: کاریگەری شۆڕشی ئەیلول لە سەر ڕۆژنامەوانی کوردی ١٩٦١-١٩٧٥، بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپو بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٧

٢. ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستانو شۆڕشی ئەیلول (بنیاتنانو هەڵتەکاندن ١٩٦١-١٩٧٥)، چ٣، سلێمانی،١٩٩٩.

٣. ئەلبێرت عیسا: خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، لیکۆڵینەوەیەکی سیاسی لە سەر بەعسی عێراقی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٤. ئەمین قادر مینە: تەرحیل، تعریب، تبعیث، چ١، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی ١٩٩٩.

٥. ئیحسان نەزاغی: لە دەرباری شاوە بۆ زیندانەکانی شۆڕش، و: ئەحمەد قادر سەعید، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٦. تۆفیقی مەلا صدیق: بیەوەریەکانی ڕۆژانی حیزبایەتیو پێشمەرگایەتیو دوورخرانەوەم، بێ ش، چاپ، ١٩٩٦.

٧. جاسم تۆفیق خۆشناو: مەسەلەی کوردو یاسای نێودەوڵەتان، چ١، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی،٢٠٠٢.

٨. جەبار قادر: چەند بابەتێکی مێژووی کورد، چ١، سلێمانی، ١٩٩٩.

٩. جەلال تاڵەبانی: کوردایەتی، بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوایەتی گەلی کوردستان، ب ش، ب س.

١٠. جەمال نەبەز: ئیدلۆژیای هەورەد بورژوای مارکسی کورد، چ١، لە بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کورد بۆ زانستی و هونەر، ستوکهۆلم، ١٩٩٨.

١١. جۆناتان س. راندال: کوردستان یان کلۆلی نەتەوەیەک، و: د.خسرەوشالی، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١٢. حەردان تکریتی: باندێك دزو پیاوکوژ بووین لە پشت میلیشیا تیرۆریستەکانی سەدامەوە، و/ ئاسۆ، بی ش، بێ س.

١٣. حوسێن محمد عەزیز: کوردو شۆرش و هەلی مێژوویی، چ٢، سلیمانی، ٢٠٠٠.

١٤. حەمە نوری تۆفیق: پیارنامە، گوڵبژێرێکی ژیاننامەی شەهیدی ئەمر عەلی عەسکەری، چ١ سلێمانی ٢٠٠٤

١٥. دیڤید مەکدوال: مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥.

١٦. زرار ئیبراهیم: چەند بەشێك لە تراژیدیای تاوانێکی لەبیر کراو، بێ ش،١٩٩٧.

١٧. ژێرارد چالیاردو ئەوانیتر: گەلێکی بەژمۆزدەونیشتیمانی پەرت، و: کۆمەیی و أزحەوێزی، چ١، سوید، ١٩٩٨.

١٨. ژێرار شالیان: تراژیدیای کورد (راپۆرتێك بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان)، و/وریا رەحمانی، دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٠

١٩. سەروەر عەبدولڕەحمان: یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان (١٩٧٥-١٩٧٦)، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٢٠. گەراس.نارنی. ستانسفیلد: کوردستانی عێراق پەسەندنی سیاسی و پشکوتنی دیموکراسی، و/ د.یاسی سەردەشتی، سلێمانی، ٢٠١٠

٢١. ش.ج.هـگرێی‌و ئەوانی تر: کوردستانی هارچەرخ، و: گوشاد حەمــە ســەعید، چ١، دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوەی ئاراس،.هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٢. شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوك، سیاسەتی تەعریب لــە دووتــوێی هەشــتا بەلگەنامەدا، سلیمانی، ٢٠٠٤.

٢٣. عەباس سلیمان سمایـل: مێـژووی کـوردی فـەیلی عـیاق، لێکۆڵینەوەیـەکی مێژوویی‌و جوگرافیـە لە کوردی فەیلی لە عێراق، لە بلاوکراوەکانی بنکەی رۆشــنبیری فەیلی/ کتێبـی ژمارە (١)، بێ‌ش، ١٩٩٩.

٢٤. عەبــدوڕەحمان قــاسملو، عەبــدوڵلای حەســەن زادە: کورتــە مێــژووی حیزبــی دیموکراتی کوردستانی ئێران، چ، (بێ. ش)، ٢٠٠٢.

٢٥. عەبدولقادر سالح: شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لــە عێــراق چ١، ســلیمانی، ٢٠٠٥.

٢٦. عەبدوڵلا غەفور: پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان لە باشوری کوردســتاندا بــە پێی سەرژمێری دانیشــتوان لە عێراق ١٠٧٧، سلیمانی ٢٠٠٠٥.

٢٧. عەلی کەندی: فەرهــەنگی رووداوەکـانی کوردســتان‌و ولاتــانی جیهــان، چ١، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٨. عومەر نورەدینی: ســیستەمی نوێی جیهانی‌و دۆزی کورد، کوردستانی عێــراق وەك نموونە، هەولێر، ٢٠٠٣.

٢٩. عیسی پەژمان: نهێنیەکانی بەستنی رێککەوتننامەی ئەلجــەزائر، ١٩٧٥، و/ نادری ئیبراهیمی، چ١، بنکەی چاپەمەنی رۆژ، سوید، ١٩٩٧.

٣٠. فاتیح رسول:لە ناوکاروانێکی دوورو درێـژدا، (کورتــەی خــەبات‌و ئــەزموونی پەنجا ساڵ)، ستۆکهۆلم، سوید،١٩٩٧.

٣١. فاتیح رسول:بنچینەی مێژووی بیوزکەی چەپ، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٣٢. فاتیح عەبدوڵلا: پارێزگای کەرکوك ساڵی ١٩٥٧-١٩٧٧ (لیکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-سیاسی بەراوردکاریە لە رووی شێواندنی سنووری جوگرافی‌و کاریگەری باری نەتەوەیی)، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٣٣. فەرەیدوون نووری: بزاڤی بارزانی، دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧
٣٤. فەیسەڵ دەباغ: کورد‌و کەمە نەتەوایەتیەکان لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧،، هەولێر، ١٩٩٩.
٣٥. کامیل ژیر: کوردایەتی‌و سەربەخۆیی، چ١، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٣٦. کامەران ئەحمەد محمدئەمین: کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی‌و ناوچەی دا، دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٠.
٣٧. کاوە ئەمین: ناسیونالزمی کوردی، خەبات بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی، چ١، دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٨. کرمانج گوندی، سی٣ ساڵ خەبات‌و ولاتێکی وێران، سوید، ١٩٩٠.
٣٩. کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەم دا، و/ حەمە کەریم عارف، چ٢، هەولێر،٢٠٠٤.
٤٠. کریس کۆچێرا: بزوتنەوەی سەربەخۆیی کورد، و/ ئەکرەمی میهرداد، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٤١. گۆینتەر دیشنەر: کورد گەلێکی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، ترجمە من الالمانیە الی العربیە: عبدالسلام بروای، و/ حەمە کەریم عارف، لە بلاوکراوەکانی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٤.

٤٢. مارتین ڤان برۆنسن: ئاغاو شێخو دەوڵەت، و/ کوردو، سلێمانی،١٩٩٩.

٤٣. محمد حسێن عەزیز: پێنج کاتژمێر لەگەڵ بڕایم ئەحمەددا، چ١، (بی ش)، ١٩٩٥.

٤٤. مراد حەکیم محمد: ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعس دا، چ١، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی،٢٠٠٤.

٤٥. مەلا بەختیار: کۆبەندی چەند بابەتێك، ١٩٨٣-١٩٩٣، بێ ش، ١٩٩٩.

٤٦. منهوچر پارسادۆست: ئاکۆکی ئێران – عیراق، و: محسین علی ئەکبەر، چ١، سلێمانی،١٩٩٦.

٤٧. مومتاز حەیدەری، نەژاد عەزیز سورمێ: کونگرەی ٩٠ ساڵەی بارزانی نەمر، چ١ چاپخانەی خەبات، کوردستان، ١٩٩٧.

٤٨. میدڵ ئیست، ووچ: جینۆساید لە عێراقو پەلاماری ئەنفال بۆسەر کورد، و: سامەندی موفتی زادە، چ١ چاپخانەی خاك، سلێمانی، ١٩٩٩.

٤٩. میرزا محمدامین مەنگوری: بەسەرهاتی سیاسی کورد (١٩١٤ تا ١٩٥٨، سلێمانی، ٢٠٠١.

٥٠. نادر ئینتیسار: ئێتنۆنەتەوایەتی کوردی، و/عەتا قەرەداغی، چ١ سلێمانی، ٢٠٠٤.

٥١. نەجاتی عەبدوڵڵا: کوردستانو کێشەی سنووری عوسمانی فارسی (١٦٣٩-١٨٤٧)، چ١، هەولێر، ٢٠٠١.

٥٢. نەوشیروان مستەفا ئەمین: لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٧.

٥٣. نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، چ٢، سلیمانی، ١٩٩٨.

٥٤. نەوشیروان مستەفا ئەمین: سەردەمی قەڵەم و مووراجەعات، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩.

٥٥. هەژار: چێشتی مجێور، چ١، بێ. س، بیروت.

٥٦. واحید عومەر مجێدین: دانووسانەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و حکومەتەکانی عێراق (١٩٢١-١٩٦٨)، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٥٧. یاسین سەردەشتی: کوردستانی ئێران (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە جوڵانەوەی نەتەوەیی گەلی کورد ١٩٣٩-١٩٧٩) چ١.، سلیمانی،٢٠٠١.

## دووەم: سەرچاوە عەرەبی‌و بە عەرەبی کراوەکان

٥٨. ابراهيم ابن سليمان الاحديب: إقليم الصحراء الكبرى، البحث في الموسوعة الجغرافية في العالم الاسلامي، المجلد ١١، ط٢، الجامعة امام محمد بن سعود الاسلامية

٥٩. امال السبكي: تأريخ ايران السياسي بين الثورتين (١٩٠٦ -١٩٧٩)،، سلسلة عالم المعرفة (٢٥)، كويت ١٩٩٩.

٦٠. الياس فرح: معركة العرب القومية على الحدود الشرقية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٨١.

٦١. امين هويدي: كيسنجر وادارة الصراع الدولي، ط١، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩.

٦٢. أيوب بارزاني: الحركة التحررية الكردية و صراع القوى الاقليمية و الدولية، ١٩٥٨-١٩٧٥، دار نشر حقائق المشرق، جنيف، ٢٠١١

٦٣. بدر غيلان: تأريخ الاطماع الفارسية في شط العرب، وزارة الثقافة والاعلام، دائرة الاعلام الداخلي العامة، سلسلة الاعلامية (١٠٦)، بغداد، ١٩٨٠.

٦٤. برزان التكريتي: الصراع الدولي في منطقة الخليج العربي والمحيط الهندي وتأثيره على القطار الخليج العربي، ط١، بغداد ١٩٨٢.

٦٥. بهاءالدين نوري: مذكرات، ط٢، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، الدار العربية للعلوم، بيروت، ٢٠٠٦.

٦٦. تشارلز تريب:صفحات من التاريخ العراق الحديث، ت/زينة جابر ادريس، ط١ مطبعة دار العربية للعلوم، بيروت٢٠٠٦.

٦٧. تورد فاكستم: ليس لنا الاصدقاء غير الجبال، ت/ عبدالسلام نعمان مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٨.

٦٨. جابر ابراهيم الراوي: مشكلات الحدود العراقية الايرانية والنزاع المسلح، ط١، وزارة الثقافة والاعلام،، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد، ١٩٨١.

٦٩. جابر ابراهيم الراوي: الجزر العربية الثلاث وموقف القانون الدولي من احتلالها بالقوة، ط١، وزارة الثقافة والاعلام، بغداد ١٩٨١.

٧٠. جرجيس فتح الله: زيارة للماضي القريب ط٢، د مط، ستوكهولم،١٩٩٨.

٧١. جرجيس حسن: تركيا في ستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه، ط١، د م ١٩٩٩.

٧٢. جزا توفيق طالب: المقومات الجيوبولتيكية للأمن القومي في أقليم كردستان ط١، مركز كردستان لدراسات الستراتيجية، ط١، سليمانية، ٢٠٠٤.

٧٣. جلال طالباني: حول القضية الكردية في العراق، ط١، منشورات دار ارارات للثقافة والنشر ب ت، ب م.

٧٤. جمال بابان: اعلام كرد العراق، سلمانية ٢٠٠٦.

٧٥. جمال الغيطاني: حراس البوابة الشرقية، ط١، دار الطليعة، بيروت، د س.

٧٦. حاميد محمود عيسى: قضية الكردية في العراق من الاحتلال البريطاني الى الغزوالامريكي ١٩/١٤/٢٠٠٤، ط١، د مط، قاهرة، ٢٠٠٥.

٧٧. حبيب محمد كريم: تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني –العراقي (في محطات رئيسية)، ١٩٤٦-١٩٩٣، ط١، مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٨.

٧٨. حبيب محمد كريم: صفحات من نضال الشعب الكردي، تاريخ مؤتمراتمرات الحزب، الحزب الديمقرات الكردستاني ـ العراق، قسم الاعلام، ط١، د م.

٧٩. خالد يحى العزي: مشكلة شط العرب في ظـل المعاهـدات والقـانون، ط١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١.

٨٠. خليل ابراهيم احمد وجعفر عباس حميدي: تأريخ العراق المعاصر، ط١، مديريـة دار الكتب للطباعة والنشر. جامعة الموصل، موصل،١٩٨٩.

٨١. درية عوني: الاكراد، ط١، قاهرة،١٩٩٩.

٨٢. دونالد ولبر: ايران ماضيها و حاضرها، ت/عبدالمنعم محمـد حسـنين، ط٢، دار الكتاب المصري، د.م، ١٩٨٥

٨٣. زهير مارديني: الثورة الايرانية بين الواقع و الاسطورة، دار إقرأ، بيروت، ١٩٨٦

٨٤. سامي عبدالرحمن: البديل الثوري في الحركة التحريرية الكردية، ب.م،١٩٨١.

٨٥. سعد ناجي جواد: العـراق والمسألة الكرديـة، ١٩٥٨-١٩٧٠، ط١، د.مـط. لندن،١٩٩٩.

٨٦. سـلوموتكدين: الموسـاد في العـراق ودول الجـوار، ت/ بـدر العقيلـي، ط٢، عمان،١٩٩٨.

٨٧. شاكر صابر الضـابط: العلاقات الدولية ومعاهدات الحدود بين العـراق وايـران، د.س، بغداد.

٨٨. شاكرو خدو محوي: للمسألة الكرديـة في العـراق للعاصـر، ت/د.عبـدي حـاجي، دار سبيريز للطباعة و النشر، دهوك، ٢٠٠٨

٨٩. شورش حاجي: الانفال الكـرد والدولـة العـراق، ت/ مجموعـة مـن المترجمين، ط٢ سليمانية،٢٠٠٥.

٩٠. صباح سليمان: اضـواء علـى الحـرب العراقيـة الايرانيـة، ط١، وزارة الثقافـة والاعلام، السلسلة الاعلامية١٢٢ ط١، بغداد، ١٩٨١.

٩١. صلاح الخرصان: صفحات من تأريخ العراق السياسي الحديث، ط١، مؤسسة العرف للمطبوعات، بيروت، لبنان، ٢٠٠١.

٩٢. صلاح الخرصان: التيارات السياسية في كردستان العراق (١٩٤٦-٢٠٠١) ط١، مؤسسة البلاغ للطباعة والنشر، بيروت ٢٠٠١.

٩٣. صلاح الخرصان: صفحات من تأريخ العراق السياسي الحديث، (الحركات الماركسية ١٩٢٠-١٩٩٠)، ط١، مؤسسة العارف للمطبوعات، بيروت-لبنان،٢٠٠١.

٩٤. صلاح الخرصان: حزب الدعوة الاسلامية، حقائق ووثائق، ط١ المؤسسة العربية للدراسات والبحوث الاستراتيجية، دمشق، ١٩٩٩.

٩٥. صلاح سعد الله: المسألة الكردية في العراق، ط١، مكتبة مدبولي، قاهرة، ٢٠٠٦.

٩٦. عادل تقي عبد محمد البلداوي: نضال الشعب الكردي وموقع البارزاني في الوثائق السرية، ط١، بغداد، ٢٠٠٣.

٩٧. عبدالستار طاهر شريف: تأريخ الحزب الثوري الكوردستاني، ط١، من منشورات الحزب الثوري الكردستاني، بغداد ،١٩٧٨.

٩٨. عبدالستار طاهر شريف: الجمعيات والنظمات والاحزاب الكردية،ط١ بغداد١٩٨٩.

٩٩. عبدالله رسول لبشدري: أندلاع ثورة أيلول المجيدة ١٩٦١، ت/ محمد صالح العقراوي، ج١، ط١، مطبعة الثقافة، اربيل،٢٠٠١.

١٠٠. عبدالوهاب الكيالي والاخرون: موسوعة السياسية، ط٢، المؤسسة للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٩٥،.

١٠١. عثمان علي: دراسة في حركة الكردية المعاصرة، ط١، اربيل، ٢٠٠٣.

١٠٢. علي سنجاري: القضية الكردية وحزب البعث العرب الاشتراكي في العراق، ط١، دهوك، ٢٠٠٦.

١٠٣. علي سنجاري: الحركة التحررية الكردية موقف وارا،، ط١، مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٧.

١٠٤. فاضل البراك: استراتيجية الامن القومي "أراء وافكار" ط١، دار العربية بغداد، ١٩٨٧.

١٠٥. فاضل البراك: مصطفى البارزاني بين الاسطورة والحقيقة، ط١، بغداد ١٩٨٩.

١٠٦. فاضل رسول: العراق- ايران أسباب النزاع و ابعاد النزاع، معهد النمساوي للسياسات الدولية، دم، ١٩٩١

١٠٧. كاظم حبيب: لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، ط٢، دار ئاراس لطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٥.

١٠٨. كاظم حبيب: الاستبدادوالقسوة في العراق، ط١، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، سليمانية، ٢٠٠٥.

١٠٩. لازاريف: تاريخ كوردستان، دەزگاها سپيريز بۆ چاپو وشاندنێ، ط١، دهوك، ٢٠٠٦

١١٠. ماريون وبتر سلوجت: العراق الحديث من الثورة الى الدكتاتورية، ط١، مركز الدراسات والترجمة، قاهرة، ١٩٩٢.

١١١. ماريون فاروق سلوغلت، بيتر سلوغلت: من الثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨ ط٣، لك النبراسي، منشورات الجمل، ب م، ٢٠٠٣.

١١٢. مازن السامرائي: وثائق عن الصراع العراقي الفارسي، ط١، مطبعة بغداد، بغداد ،١٩٨٧.

١١٣. مثنى امين: قضايا القوميات واثرها على العلاقات الدولية، ط١ مركز كردستان للدراسات الستراتيجية، سليمانية، ٢٠٠٣.

١١٤. محسن دزةيي: أحداث عاصرتها، الجزء الثاني (١٩٦١-١٩٧٥)، ط١، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٢.

١١٥. محمد علي القوزي، موضوع الخاص في تأريخ العرب الحديث، ط١، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٩.

١١٦. محمد صالح العقراوي، الكرد والدولة المستقلة وفق المعهدات والمواثيق الدولية، ط١، اربيل، ٢٠٠٥.

١١٧. مسعود البارزاني: البارزاني والحركة التحررية الكردية، الكرد وثورة ١٤ تموز،(١٤تموز ١٩٥٨- ١١ايلول ١٩٦١، كوردستان، ١٩٩٠.

١١٨. مشيل عفلق، نقطة البداية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ١٩٧٣.

١١٩. مصطفى عبدالقادر النجار والاخرون: الحدود الشرقية للوطن العربي (دراسة تأريخية) ط١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١.

١٢٠. مهدي حسين البصري: الموقف القومي التأريخي ازاء التحدي الفارسي، السلسلة رقم (١٣٤) العراق، وزارة الثقافة والاعلام، دائرة الأعلام الداخلي العامة، ١٩٨٠.

١٢١. ميفان عارف بادي: الحركة القومية الكردية في كردستان العراق ١٩٥٨-١٩٦٣، دەزگای سپیریز بۆ چاپ و بلاوكردنەوە، دهوك ٢٠٠٥.

١٢٢. نجم الدين يوسفي: ثورة ايلول المجيدة، ط ٢، دهوك، ٢٠٠٣.

١٢٣. نوري الطالباني: منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، ط١، لندن ١٩٩٥.

١٢٤. رفيق السامرائي: حطام البوابة الشرقية، كويت،١٩٩٧.

١٢٥. وليد عبدالناصر: ايران دراسة عن الثورة و الدولة، ط١، دار الشروق، القاهرة، ١٩٩٧

سێیەم: سەرچاوە فارسییەکان

١٢٦. سرهنگ غلامر چانجانی، تأريخ بيست و پنج ساله ايران، از كودتا تا انقلاب، ج١، ط٦، مؤسسه خدمات فرهنگی، طهران ١٣٧١.

١٢٧. صالح ملا عيسى: بحران افرينی بر قدرتها در كردستان العراق، ج١، شركت گلبان چاپ، تهران، ١٣٨٠.

١٢٨. كامران. رهيوم: سازمان ملل ايران وعيراق، ت/ هوشنگ راسخی عزمی پابت، ج١، مؤسسه چاپ وانتشارات وزارت أمور خارجه تهران،١٩٩٧.

١٢٩. كريس كوچرا:جنبش ملی كرد، ت/ ابراهيم يونسی، موسسه انتشارات نگاه تهران،١٣٧٧.

چوارەم: سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکان (ئەنتەرنێت)

١٣٠. ئەمجەد شاکەلی: خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی چەپی کوردی لە کوردستانی عێراق: org، www.kurdistannet

١٣١. عدنان فارس: اتفاقية الجزائر ١٩٧٥ خيانة وطنية: www.rezgar.com

١٣٢. إسماعيل محمد: تاريخ العراق، تتابع حضاري أوقفه الحصار ، موقع: الجزيرة.

١٣٣. سعد داود قرياقوس: مسؤولية القيادة الايرانية في شن الحرب على العراق واطالتها http://www.albasrah.net

١٣٤. عبـــــــــــــــــــدالعزيز بوتفلقـــــــــــــــــــــــــــــــة، dz/arebe/presence/portrait/bouteflika.www.elmouradia-

١٣٥. محمد رضا الشاه البهلوي، www.aljazeera.net

١٣٦. مذكرات هنري كيسنجر. www.aljazeera.net

١٣٧. هواري بومدين http/ar.wikipedia.org

١٣٨. الملامصطفى البارزاني http://ar.wikipedia.org

١٣٩. الحسين بن طلال http://ar.wikipedia.org

١٤٠. أحمد حسن البكر http://ar.wikipedia.org

## پێنجەم: نامە بڵاونەكراوەكان

١٤١. فەرەیدون عەبدورەحیم عەبدوڵڵا: باروودۆخی سیاسی كوردستان –عێراق، ١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤، توێژینەوەیەكی مێژوویی سیاسییە، نامەی زانكۆیی (ماستەر)، زانكۆی سەلاحەدین، بەشی مێژوو،٢٠٠٥.

١٤٢. هۆشمەند عەلی مەحمود: عەبدولرەحمان قاسملوو ژیانو رۆڵی سیاسی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورددا ١٩٣٠-١٩٨٩، نامەی بڵاونەكراوەی زانكۆ، بەشی مێژوو، كۆلێژی پەروەردە، زانكۆی كۆیە، ٢٠٠٦.

## شەشەم: گۆڤارەکان

### بەزمانی کوردی

١٤٣. ئازاد نەقشبەندی: کاریگەری نەوتی کەرکوك لە سەر راگویزانی کورد لە کەرکوك و بەعەرەبکردنی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠) هاوینی ٢٠٠٠١.

١٤٤. ئەسغەر حەعفەر ولدانی: رۆڵی فاکتەرە جوگرافی و جیوپۆلیتیکی یەکانی کوردستان لە پەیوەندی میسر بە کەنداوی فارسەوە، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە (١٩ ساڵی (١٣)، شوباتی ٢٠٠٥.

١٤٥. حەمید گەوهەری: رۆڵی بارزانی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی سەدەی بیستەمی کوردستان، گۆڤاری گوڵان، دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی گوڵان، ژ (٢١٧) ی ١٥ی ئازاری ١٩٩٩.

١٤٦. خەلیل ئیسماعیل موحەمەد: ئاراستەکانی نیشتەجێکردنی عەرەب لە پارێزگای نەینەوا و کاریگەری لە سەر پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتواندا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢١)، پاییزی ٢٠٠١.

١٤٧. خلیل ئیسماعیل محمد: سنووری عێراق و ئێران لە نێوان خواستەکانی گەلی کورد و ململانێ دەولیدا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژ ٤٥، ساڵی ١٣، سباتی ٢٠٠٥.

١٤٨. خەلیل ئیسماعیل موحەمەد: دیاریکردنی سنووری عێراق– ئێران، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٧، ئابی ١٩٩٨.

١٤٩. رفیق شوانی: کێشەی کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠)ی هاوینی ٢٠٠٠.

١٥٠. عەبدوستار تاهیر شریف: (چاوپێکەوتن)، گۆڤاری ستاندەر، ژ(٨) لە ٩/ ایلول ٢٠٠٦.

١٥١. عەبدوڕەزاق عەلی: پیلانی جەزائیر کەلە کۆمەکی دونیای دووجەمسەری بە دژی کوردو شۆڕەکەی، گۆڤاری گوڵان، دەزگای ڕۆشنبیریو راگەیاندنی گوڵان، ژ (٢٦٨) ی ٢ی ئازاری ٢٠٠٠.

١٥٢. فهیم عبدالله حمو: ریکەفتن ١١ی ئادرا ١٩٧٠، گۆڤاری (مەتین)، ژ٥٥، تەباخی ١٩٦٦.

١٥٣. فەوزیە صابر محمد: کێشەی نەتەوایەتی لە ئێران (١٩٤١-١٩٤٦)، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (١٥)ی بەهاری ٢٠٠٠.

١٥٤. فوئاد عارف: (چاوپێکەوتن)، گۆڤاری لڤین، ساڵی چوارەم، ژ٤٤، ئەیلولی ٢٠٠٦.

١٥٥. فوئاد کەریم: لە یادی ٢٤ ساڵەی پەیمانی شومی جەزائیر. گۆڤاری هەڵەبجە، ژ١، ئازاری ١٩٩٩.

١٥٦. کازم حەبیب: مەینەتی کوردە فەیلیەکانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ٢٣، پاییزی ٢٠٠٢..

١٥٧. کامران بابان زادە: پەیمانی سەعد ئابادی ١٩٣٧، گۆڤاری پەرلەمانتار، ژ(١١)ی ئابی ٢٠١١

١٥٨. محمد شیخ ئەحمەد: کوردستان لە ڕێککەوتننامە دەوڵەتیەکاندا، گۆڤاری (هەڵوێستی نیشتیمانی)، ژ ٢، نیسانی ١٩٩٧.

١٥٩. محەمەد هەمەوەندی چەمکی تەبەعیەی ئێرانی لە سیستەمی یاسایی ڕەگەزنامە لە عێراقدا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٣) ی بەهاری ٢٠٠٢.

١٦٠. محمود رەزا: کەنداوی عەرەب یان کەنداوی فارس؟، مجلە (سیاسەتی دەولی) ژمارە (٤) کانوونی دووەمی ١٩٩٣.

١٦١. مراد حەکیم موحەمەد: سیاسەتی راگواستنی کورد لە کوردستانی عێراق، سیاسەتی دەولی، سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی کوردستان، ژ٤٥، سالی ١٣، شوباتی ٢٠٠٥.

١٦٢. نەجات حەمید ئەحمەد: گەرانەوە بۆ جەزایەر یاخود دەستخۆشی لێکردنی جەزایەر، گۆڤاری گولان، دەزگای رۆشنبیری و راگەیاندنی گولان، ژ (٢٧٠) ی ١٥ی ئازاری ٢٠٠٠

١٦٣. نیزامەدین گلی، لێکۆلینەوەیەکی گشتی سەبارەت بە کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢١)ی هاوینی،٢٠٠٠

١٦٤. هەردوو رێکخراوی "کاژیك"و "پاسوك" لە بیرەوەری مامۆستا کامیل ژیردا "چاوپێکەوتن" گۆڤاری بابان، ژمارە (٣)، تەمووزی ٢٠٠٧

## به زمانی عەرەبی

١٦٥. زهير الزاهر: اتفاقية الجزائر ١٩٧٥ الموقف منها والبديل عنها، الثقافة الجديدة، ع ٢٣٥، السنة(٣٨)، تموز، ١٩٩١

١٦٦. عثمان علي: اسماعيل اغا سمكو(ثعلب السياسة الكردية ورائدها في الباغماتية)، مجلة (ئالاي ئيسلام)العدد الاول، السنة السابعة، كانون الثاني /شباط-١٩٩٣

١٦٧. مصطفى طيبة: الجبهة الوطنية في العراق، مجلة: كاتب، ع ١٤٣، السنة الثالثة، فراير ١٩٧٣

الثقافة الجديدة. عدد (٨٥، ايلول ١٩٧٦، (٨٦) تشرين أول ١٩٧٦

حەوتەم: رۆژنامەکان

به زمانی کوردی

١٦٨. (برایەتی) ئۆرگانی (پ‌د‌ك) ژمارەکانی (٤، ٥ سالی دوو١/ ١٠/ ١٩٧١، ١٤/ ١٠/ ١٩٧٠ز ٢٣ تا ٢٩ خولی چوارەم ١٩٧٢، (٢،٣ خولی چوارەم ٢/ ٦، ٩/ ٦/ ١٩٧٢، (٢٧٩١)ی ٧/ ٣/ ١٩٩٨

١٦٩. (خەبات) ئۆرگانی (پ‌د‌ك)، ژمارە (١) ١٩٧٦.

١٧٠. (رزگاری) ئۆرگانی (یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان) ژمارەکانی ١٨ ئازاری ١٩٨٧، ١٩ نیسانی ١٩٨٧

١٧١. (کوردستانی نوێ) ژمارەکانی (١٥٢٥،١٥٢٤،١٥٢٤، سالی ١٩٩٧.

١٧٢. (هاوکاری) ژمارەکانی٢٥٩ی٢١/ ٣/ ١٩٧٥، ٢٦١، ٢٧٤، ٣٠٣، ٥٧٣،٣١٣ی ٥/ ٢/ ١٩٨١، (٥٠٩)ی ١٤/ ١٢/ ١٩٨٠. ٤٣٨

به زمانی عەرەبی

١٧٣. (الاتحاد)، عدد (٤٦٣) في ٨/ ٣/ ٢٠٠٢

١٧٤. (التآخي) عدد(١٥٨٣) في ١٢ آذار ١٩٧٤، عدد (١٥٨٩) في ٤اي نيساني ١٩٧٤،(١٦٠٣) في ٢٠/ نيسان ١٩٧٤،

١٧٥. (الثورة) عدد (٢٠١٤)، في ٧/ ٣/ ١٩٥٧، (٢٠٢٦) في ٢٠/ ٣/ ١٩٧٥

